ناوی کتێب: ئەسپیدیلۆن
بابەت: کۆمەڵە چیرۆک
نووسەر: کاروان عومەر کاکەسوور
مۆنتاژ: عەبدوڵا قادر دانساز
چاپی یەکەم: ١٩٩٨، گۆڤاری ڕابوون، سوید
چاپی دووەم:

چاپی یەکەمی ئەم کۆمەڵە چیرۆکە بە یارمەتیی گۆڤاری «ڕابوون» و بە هەوڵی «کاک ڕەفیق سابیر»ی شاعیر کەوتە بەر دەستی خوێنەر.

**پێرست**

# ماسی

ئای ئای خۆ کردی بەڕاست..!!

ئەوەتا لە شەقامە پانوپۆڕەکەی بەردەمی کەمپەکەیان پەڕیەوە، هەر چەند هەنگاوێکی ترە و دەگاتە بەردەرگای پۆستەخانەکە.

ئافرەتێکی چەند دڵپاکە، ئەوەندەش سەیرە..!! ئاخر تۆ بڵێی کەس شتی وای کردبێت..!! ئاخر ئەو نامەیە چی بوو نووسیت، کە سوور ئەزانی ناگاتە دەستی..!! ئەوە چی بوو لەپڕ بە خەیاڵیدا هات..!!

سەرەتا مەبەستی ئەوە نەبوو نامە بنووسێت و بینێرێت، بەڵکو هەر بۆ هەڵڕشتنی داخی دڵی، قەڵەم و کاغەزەکەی بەردەمی خستەکار.. هەرچی ئاخ و داخی ئەو سێ ساڵەش هەبوو پێی ڕشت.. ئینجا دوو سێ جار پیایداچووەوە و هەر جارەش شتێکی بۆ زیاد ئەکرد.. دواجار بۆ لای پەنجەرەکە چوو.. سەیرێکی دەرەوەی کرد.. ئەو ناوە کشومات بوو.. کاغەزەکەی خستە سەر تاقی پەنجەرەکە و کەوتە خوێندنەوەی.. دڵی پڕبوو، دەستی بە گریان کرد.. خۆی بە پاڵەوانەکەی «چیخۆف» دەهاتە بەرچاو.. دە ساڵ بەر لە ئێستا، کە لە پۆلی چوارەمی ئامادەیی بوو «شیرین»ی هاوڕێی بۆی خوێندەوە، کەچی تا ئێستاش وشە بەوشەی بیرماوە.. وا دەزانێ دوێنێ بوو، کە بەجووتە لە هەیوانەکەی خۆیاندا دانیشتبوون و گوێی بۆ شلکردبوو، بەتاسەوەش چاوەڕێی کۆتاییەکەی دەکرد.. زۆر هەوڵی دا دان بەخۆیدا بگرێت و لە بەرچاوی «شیرین» نەگری، بەڵام نەیتوانی.

ئەوەی بیری لێنەکردبووەوە ئەوەبوو ڕۆژێک لەڕۆژان خۆیشی ئاوای بەسەربێت.. ئەگەر ئەو کاتە بیزانیایە زیاتر دەگریا.. لەو ڕۆژەوە «شیرین» ئەو چیرۆکەی بۆ خوێندۆتەوە، شێوەی پاڵەوانەکەی لە بەرچاو لاناچێت.. تەنانەت شەوێکیان خەویشی پێوە بینی.. لە خەونیدا، کوڕێکی دە دوانزدە ساڵان،

قژزەردێکی چاوشین، نە قەڵەو نە زۆر لاواز، نیشانەی ماندووبوون و بێزاری بە دەمــوچاویەوە دیار، لای پینەچییـــەکی دڵڕەق ئیــشی دەکــرد.. پینەچیــە دڵڕەقـەکەشـی بینی... ئا ئا خـۆی بوو. کەتەیەکی ئێسکقورس، سمێڵێکی زل، دەموچاوێکی سامناک، جار جار بەسـەر کوڕەکەدا دەیقیژاند... دواییش شەو درەنگانێک، بینی بەدەم ڕاژەنینی بێشکەی منداڵی پینەچیەکەوە، نامەی بۆ باپیـری دەنووسی و داوای لێ دەکرد دەربازی بکات.. کاتێ تەواوی کرد، لە سەر پشتی زەرفەکەی نووسی: «بۆ باپیرم». داخی ناچێت ئەو کاتە خەبەری بووەوە، کـــە دەیویست بەدەســتی خــۆی ناونیــشــانی باپیــری بۆ لەســەر بنووسێت.(*)

گەیشتە بەر دەرگای پۆستەخانەکە و ئێستێکی کرد.. دەستی بە گیرفانی پاڵتۆکەیدا کرد و نامەکەی دەرهێنا.. جارێکی تریش ناونیشانەکەی خوێندەوە: «کوردستـان، هەولێر، قـەڵا، خانووی ژمـارە حەوت.. بگات بەدەسـتی دایکی خۆشەویستم: نەجیبە حەسەن».. بەدەم سەیرکردنی فەرمانبەری پۆستەکەوە، ئاخێکی هەڵکێشا... چەند پەناهەندەیەکی تری کەمپەکەی خـۆشیـانی دی بەجیا دەچوونە ژوورەوە.. ئەوەتا عەرەب، تورک، فارس، هەر یەکەیە و نامەی خۆی پێیەو بێ ترس و سڵەمینەوە دەچنە ژوورێ.. چەند هەنگاوێک بۆ دواوە گەڕایەوە.. کورسیە درێژەکەی دی و چوو لە سەری دانیشت.

چاوێکی تری بە نامەکەدا گێڕایەوە.. لەوەدەچوو بیر لەوە بکاتەوە، ئاخۆ کابرا چی پێ دەڵێت، ئەگەر بیداتە دەستی..؟! خۆ لەوانەیە لە بەرچاوی ئەو هەموو خەڵکە تەریقی بکاتەوە.. خۆیشی ئەوەی لەبەرچاوە.. کەواتە بۆچی وا دەکـات..؟! ئاسنی سـاردە و دەیکوتێت.. وەکـو ڕۆژان لە ژوورەکـەی خـۆی دانیــشــتـایە، چاکـتـر نەبوو..!! ئەوە چەند ڕۆژە خـۆی خـزاندۆتە کـونجی ژوورەکەیەوە، بۆ سێ ژەمەکە نەبێت لێی دەرناچێت.. وەنەبێت ژوورەوەشی پێ لە دەرەوە چاکـتـر بێت، بەڵام چی بکات و بۆ کـوێ بچـێت..!! جـار جـار کورسیەکە بۆ لای پەنجەرەکە ڕادەکێشێت و لە سەری دادەنیشێت. نیگای چاوەکانی بۆ هەر لایەک ڕەوانە دەکات، شتێک نابینێت کەمێ دڵی پێ خۆش بکات، ناچار پەردەکە بە سەر ڕووی پەنجەرەکە دادەداتەوە... هەر ئەم ژوورە و

ژوورەکـەی ئەوێی..!! کـە لەپاڵ پـەنجـەرەکـەدا دەوەسـتـا، هەردوو ئـانیـشکی دەخستـە سـەر تاقی پەنجەرەکە و چەناگەشی دەخستـە سـەر هـەردوو لەپی، سەیری دەرەوەی دەکرد.. هەموو شاری لێ دیاربوو.. هەستی دەکرد ئەو شارە لەو خشتە نایلۆنانـە درووستکراوە، کە منداڵان یارییان پێ دەکەن.. هەر ئەوە نەبوو دەست درێژ بکات و گشـتیـان بەسـەریەکدا برمـێنێت.. بیـانرمـێنێت و جـارێکی تر سـەرلەنوێ درووسـتـیـان بکاتـەوە.. خـەڵکەکـەشی وەک ئەو بووکەشووشانە دەهاتە بەرچاو، کە بۆ جوانی لە ناو کۆگاکانی شار دانراون، بۆیە وایدەزانی هەموویان بەفەرمانی ئەو دەجووڵێنەوە.. خەڵکی شار ناهەقیان نەبوو بڵێن: «قەڵانشینەکان خۆشەویستی خوان، چونکە لێیەوە نزیکن».. کە سەری کەمێک شۆڕدەکردەوە و سەیری بازاڕەکەی بەردەم قەڵا، سەیری جادە و ڕێبـوارەکـانی ئەو نـاوەی دەکـرد، لـە بینینیـان تێـر نەدەبوو.. لە هەمـوو شتێکیش زیاتر دڵی بەو کتێبە کۆنانە دەکرایەوە، کە ئێواران لە سێبەری قـەڵادا دادەنران.. هەندێک جار خـۆی دەگـۆڕی و دەچوو بۆ سـەیرکـردنیـان.. کتێبێک، دووانـی دەکڕی و دەگەڕایەوە. چی لـەوە خۆشتـر بوو کە دەیخستنە سـەر تاقی پـەنجـەرەکەوە و دەیخوێندنەوە..!! کاتێ هاوڕێکانی ئاوایان دەدی، ئێرەییان پێ دەبرد.. جارێکیان «سازگار» هەر بە ئاشکرا پێی وت:

ــ دەزانی ئەرخـەوان بەخیلیت پـێ دەبەم.. بەڕاسـتی شـوێنێکی خـۆشتـان هەیە..!! بڕوا ناکەم قەت هەست بە بێزاری بکەیت.

جا با هـەستی بە بێـزارییش بکردایە، لە چەند دەقەیەکدا خـۆی دەگۆڕی، یان بە شەقامەکە، یان بە قادرمەکاندا دەهاتە خوارێ.. بۆ کوێ..؟! یەکسەر بۆ سەر شەقامەکەی بەردەمیان.. تا دەگەیشتە ئەوسەری شەقامەکە، لەگەڵ چەند کەس چاکوچۆنیی دەکرد و لەگەڵ چەند کەسیش دەوەستا... خۆ وەکو ئێستا نەبوو نە کەسێ بناسێت و نەکەس بیناسێت.. بۆ نامەیەک، بۆ هەواڵێک سوێی بووبێتـەوە.. دەسـتـە دەسـتـە هاوڕێکانی دەهاتن بۆ لای.. جـارێکیـان کـچـە قژدرێژەکە، کە ئێستا ناوەکەی لە یاد نەماوە، پێی وت:

ــ خـۆزگـەم بەخـۆت شـوێنێکت هەیە کـەس نییـەتی.. خـەڵک لـەمـسـەر و ئەوسـەری دنیـاوە دێن بۆ لات.. ئەوانـەی نەشـیـان دیوە، یان لـە ڕەسـمـا

بەرچاویان کەوتووە، یان شتێکیان لەسەر خوێندۆتەوە.

هەر ئێستاو هەر ئەوسا..!! چی بوو ئەو کۆچە ناوەختە..!! نە نامەیەک، نە هەواڵێک..!! ڕەنگە ئێستا دایکیشی دەیان دەرگا بکوتێت و چەندان بە سەرکاتەوە.. دوور نییە، هەر لە بەیانییەوە تا شەو درەنگانێ، لە پەنجەرەکەوە سەیری ئەو دەوروپشتە بکات، بەشکو ئەوە دنیایە و یەکێ ببینێت لەو بچێت، یان یەکێ لە هاوڕێکانی بەرچاو بکەوێت.. ئەگەر بۆ ساتێکیش ڕۆشنایی بە دڵە تارەکەی بدەن هەر باشە.. خۆ لەوانەشە هەر جارێ لە دەرگا بدرێت، دڵی داخورپێت و وابزانێت خۆیەتی گەڕاوەتەوە، یان کەسێکە و هەواڵێکی ئەوی پێیە.. شەوانەش کە دەخەوێت هەر خەو بەمەوە دەبینێت، هەر وەکو چۆن ئەمیش هەر خەو بەوەوە دەبینێت، وەکو خەوەکەی ئەو شەوەی. ئەرێ ئەوە چی بوو..!! ئەو هەمووو بارانە چی بوو باری..!! باری و هەر باری.. هەر باری خۆشی نەکردەوە.. خۆشی نەکردەوە و شار نقوومی ئاو بوو.. خەڵکی بۆ خۆدەربازکردن بە سەر قەڵا دەکەوتن.. لە هەموو لایەکەوە سەر دەکەوتن.. هەرکەس و هەڵپەی ئەوەی بوو زووتر بگاتە لای سەروو.. منداڵ و پیر و لاو، لە هەموو لایەکەوە، مێروولەئاسا ڕێچکەیان بەستبوو.. چاوی بۆ دایکی گێڕا، نەیدی.. بە چوار لایدا ڕوانی، نەیدی و نەیدی.. لە پایینی قەڵاوە بۆ سەرەوە هەڵدەزنا.. هەڵدەزنا و هاواری دەکرد.. هاواری دەکرد و کەس بەهانایەوە نەدەهات.. بارانیش تا دەهات زیاتر تەڕی دەکرد. کتومت لافاوەکەی ڕۆژگاری نووح بوو.. ئازا ئەوە بوو خۆی دەرباز بکات و بگاتە سەر قەڵا.. ئەمیش وەکو خەڵکەکە هەڵپەی گەیشتنی بوو.. حەشاماتەکە بەردەمیان گرتبوو، دەنا زۆر خێراتر سەر دەکەوت.. دواتر سەری هەڵبڕی و پەنجەرەکەی خۆیانی دی.. کۆمەڵێ سەری گەورە و بچووکی تیا دی.. هیچیان لە دایکی نەدەچوون.. دڵی داخورپا.. ئەژنۆی لەرزی.. وای هەست کرد دایکی نەماوە.. باران هەر دەباری و هەر دەباری.. ئاوەکەش تا دەهات بەرەو ژوور هەڵدەکشا و پەیتا پەیتا خەڵکی تری نقووم دەکرد.. گەیشتە قولاپەپێی ئەمیش.. لەوەدابوو ڕاپێچی ناو خنکاوەکانی بکات، لەگەڵ دەنگی باران خەبەری بووەوە.. هەستی بەوشکیی دەم و قورگی کرد.. هەستا و پەردەی لە سەر ڕووی پەنجەرەکە لادا..

سـەیرێکی دەرەوەی کـرد.. باران دار و بەردی ئـەو دەوروپشـتـەی دەشـتـەوە.. بیری لە دایکی کردەوە.. وای بۆچوو ئێستا ئەویش لە خـەوێکی ئاوادا خەبەری بۆتەوە.. ئێسـتا ئەویش سـەری لە پەنجـەرەکەی قەڵاوە دەرهێناوە.. خـۆی لێرە و دایکی لەوێ.. دیمەنێکی چەند سـەیرە، ئەوەندەش خەمناکە..!! ڕەنگە ئەو شـەوە تا بەیانی بەر پەنجـەرەکەی بەرنەدابێت، بەئومـێدی ئەوەی هـەواڵێکی کچەکەی پێ بـگات.. هـەواڵ..؟! جـا لە چ ڕێگایـەکـەوە..!! چاوەڕوانیـیـەکی بێـهـوودە و کۆسـتێکی گەورە، گەورەتر لەوەی، دڵی دایکیش پەی پێ بەرێت.. دوورنییە ئەو ڕۆژە هـەر کچێکی بالآبەرزی گەنمڕەنگی دیبێت، باوەشـی بۆ کردبێتەوە و ئەملا و ئەولای مـاچ کردبێت.. هـەر کـچێکی ڕووخـۆشـی قـژ تا سـەر شـانی بەرچاو کـەوتبـێت، بـەپەرۆشــەوە، بەرەو پیـریـەوە چووبێت.. هـەر ئـەوەش نا، دوورنیـیـە هـەموو هـاوڕێ و ناسیاوەکانی ئەوی بەسـەر کردبێتەوە، نەوەکا نامەی بۆ ئەوان ناردبێت و ئەم پێی نـەزانیبێت..!! چی بکات، ئێسـتـا نا ساتێکی تر بۆ ناردنی نامـەیەک دەبێت بەگـاڵتـەجارِی ئەو خـەڵکە.. هـەر وەکـو ڕۆژان، لەسـەر پشت، لەسـەر قەرەوێڵەکەی پاڵبکەوتایە، چاکتر نەبوو..؟!

مـاوەیەک بوو، دوای نانخواردنی بەیانیـان، یەکسـەر دەچوو بۆ لای «مـالینا» و لێی دەپرسـی:

ــ ئەمڕۆ نامەم بۆ نەهاتووە..؟

هـەموو جارێکیش هـەر یەک وەڵامـی دەسگیر دەبوو:

ــ نەخێر.

ڕۆژێکیان «مالینا» پێی وت:

ــ تا ئێسـتـا نەمـدیوە نامـەت بۆ بێت، کـەچـی هـەمـوو ڕۆژێکیش پرسـیـار دەکەیت..!!

ئەم یەکسـەر ڕەنگی تێکچوو، قـوڕگی گـیرا و هیچ قـسـەیەکی بـۆ نەکرا.. جـاران وا دڵی ناسک نەبوو، خـۆیشی نازانێت بۆچی وای لێـهـاتووە.. «مـالینا» هیـچ مـەبەسـتـێکی نەبوو، بەڵام ئەم وایزانی تەریقـی دەکـاتەوە.. لـەوە دەچوو بیەوێت دڵیشی چاک بکاتەوە، بۆیە پێی وت:

ــ وادیارە چاوەڕێی نامەی کەسێکی خۆشەویستت دەکەیت..؟!

چەندی کردی و کۆشای نەیتوانی وەڵامی بداتەوە.. پشتی تێکرد و چوو لە ژوورەوە لە سەر قەرەوێڵەکەی لێی کەوت.. دەستی بە گریان کرد.. لەو ڕۆژەوە ببڕای ببڕای سەری بە ژوورەکەی «مالینا»دا نەکردەوە، بەڵام هەر چاوەڕێیە، ڕۆژێک لە ڕۆژان، بێت لە دەرگا بدات و مژدەی گەیشتنی نامەی ئازیزێکی بداتێ.. با هی دایکیشی نەبێت، خۆ هیچ نەبێت بۆ چەند ساتێک دڵی پێی خۆش دەبێت.. بەڵام کوا کێ دەناسێت و کێ ناونیشانەکەی دەزانێت..!! دەڵێی گەڵایەکی پایزەی وەریوی قەد قەڵاکەیانە و ڕەشەبا پەرەوازەی کردووە.. بۆ کوێش..؟! بۆ شوێنێک، نە ناسیاوێک، نە دۆستێک، تەنانەت تاقە دایکەکەشی نەیدۆزێتەوە.. ئای لەو دنیایە چۆنە..!! هەر جارێ بە شێوەیەک خۆی پێ نیشان دەدات..!!

لە بیریەتی، جارێکیان لە وانەی بیرکارییدا خەیاڵی ڕۆیشتبوو، لەپڕ قەڵەمەکەی خستە سەر دەفتەرەکەی بەردەمی و لە سەری نووسی: «دنیا هەندێک جار ئەوەندە شیرینە، وا هەست دەکەیت نوقڵێکە و دەتەوێت قووتی بدەیت.. جاری واش هەیە ئەوەندە دزێوە، دەتەوێت بیکەی بە چەکوشێک و سەری خۆتی پێ بشکێنیت». نەیدەزانی ئەم وتەیە هی خۆیەتی، یان ڕۆژێک لە ڕۆژان لە کونجی لاپەڕەی کتێبێکدا بەرچاوی کەوتووە، بەڵام ئەوەندەی دەزانی، کە پڕ بە پێستی ناخی هەڵچووی خۆیەتی.

دەستێکی بە پشتی زەرفی نامەکەدا هێنا، یەک دوو جاریش هەڵگێڕوووەرگێڕی کرد. دواییش بە چاویەوە ناو پێڵووەکانی داخست.. ئەو ڕۆژەی بیرکەوتەوە، کە بۆ دوا جار لە سەر سنوورەکە باوەشی بە دایکیدا کرد و بەجووتە دەستیان کرد بە گریان. حەزی دەکرد ئەو دڵۆپەفرمێسکانەی دایکی لەگەڵ خۆیدا بهێنایە و دەنک دەنک، مووروووئاسا بیکردنایە بە ملوانکە.

دایکی تا لێی دوورکەوتەوە، بەدەم گریانەوە، پێی دەوت:

ـ ئەرخەوان گیان نەکەی بێ هەواڵی خۆتمان بکەیت..!!

ئای لەو ئێوارە بێدەنگ و بێچرپەیە..!! ئای لەو خۆرە شەکەت و ماندووەی لە دامێنی ئاسمانە بێگەردەکەدا شوێنی بۆ خەو خۆش دەکرد..!! ئای لە هەورازی ئەو شاخەی، کە لەگەڵ کۆمەڵێ پیر و مناڵ و لاودا پیایدا هەڵزنان..!!

ئێستاش دوا قسەی دایکی لە گوێچکەیدا دەزرنگێتەوە: «ئەرخەوان گیان نەکەی بێ هەواڵی خۆتمان بکەیت..!!». جا چی بکات و چی لە دەست دێت..!! هەر کەمێکی ترە وەکو پاڵەوانەکەی «چیخۆف» هەناسەی سارد دەبێت.. ئەو «چیخۆف»ی هەبوو بەهەموو دنیای بناسێنێت، ئەم کێی هەیە..؟! خۆ کەسێک نییە جار جار سەر بە ژوورە چۆڵەکەیدا بکات و کەمێک دڵنەوایيشی بداتەوە. ها ئێستا نا ساتێکی تر خەمێکی قورستر لەگەڵ خۆی دەباتەوە.. ئافرەتێکی چەند سەیرە، بڵێ بۆ وا لە خۆت دەکەیت..!!

جاری جارانیش نییە نێوانیان هەر چەند شارێک بێت و هەر کاتێ ئارەزوو بکات، کەلوپەلەکانی بئاخنێتە جانتاکەی، تەنانەت گوێ بە وانەکانیشی نەدات و بگەڕێتەوە لای.. نا نا ئێستا زۆر جیایە.. ئەگەر جووتێ شاباڵیشی هەبێت هەر پێی ناگاتەوە.. چۆن دەتوانێت هەزارەها هەزار شار و شارۆچکە و لادێ و ڕووبار ببڕێت..!!

هەرگیز خۆی وا بە کڵۆڵی نەدیوە، نامەکەی دەستیشی لە خۆی کڵۆڵتر.. هەست دەکات چۆلەکەیەکی باڵکراوی دەستی منداڵێکی لاسارە و بەزەیی پیادا دێتەوە، بۆیە دەینووسێنێت بە سنگیەوە.. سووک سووک لە دڵی نزیکی ئەکاتەوە.. بیر دەکاتەوە: «ئاخۆ ئەمە دڵی دەرهێنراوی خۆیەتی، یان هی دایکی..؟!» سەری لێ دەرناکات، ئەوەندە دەزانێت بۆنی دایکی لێ دێت، بۆیە زیاتر بەزەیی پیادا دێتەوە، هێندەی تر دەینووسێنێت بە سنگی خۆیەوە.. هەست دەکات نامەکە لە نێوان دەست و سنگیدا خەوی لێکەوتووە و دڵی نایە خەبەری بکاتەوە.

وردە وردە دەستی لە سەر نامەکە سڕدەبێت و هەست دەکا لە لەشی جیا دەبێتەوە.. ئێستا پەنجەکانی چەند لەو ماسییە وردە دەچن، کە منداڵ بوو لەگەڵ دایکی لە بازاڕ کڕییان..!! سەرەتا دایکی ڕازیی نەبوو بۆی بکڕێت، بەڵام کە ئەم پێی لێ کردە کەوش و وتی:

ــ دەبێت هەر بۆم بکڕیت، دەنا لە گەڵتا نایەم.

ناچار بوو ملی دا.

لە نزیک وێستگەی پاسەکان، سەدان وردەماسی لە ناو شووشەیەکی

گەورە کرابوون.. منداڵەوردکە دەوریان لێ دابوو.. دایکی پەنجا فلسی دایە پیاوەکە و ئەمیش خێرا وردەماسییەکی بەقەدەر پەنجەی دۆشاومژەی خۆی بۆ دەرهێنا.. بۆی خستە ناو زەرفێکی نایلۆنی پڕ لە ئاوەوە و پێی وت:

ــ دەبێت لەماڵەوە بیخەیتە شووشەیەک و زوو زوو ئاوەکەی بگۆڕیت و وردەنانی بدەیتێ.

هەرکە گەیشتنەوە ماڵ، خێرا شووشەیەکی دۆشاوی تەماتەی پڕئاوی لە دیوی دەرەوەی پەنجەرەکەی دانا و وردەماسییەکەی خستە ناو.. تا شەو درەنگانێ بەدیارییەوە دانیشت و سەرنجی دەدایێ.. ناوناوەش ئاوەکەی بۆ دەگۆڕی و وردەنانی بۆ دادەنا.

بەیانی پێش دایکی خەبەری بووەوە و خێرا خۆی گەیاندە لای پەنجەرەکەوە.. هەرکە شووشەکەی بینی، تا تینی تیا بوو قیژاندی.. دایکی لەگەڵ قیژەی ئەم خەبەری بووەوە و بۆ لای چوو:

ــ چی بوو ئەرخەوان گیان..؟!

ــ سەیریکە..!!

سەرمای شەوەکە ئاوەکەی کردبووە شەختە و ماسییەکەش تیایدا ڕەق بووبوو.

ئێستا ئەمیش نەک هەر دەستی، هەموو گیانی تەزیوە و وا هەست دەکات ماسییە وردەکەیە و بۆتە شەختە. ئەوەی بیریشی لێناکاتەوە نامەکەیە .(**)

ئۆکتۆبەری ١٩٩٢ـ ئەڵمانیا

---

* کورتەی چیرۆکێکی چیخۆفە ، لە خەونی پاڵەوانەکەدا بەرجەستە بووە. گرنگیی چیرۆکەکە، وەکو ڕەخنەگرێکی ڕووسی بۆی چووە ، لەو کۆتاییەیە، کە مناڵەکە دوای ئەوەی هەموو ئێش و ئازارەکانی خۆی لە نامەکەدا نووسیوە، ئینجا لە سەر زەرفەکەی دەنووسێت: «بۆ باپیرم» ، واتە ئەقڵی بەوەدا ناشکێت ناونیشانی باپیری لە سەر بنووسێت.

** ئەم چیرۆکە پێشتریش لە ژمارە (٨) ی گۆڤاری «وان»ی ساڵی (١٩٩٤)دا بڵاوکراوەتەوە.

# جیهان له فنجانی قاوه‌دا

پێشکه‌شه به دکتۆر ئازاد عه‌بدوللای هاوڕێم

ـ بۆ هه‌موو ئه‌وانه‌ی ده‌ستی فاڵ و قاوه‌گرتنه‌وه‌یان هه‌یه.. تکایه به‌زووترین کات له به‌رده‌م باره‌گای سه‌رۆک ئاماده‌بن.

چه‌ند ڕۆژه له‌و ڕادیۆیه‌ی شۆڕشدا، بێجگه له‌و بانگه‌وازه، گوێت له هیچ شتێکی تر نابێت.. به دوو زمان و به هه‌موو دیالێکتیکه‌کان ده‌خوێندرێته‌وه.

ئه‌گه‌رچی نیوه‌ی خه‌ڵکی وڵات خۆیان به‌فاڵچی و جادووگه‌ر ده‌زانن.. جادووگه‌ری تاکه پیشه‌یه، له هه‌موو بارودۆخێکدا ده‌توانێت نانی خۆیان و منداڵیان مسۆگه‌ر بکات، به‌ڵام له خۆیان ڕانابینن فاڵ بۆ سه‌رۆک بگرنه‌وه...

ئه‌وان زۆریش له‌وه دڵنیا نین، که سه‌رۆک بۆ فاڵگرتنه‌وه بانگیان ده‌کات.. له‌وه ده‌ترسن پیلان بێت بۆ سه‌رنگوومکردنیان.. به‌تایبه‌تی دوای ئه‌وه‌ی ژماره‌ی جادووگه‌ران به‌ڕاده‌یه‌ک زۆربووه، نیوه‌ی خه‌ڵک بوون به فاڵچی و فاڵ بۆ نیوه‌که‌ی تر ده‌گرنه‌وه.. خه‌ڵک وا ڕاهاتوون به‌بێ فاڵ و قاوه‌گرتنه‌وه ده‌ست به‌ئاودا نه‌که‌ن.. بۆ هه‌موو کارێ، ده‌بێت فاڵچی پێیان بڵێت بیکه‌ن، یان نه‌یکه‌ن.. هه‌تا چه‌کهه‌ڵگرتن و چه‌کدانانیش ئه‌وان بڕیاری له سه‌ر ده‌ده‌ن.. له‌م ماوه‌یه‌شدا ژماره‌یه‌کی زۆر له شۆڕشگێڕان چه‌کیان داناوه.. ئه‌مه ئه‌وه‌نده‌ی تر له نیهادی سه‌رۆک به‌دگومانی کردوون.. له‌وه ده‌ترسن بیخاته ئه‌ستۆی ئه‌وان و سزایان بدات.

ڕادیۆکه به‌رده‌وام بانگه‌وازی خۆی ده‌کات، به‌بێ ئه‌وه‌ی تاقه که‌سێکیش به پیرییه‌وه بچێت.. سه‌رۆکیش له ژووره‌که‌ی خۆی له سه‌ر ئاو و ئاگر چاوه‌ڕێیان ده‌کات.. له هه‌موو ژیانیدا خۆی وا به‌شپرزه‌یی نه‌دیوه.. به‌پێچه‌وانه‌ی ڕۆژگاری جاران، ژووره‌که‌ی لێ بووه به گۆڕ و ئۆقره‌ی تیادا ناگرێت.. ئه‌و هه‌واڵانه‌ی له به‌ره‌کانی شه‌ڕیشه‌وه پێی ده‌گه‌ن، ئه‌وه‌نده‌ی دیکه

سام و بیمی دەخەنە دڵیەوە.. جار جار هەتا بەردەرگا دەچێت.. دوور و نزیک چاوەکانی دەگێڕێت، بەشکو یەکێ لەو فاڵچیانە بە پیر بانگەوازەکەیەوە هاتبێت، بەڵام لە پیاوەکانی خۆی زیاتر کەسی تری بەرچاو ناکەوێت.. ئەوانیش وەک بڵێی سووسەی شتێکیان کردبێت، ڕەنگبزڕکاو و زارەترەک لە بەردەرگا وەستاون. کە تەواو لێیان وردەبێتەوە، بە چەند سیسرکێکی زلی دێنە بەرچاو و قێزیان لێدەکاتەوە.. هەندێک جاریش لە دڵەوە بەزەیی پیایاندا دێتەوە.. زۆربەیان هاوڕێی منداڵیی خۆی و کوڕی گەڕەکەکەین.. ئەوان بیست ساڵە بە چرکە پشتیان بەرنەداوە.. وازیان لە هەموو کەس و کاری خۆیان هێناوە، هەر بۆئەوەی لەو زیاتر بیر لە هیچ کەسێکی تر نەکەنەوە.. لە سەرتاپای ئەم وڵاتەدا بە جەربەزە و چاونەترس ناسراون، بەڵام لە بەرامبەر ئەو تۆفانەی چاوەڕێی دەکات، زۆر بە بچووک و دەستەپاچە دێنە بەرچاوی.. هەر خۆی دەزانێت چ تۆفانێکی قڕکەر بە ڕێگاوەیە، بەڵام ناکرێت کەسیشی لێ ئاگادار بکاتەوە.. هەر ئەمەشە خەمەکەی تا ئەو ڕادەیە قورس کردووە.. ئەم تەنها باوەڕی بەفاڵچییەکانە، کە بتوانن پێش لە تۆفانی ئاوا بگرن، کەچی ئەوانیش ناوێرن لێی نزیک بکەونەوە... کەس نییە ئەوەندەی ئەم باوەڕی بە فاڵ هەبێت.. هەقیشیەتی.. ئەو «دادە سۆزرەت»ـە یادی بەخێر، هەرچی پێی دەوت، وەکو خەونی پێغەمبەران، ڕێک و ڕاست دەردەچوو.. دواجار کە بینی، شەوی هەینی بوو.. فنجانی قاوەکەی لە چاوە کزەکانی نزیک کردبووەوە و پێی دەوت: «لەسەر لووتکەی کێوێکی بەرز دەست لە ئەژنۆ دانیشتوویت.. لەشکرەکەشت بە دامێن و قەدپاڵی کێودا بڵاوبوونەتەوە.. ڕەوەکەروێشکێکی زۆر سەیر، کەڵبەیان لەکەڵبەی گورگ و چڕنووکیان لە چڕنووکی پشیلەکێوی دەچێت، کێوەکە بنکۆڵ دەکەن.. نە تەقەیەک نە هاوارێکتان بۆ ناکرێت.. لەشکرەکەت لە ترسا چەکەکانیان توور هەڵدەدەن.. هەریەکەیان پەڕەوازەی لایەک دەبن.. تۆ بەتەنیا دەمێنیتەوە.. کەروێشک وازناهێنن.. کێویش وردە وردە ڕۆدەچێت و نغرۆ دەبێت»...

ئای لە نهێنیی شتەکان..!! ئای لە پەیوەندیی شاراوە و پەنهانی نێوانیان..!! پیرەژنێ لەو کووخەی نزیک دارستانەکەی قەراغ شار کتوپڕ

دەمــــرێت، لەشکرێک لەوپەڕی ورە و تواناوە پەرتەوازە دەبێت، شـــۆڕشـــێک ئاشبەتاڵ دەکات و پرزەی لێ دەبڕێت.. سەرۆکێک پەلی لە هەرچوارلا دەبڕێت، نە زەوی بەخۆی دەگرێت و نە ئاسمان.. چی بوو ئەو مردنە ناوەختە..!! چی بوو ئەو کۆچە کتوپڕ و بێدەنگە..!! چی دەبوو ئەگەر چەند ساڵێکی تریش بژیایە..!! تازە سەرۆک دوای مردنی ئەو چی بکات و ڕوو لە کوێ بکات..؟! لە مەودوا کێ پیلانی بۆ دابنێت و.... هاکە تۆفان هات و دار و بەرد و خاک و خۆڵیشی ڕامالی.. ئەم وەکو «حەزرەتی نووح» توانای دروستکردنی کەشتییشی نییە، تا خۆی و لەشکرەکەی پێ دەرباز بکات.. وا شپرزەبووە دەستی هیچ ئیشێ ناگرێت.. تەنانەت لە سێ ژەم ژەمێکیشی بەتەواوی بۆ ناخورێت.. ئەو وەسواسییە وایلێکردووە، قێز لە هەموو شتێ بکاتەوە.. ئەو پیاوانەی خۆی، کە جاران لای پیرۆزترین شت بوون، لە بەرچاوی دەبن بە سیسرک و قێزیان لێدەکاتەوە.. هەرکە دەیانبینێت هێڵنج دەدات.. هەر چەند دەکات دڵی خواردنی دەستیان نابات.. هەر لە منداڵییەوە قێز لە سیسرک و قالۆنچە و مشک و زیندەوەری تر دەکاتەوە.. بە بینینیان دڵی تێکهەڵدێت.. بۆ نەگبەتییش ماڵیان لە سەر شیوەکەی گەڕەکی «سەیداوە» بوو.. هەر چۆن دەیڕوانی سیسرکێ، بۆقێ، مارمێلکەیەکی بەرچاودەکەوت.. دەیان جار قاچی سیسرک و بێچووەمارمێلکە و مێشی لە ناو نان و چێشتدا دەدۆزییەوە و مردنی بەچاوی خۆی دەدی.. هەر ئەمەش وایلێکردبوو ئەوەندە ڕقی لە بەهار و هاوین بێت.. لە ترسی ئەوانەبوو ئەو زستانە سارد و دڵڕەقەی پێخۆش بوو، کە پێنج سەعاتی قوتابخانە، لە پۆلی وەکو سارنج و لە سەر کورسییە چەپوچێرەکەی هەڵدەلەرزی...

ئێستاش وەکو سەردەمی منداڵیی حەزی لە زستانە.. حەز لە بەفر و کڕێوە دەکات.. حەز دەکات چوار وەرزی ساڵ زستان بێت، کەچی زۆر دڵی بەو هەورە ڕەشانە تەنگە، کە چەند ڕۆژێکە لە هەر (چوار) لاوە ئاسمانی سەر ئەو کێوەیان گەمارۆداوە.. ترسێکی گەورەیان خستۆتە دڵیەوە.. ئاخر ناهەقیشی نییە.. تەمووز و هەوری وایان نەوتووە.. تەمەنی وا لە سیوپێنج نزیک دەبێتەوە، یەکەمجارە شتی وا ببینێت.. ئاخ بۆ فاڵچیەک، جادووگەرێک، لەم ڕۆژە ڕەشە

بە فریایکەوێت..!! ئەو هەورانە هی ئەوەن لێیان بترسێت.. ئاخر زۆر لەناکاو پەیدابوون.. لە هەر (چوار) لاوە هاتن.. (چوار) «با»ی ئاڕاستە جیاواز هێناینی.. نە ئەوەتا دەیبارێنن و بە جارێ ورد و درشت نقووم دەکەن، نە پەرشوبڵاویش دەبنەوە... لە هەموو ژیانیدا بەقەدەر ئەو چەند ڕۆژە سەرمای نەبووە.. پاڵتۆ خوریەکەی لەبەرکردووە و بە جامانە کاشمیلۆنەکەشی دەموچاوی پێچاوە.. پێی شەرمە، ئەگینا زۆپای ژوورەکەشی پڕدەکات لە دار و ئاگر دەکاتەوە.. وانەبێت ئەو لەرزەی گیانی دەرناچێت.. ئەو دانەچۆقەیە تەواو پەرێشانی کردووە. ئەوەتا پیاوەکانی بە توێی کراسێکەوە لە دەرەوە وەستاون، بەبێ ئەوەی هەست بە سەرماش بکەن.. جار جار بە دزییەوە سەرنجیان دەداتێ، تا بزانێت ئەو هەڵسوکەوتەی ئەویان بەلاوە سەیرنییە.. یان پێی پێناکەنن..!! هەست بە هیچ گۆڕانێکی سەروسیمایان ناکات.. بەوە باشە ئەوان لە هیچ هەڵسوکەوتێکی سەرۆکی خۆیان ناکەونە گومانەوە.. تا ئێستا نەیبیستووە و بەرگوێشی نەکەوتۆتەوە، یەکێکیان لە خۆی، یان لە کەسێکی تری پرسیبێت: ئەوە سەرۆک بۆچی وایکرد و بۆچی واینەکرد..؟! ئەگەرچی هەندێ جار خۆی لە ئیشەکانی خۆی تەریقبۆتەوە و سەرزەنشتی خۆیکردووە.. پڕبەدڵ حەزی کردووە ئەوانیش سەرزەنشتی بکەن و ڕەخنەی توندوتیژی لێبگرن، کەچی ئەوان وەک نە بایان دیبێت و نە باران، لە گوڵ کاڵتریان پێ نەوتووە.. ئەمە زیاتر وایلێکردبوو باوەڕ بە فاڵ بێنێت، چونکە ئەم لە سەر قسەکانی «دادە سۆزرەت»، ئەو کارانەی دەکرد... مانگی جارێ مەفرەزەیەکی لە هەرە نزیکەکانی ئامادە دەکرد.. کە شەو دادەهات بەرەو قەراغی شار دەکەوتنە ڕێ.. بەفرو ڕەهێڵە و لافاویش ڕێی پێ نەدەگرتن.. دوای چەند سەعاتێ دەگەیشتنە ناو دارستانەکە.. لەوێ ئەم جیادەبۆوە و ئەوانیش هەریەکەی لەپەنا قەدی درەختێ خۆی مەڵاسدەدا و جووڵەیان لە خۆیان دەبڕی، بەبێ ئەوەی بزانن سەرۆکیان بۆکوێ و بۆچی چوو.. ئەگەر بشیانویستایە هەر نەیاندەزانی.. هەرگیز بیریان بۆ ئەوە نەدەچوو، ئەو هەموو ڕێگا سەختە ببڕێت، بۆئەوەی بچێت بۆ ناو ئەو کووخە و ئەو پیرەژنە ببینێت... ئەم لە ژوورەوە خێرا قاوە گەرمەکەی دەخواردەوە.. کەمێکی لە

ژێرەکەیدا جێدەهێشت و دەیدایە دەست «دادە سۆزرەت».. ئەویش بە سووکی فنجانەکەی بە سەر ژێرفنجانەکەدا قلّپدەکردەوە و هەندێ دووعای لە سەر دەخوێند.. دوایی دەستی بۆ دەبرد و لە چاوە کزەکانی نزیکدەکردەوە.. لە پێشدا پێی دەوت لە ماوەی ئەم مانگەدا چی ڕوودەدات.. دواییش پێی دەوت چی بکات و چی نەکات.. هەر ڕووداوێ ئەم پێشبینی بکردایە، بەبێ زیاد و کەم ڕوویدەدا.. ئەم دنیایە بە تانوپۆیەوە لە ناو فنجانی قاوەکەی دەستیدا نیشتەجێ بووبوو، بەلام لە چاوە کزەکانی ئەو زیاتر هیچ چاوێکی تر نەیدەدین.. هەموو شتێ لەوێ تۆمارکرابوون و دەخوێندرانەوە.. سەرۆکەکان: ڕۆژ و مانگ و سالّی لە دایکبوونیان.. ژمارەی چەکدار و لایەنگرانیان.. ڕۆژی دەسپێکردنی شۆڕشی یەکەم و دووەم و سێیەم و دەیەمیان.. ژمارەو ڕۆژی ئاشبەتالّەکانیان... شۆڕشگێڕان: ژمارەی چەکەکانیان.. ڕۆژی پەیوەندییکردنیان. شەهیدان و دەسکەوتەکانی شۆڕش و زیانەکانی دوژمن و هەموو شتێ لەناو فنجانی قاوەدا دەبینرا.. بیست سالّی شۆڕش بەموو لە قسەکانی لاینەدا... یەکەمجار کە ناسی و فریشتەئاسا بە فریای کەوت، لە پۆلی سێیەمی ناوەندی بوو.. تاقیکردنەوەی بەکەلۆریا چەند ڕۆژێکی مابوو، کەچی لە هیچ یەکێ لە کتێبەکانی چوار لاپەڕەی لەبەرنەکردبوو.. باوکیشی سوێندی لێ خواردبوو، ئەگەر دەرنەچێت، وەکو نان دەیدات بە تەنوورەوە.. بە مەقاش گۆشت و ئێسقانی برژاوی دەردەهێنێت و دەرخواردی سەگە بەڕەللاکانی ناوشاری دەدات.. کەس نەبوو لە گەڕەک «جەبار نانەوا»ی باوکی نەناسێت.. کە بە دار دەکەوتە گیانی ئەم و خوشک و براکەی، دراوسێکانیان لە مالّی خۆیانەوە هەلّدەلەرزین.. بە هیچ شتێکیش شێت و هار نەدەبوو، بەوەنەبێت منداڵەکانی لە قوتابخانە دەرنەچن.. بەتایبەتییش ئەم «جیهانگیر»ەی کوڕی.. هەر بەدوایەوە بوو.. زوو زووش دەچوو بۆ قوتابخانە و بۆ ژوورەکەی بەڕێوەبەر.. چ قوورەت بوو بلّێن لە یەکێ لە وانەکان باش نییە..!! هەر خێرا دەچوو لە پۆلەکەی دەریدەهێنا.. لە بەرچاوی قوتابی و مامۆستاکان ئەوەندەی تێهەلّدەدا، تا دەبووڕایەوە و هەموو گیانی دەبووە خەلّتانی خوێن.. وایلێهات هەر جارێ بچوایە و پرسیاری بکردایە،

مامۆستاکانی لە ترسی ئەوەی دارکاریی نەکات، پێیان دەوت:

ــ هەر زۆر زۆر باش بووە.

ئەویش هەموو جارێ پێی دەوتن:

ــ ئەی چۆن مامۆستا..!! خۆ بەخۆڕایی نەیانوتووە کوتەک لە بەهەشتەوە هاتووە..!!

هەر لەو ترسەش بوو سەری سالآن پالێکیان پێوە دەنا و ڕەوانەی پۆلێکی تریان دەکرد. ئەم تەمەڵ نەبوو، بەلآم ڕقی لە کتێبەکانی بوو.. پڕبەدڵ حەزی دەکرد کوێربوایە، بەس ئەو وشە ڕەزاگرانانەی نەدیایە.. بەدەست خۆی نەبوو هەرکە سەیری دەکردن، باوکی دەدی بە مەقاشە داخبووەکەیەوە لە پەنایانەوە سەری دەردەهێنا و هەڕەشەی لێدەکرد.. کەچی بۆ چاوبەستی ئەویش دەبوایە بەردەوام کتێبێکیشی بەدەستەوەبێت، نەوەکا لەپڕ پەیدابێت و بەبێ کتێب بیبینێت... ئەم وەکو ڕقی لە خوێندنەوەی کتێبەکانی بوو، لە پۆلیش گوێی لە مامۆستاکانی نەدەگرت.. ئاخر بە دەست خۆی نەبوو، نەیدەتوانی.. هەر زوو زوو دەنگێ لە غەیبەوە پێی دەوت: «مامۆستاکان دڕندەن.. ئاژەڵی نەوسنن.. هەرچی ئەوان بیڵێن درۆیە، دووڕوویییە»(١)... ئەم شتێکی تریشی هەبوو، زۆر زوو برسی دەبوو.. کە برسییشی بوایە، نەیدەتوانی گوێ لە مامۆستا بگرێت.. هەموو خەیاڵێکی لای سکی بوو.. هەمیشە ناو دەمی ئاودڕکەی لیک بوو.. خۆیشی نەیدەزانی نهێنی لەوەدا چییە، هەر پێی بخستایەتە پۆل، هەستی بە برسێتی دەکرد... لە بیریەتی کە لە پۆلی پێنجی سەرەتایی بوو، لە دوای ئەو کوڕە دادەنیشت، کە پالتۆیەکی چەرمی لە ڕەنگی ورگی مەڕی لەبەردابوو.. هەرچەند دەیدی، ئەو ئێوارەیەی بیردەکەوتەوە، کە دایکی سەروپێی لێنابوو، بۆیە نەیدەتوانی چاوی لە سەر بگوێزێتەوە.. لەجیاتی دەمی مامۆستا و تەختەڕەش، سەیری ئەوی دەکرد و خەیاڵ دەیبردەوە.. بیری لەو ئێوارەیە دەکردەوە، کە لەگەڵ دایک و باوک و خوشک و براکەی ئەو سەروپێ بەلەزەتەیان خوارد.. هەموو ڕۆژێکییش هەر بەو هیوایە دەگەڕایەوە ماڵ، کە سەروپێ بخوات.. بەشکو هەر لە سەری کۆڵانەوە بۆنەکەی بێت بەلووتیدا.. لە ژوورەوەش سفرە بە تانوپۆوە ڕازابێتەوە.. لەملا نانی گەرمی بازاڕ، لەولا

شێلم بەترش.. مەنجەڵی سەروپێش لە ناوەڕاست، هەڵمی لەسەر هەڵبستێت.. ئەوان دانیشتوون و چاوەڕێی ئەم دەکەن لە قوتابخانە بگەڕێتەوە، بەڵام کە دەهاتەوە و دۆغەوا، یان کفتە درۆزنەی(٢) دەدی، لە داخا شێت و هار دەبوو.. پڕ بە هەموو دڵ حەزی دەکرد، ڕۆژێ لە ڕۆژان تا تینی تیایە گازێ لە پاڵتۆی ئەو کوڕە بگرێت و ئەو حەزەی دامرکێنێتەوە، بەڵام نەیدەوێرا.. ئەو کوڕێکی زۆر هارو هاج بوو.. هەر لە خۆیەوە بەگژ ئەم و ئەودا دەچوو.. مامۆستاکان دادوبێدادیان بوو لە دەستی.. باوکی ئەفسەری پۆلیس بوو.. کاتی خۆی دوو جاریشی لەم هەڵدابوو.. ئیتر چۆن زاتی دەکرد گازی لێبگرێت..!! بەڵام زاتی کرد و گازێکی زۆر پیسیشی لێگرت.. ئەوە ئەو جارە بوو، کە لە حەوشەی قوتابخانە ڕایان دەکرد و لەپڕ بەریەکتر کەوتن.. ئەم بەبێ یەک و دوو، گازێکی لە نەرمەی قۆڵی گرت.. هەرچەند منداڵە هاواری کرد و زریکاندی، دەمی لەسەر هەڵنەگرت.. تا مامۆستا بەفریای نەکەوت وازینەهێنا.. کاتێ قۆڵی منداڵەیان هەڵکرد، جێی ددانەکانی یەکە بەیەکە دەرکەوتبوون و خوێنیان تیا زابوو.. مامۆستا چوار داری لێدا و پێی وت:

ــ دەزانم خەتای ئەو بووە، بەڵام دەبوایە بە من بڵێیت، نەک ئاوا گازی لێبگرێت.

لەو ڕۆژەوە ئەو منداڵە نەیدەوێرا لە ئاستی ئەم سەرهەڵبڕێت.. باشیش بوو باوکی نەیزانی، ئەگینا دەیکوشت.. هەموو جارێ پێی دەوت:

ــ لە خوێندن زیاتر هیچ شتێکی ترم بۆ ناکەیت.

هەموو شێوە یارییەک قەدەغە بوو.. بۆ نەگبەتییش شێتی تۆپتۆپێن بوو.. بە دەستی بوایە شەو و ڕۆژ شەقی لە تۆپ هەڵدابوایە.. ئێواران، کاتێ منداڵ و مێردمنداڵی گەڕەک لە گۆڕەپانەکەی ئەوبەریان دووگۆڵییان دەکرد، ئەمیش کتێبێکی بە دەستەوە دەگرت و خۆی دەگەیاندێ.. چەند شووتێک و خێرا بۆ سەر شەقامەکەی ئەوسەر.. نیگای چاوەکانی تا دوور ڕەوانە دەکرد، تا بزانێت باوکی دیارنییە.. کە دیارنەبوایە خێرا دەهاتەوە و دەستی پێدەکردەوە... لە قوتابخانەش دڵی هەر بە وانەی وەرزش خۆش بوو.. حەزی دەکرد وانەکانی تریش بکرێن بە وەرزش.. هەموو ساڵێکیش بەشدارییی لە خولی وەرزشی

قوتابخـانەکاندا دەکرد.. ئەگەرچی وەکو هاوڕێکانی بۆی نـەدەلوا مەشق بکات، بەڵام هـەمـیـشـە لە خـەیاڵی خۆیدا خـەریک بوو.. چۆن تۆپ لە بـەرامبـەرەکەی بسـتـێنێت..؟! چۆن لە مـاوەیەکی کـورتدا لـە چوار و پێنـج دەربازیکات و بیگەیەنێتـە بەردەم گۆڵچی..؟! لەوێوە بـەجوانترین شـێوە بە تۆڕەکەیدا بدات و چەپڵـە و فیکەی جـەمـاوەر لە حـەوت گەڕەک ببیستـرێت..!! هـەرچی هونەر و فێڵـی یاریی تۆپتۆپێن هەیە لە خـەیاڵ فێربوو.. کتێب و سفرەی نانخـواردن و نوێن و هـەمـوو شـتێ لە بـەرچاوی ئـەمـدا دەبوون بـە گـۆڕەپانـی یاریـی.. لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بەچاکترین یاریکەر ناسرا.. لە سـەرتاسـەری وڵاتدا باس باسـی ئەو منداڵـە موعجـیزەیە بوو.. ئاسک بـوو ڕایدەکرد.. پڵنگ بوو هێرشـی دەبرد.. ڕۆژنامـە و گۆڤـارەکان هـەر زوو زوو لەسـەریان دەنووسـی و وێنەکـەیان بە گـەورەیی بڵاودەکـردەوە.. تـەنانـەت ئـەوانـەش لەسـەریان دەنووسـی، کـە لە ژیانیـاندا حـەزیان لە وەرزش نـەبووە: «منداڵێکی خانووەقـوڕەکانی سـەیداوە، چاوەڕێی ئـەوەی لێدەکـرێت ببـێت بـەچاکتـرین یاریکەری جـیـهانـی»، «بەڕێز پارێزگاری شـار فـەریکەیارییکەری لێهاتوو جیهانگیری جـەبار نانەوا خـەڵات دەکات».. لە یەکێ لە ژمارەکانی ڕۆژنامـەکەی کوڕی سـەرۆکیشدا وێنەیەکی «جیهانگیر»، کە لە نێوان پێنج یارییکەردا تۆپی قۆزتۆتەوە و جوانترین گۆڵی کردووە؛ لە یەکـەم لاپەڕە و لە خـوار وێنەی سـەرۆکی گـەورەدا بڵاوکراوەتەوە و لەژێریدا بەگەورەیی نووسراوە: ئەمە خەونە یان ڕاستی..؟!

لە بیـریەتی جـارێکیـان ئەو پیـاوەی مـەشـقی بە تیـپی هەڵبـژێردراوی شـار دەکرد، دەستی بەسەرییدا هێنا و پێی وت:

ــ هەر خۆم دەزانم تۆ دەبیت بە چ یاریکەرێکی گەورە..!!

ئەو ڕۆژانەی ئەم یاریـی بکردایە، چی گەورە و بچـووکـی ئەو شـارە هـەبوون، لە بـەیانیـیـەوە دەچوون جـێگایان دەگـرت.. بەخـتـەوەر ئەو کـەسـە بوو کـورسـیـیـەکـانی لای پێـشـەوەی دەست بکەوێت، تـا لە نزیکەوە ئەو منداڵە عـاجبـاتییـە ببینێت، کە چۆن هەر جارێ بـەشێـوەیەک ئەو تۆپە لەمـسـەری گـۆڕەپان دەگـەیەنێتـە ئەوسـەری، بـەبێ ئەوەی بهـێـڵـێت بەر قـاچی هیچ یارییکەرێکی تر بکەوێت.. هـەندێکیـان هەر بۆ ئەوە دەهاتن، تا سـەیری ئەو

قـاچە باریکانەی بکەن، کـە لە سـەرەتای یارییـەکـەوە تـا تەواوبوونـی بـەیەک خـێـرایی ڕادەکـەن.. نـە مـاندووبـوون دەزانن، نە بێـزاری.. هەندێکی تـریان سـەریان لەوە سـوڕمابوو چۆن ئەو تۆپە ئاوا بەلێـزانی بە سنگ دەگرێتـەوە و دەیدا بە قاچی.. هەر یەکەی حەزی لە هونەرێ لە هونەرەکانی بوو.. هی واش هەبوو لە هـەمووی، بەبێ جـیـاوازی.. هەندێکیـان مـەراقـیـان بـوو بزانن، ئەوە کوڕی چ بەختەوەرێکە..!! لە هەر چوار لای خۆیان ڕادەمان و چاویان دەگێڕا، بەشکو دایک و باوکی ببینن و ئافەرینیان لێ بکەن.. دەیانوت:

ـ ئەڵبەتە لێرەن.

هەمـوو جـارێکیش دوای تەواوبوونی یاری دوای دەکـەوتن، تـا بزانن لەگـەڵ کێ دەڕواتەوە، دیارە ئەوانـە دایک و باکین.. کـەچی هەمـوو جـارێ بـەتەنیـا ڕێی ماڵەوەی دەگرتەبەر.. ئەمە بوو بە مەراقی خەڵکێکی زۆر لەوانەی پێی سەرسام بووبوون.. ئاخۆ کێن دایک و باوکی جیهانگیر..؟! پیرن یان گەنج..؟! هەژارن یان دەوڵەمـەند..؟! هەتا ڕۆژێکیـان بـەچاوی خـۆیان باوکیـان دی، کـە چۆن بە تێـلایەکـەوە پەلامـاری دا... سـەرەتا وایانزانی شـێـتـە، بەڵام دوایی زانرا کـە ئەمـەیە جەباری نانەوا، بـاوکی چاکترین یاریکەری وڵات.. خـۆی گەیاندە سـەر سـەری و بە تێلا تێیکەوت.. تا جەماوەر هاتن و لەژێر دەسـتـیـان دەرهێنا، ئەم کاری خۆی کردبوو.. خوێن لە دەم و لووتیەوە فیچقەی دەکرد.. ئەم سێ ڕۆژ لە نەخـۆشـخـانە و بـاوکی سێ مـانگ لە زیندان مـایەوە.. ئەمـە ئەو کاتە بـوو، کە قۆناغی منداڵیی بڕیبوو، پێی نـابووە قۆناغـی هەرزەکارییەوە.. پۆلی سێیـەمـی ناوەندی بوو.. ئا ئـەوە ئەو ڕۆژە بوو، کە لێی دەترسـا.. چەند دڵی بـەو ناوبانگە خـۆش بوو، ئـەوەندەش لێی دەترسـا.. لەوە دەترسـا ئاوا بـاوکی پێی بزانێت و بەو دەردەی بەرێت.. لەو ڕۆژەوە ئەویش وەکو «ئەسکەندەر قـولی»ی(٣) هـاوڕێی ببـڕای ببـڕای بەلای تۆپدا نەچوو.. بەجـارێ ڕقـی لە یاریی تۆپتـۆپێن هەسـتـا.. ئەوانـەشـی پێ شـێت بوو، کـە یاریی وا بێـمـانا دەکـەن.. بـاوەڕی بە قـسـەی کابرای لادێیی هێنا، کە وتبووی:

ـ ئاخـر تووخـوا دڵی چیـیم بە شـار خـۆشـبـێت، بیـسـتـودوو زەلام خـۆیان ڕووتکردۆتـەوە و دوای پارچە هەمـانەیەک کـەوتوون..!! بە هەزارانیش دەوریان

لێداون و چەپڵەیان بۆ لێدەدەن..!!

هەرچەند مامۆستا و قوتابی و کوڕانی گەڕەک هاتن و لێی پاڕانەوە، کە واز نەهێنێت، سـوودی نەبوو.. ئەوان باوەڕیان نەدەکـرد ئەو هەمـوو حـەز و ئارەزووەی، بەو دارکـارییکردنەی باوکی بمرێت.. یەکێ لە هاوڕێکانی بە گاڵتەوە پێی وت:

ــ هەتیو خۆ تۆ موگناتیس نییت، تا بەلێدان سیفاتت ون بکەیت..!!

کە باوکی لە زیندان گەڕایەوە، چینێکی چاکی تری تێهەڵدا و پێی وت:

ــ ئەوا ئەمجارەش نەمکوشتی، بەڵام بەگۆڕی باوکم سەری ساڵ دەرنەچیت، وەکـو نان دەتدەم بە تەنوورەوە.. بە مـەقاش گـۆشت و ئێسـقانی برژاوت دەردەهێنم و دەرخواردی سەگە بەڕەڵلاکانی ناوشاری دەدەم.

هەمـووی چەند ڕۆژێکیشی مابوو بۆ تاقیکردنەوە.. بیری لەوە دەکردەوە سەری خۆی هەڵگرێت و بۆ لایەک بچێت.. هەرخۆیشی بەخۆی دەوت: «باشە بچم بۆ کوێ ..؟! کێم هەیە بچم بۆ لای...» ڕۆژانە لەگەڵ کوڕانی گەڕەک دەچوو بۆ ئەو دارستانەی قەراغ شار، بەشکو لە هەر یەکێ لە کتێبەکانی چوار پێێنج لاپەڕە لەبەرکات.. ئێ ئەوە خوایە هەر ئەوانەی بۆ بێتەوە و دەربچێت، بەڵام هەرچەندی دەکرد بۆی نەدەکرا... ئێوارەیەک بێزار و خەمبار بەرەو ماڵەوە دەگەڕایەوە.. ئەوەندەی نەزانی جیـڕەی دەرگایەکی لە تەنەکـە دروستکراوی هاتەگوێ.. سەری هەڵبڕی و خانووێکی قوڕی پەڕپووتی بینی.. ئانوسات پیرەژنێکی لێهاتە دەرەوە.. نا، ئەوکاتە پیر نەبوو... هەر لە خۆیەوە ترسی لێ نیشت.. خەیاڵی سەیر سەیری بۆ هات.. ئەو هەموو کاتە هاتوچۆی ئەو دارستـانەی دەکرد و هەمـوو ڕۆژێکیش دوو جار بەسـەر ئەو ڕێگایەدا دەڕۆیشت، ئەو کووخەی لەوێ نەدیبوو.... ژنە سووک سووک لێی نزیککەوتەوە و پێی وت:

ــ کوڕی جوان بۆ نایەیت قاوەیەکت بۆ بگرمەوە و پێت بڵێم ئەمساڵ دەردەچیت، یان نا..؟!

ئەم هێشتا لای ڕوون نەبوو ئەوەی دەیبینێت، خەونە یان ڕاستی، بۆیە نەیدەزانی چ وەڵامێکی بداتەوە.. لە شوێنی خۆیدا حەپەسابوو.. نە دەیتوانی

وەڵامی بداتەوە، نە دەشیتوانی جێیبێڵێت.. وا دیاربوو ئەویش هەستی بە پەشۆکاوییەکەی کردبوو، بۆیە بەبێ ئەوەی بزانێت ڕازییە، یان نا، دەستی گرت و بردیە ژوورەوە.. بەدەم ڕۆیشتنەوە پێیی وت:

ــ لە چی دەترسی لە دەورت گەڕێم، ئێستا پوورە سۆزرەتی خۆت دڵت خۆش دەکات.

یەکەمجاربوو گوێی لە ناوی ئاوا سەیر و سەمەرەبێت، بۆیە ئەوەندەی تر ترسا.. دەستی لە ناو دەستی ئەودا موچڕکی پیادا دەهات، بەڵام دەستی چی..؟! نەرم نەرم.. لەوەنەدەچوو باریکە ئێسقانێکی تیابێت.. ئەمە وایلێکرد زیاتر لێی ورد بێتەوە... سیمایەکی سەیری هەبوو.. ناشیرین نەبوو، بەڵام هیچ ئافرەتێکی تری لەو شێوەیە نەدیبوو.. لە کەس نەدەچوو.. شەوی پێشتر لەگەڵ یەک دوانێ لە کوڕانی گەڕەک لەسەربانی خۆیان کۆبووبوونەوە، گوایە سەعی دەکەن، بەڵام سەعیی چی..؟! بۆ خۆیان ڕازی قسەیان دامەزراندبوو.. هەر جارێ باسی شتێکیان دەکرد.. دواجار باسی خێو و جنۆکەیان کرد.. هەموویان باوەڕیان وابوو، کە خێو خراپە و خەڵک دەخاتە سەر ڕێگای خراپ، جنۆکە باشەو ئەوەی بیبینێت مەرامەکانی بۆ دێنێتە دی... ئەم لای ڕوونبوو ئەوەی دەیبینێت کەسێکی ئاسایی نییە، بەڵام لای ڕوون نەبوو خێوە، یان جنۆکە..؟! لەگەڵ ئەوەشدا خۆی و بەختی خۆی لەگەڵی چووە ژوورەوە.. ژووری چی..؟! هەرکە پێی خستە ناویەوە، هەستی کرد مردووە و دەیخەنە گۆڕەوە.. لەمەوپێش زۆری بیستبوو، گوایە مردوو، تەنها کاتێ دەزانێت مردووە، کە دەیخەنە گۆڕەوە و سەری بەر بەردە ڕەقەکە دەکەوێت.. تا ئەو کاتە هەر وا دەزانێت یەکێکە لەوانەی بۆ ناشتنی مردوو هاتووە.. کاتێ خەڵکەکە تێکڕا دەڵێن: «با بڕۆین»، ئەمیش تەکاندەدات، بەڵام هەر ئەوەندە سەری بەرزدەکاتەوە، (تاق) بەر بەردەکە دەکەوێت و لە شوێنی خۆیەوە خپ دەبێت...

هەموو شتێکی ئەو ژوورە ترسناک بوو، کەچی ئەم هەر لە خۆیەوە هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد.. وردە وردە ترسەکەی گیانیشی دەردەچوو.. بگرە هەستی بە ئازایەتیی خۆیشی کرد.. ئەمە زیاتر وایلێکرد وابزانێت مردووە.. مامۆستای ئاین زۆر جار دەیوت:

ــ بنیادەم هەرچەند زووتر لەم دنیایە چاوی ئاوابێت، ئەوەندە بۆ ئەو دنیای باشترە. بەختەوەر ئەو کەسەیە بەمنداڵیی دەمرێت، هەر هیچ نەبێت لە تەمەنی ئێوە.

هەستی کرد مردوویکی بەختەوەرە، هەر لەبەرئەوەشە پێش ئەوەی بینێژن و خۆڵی بەسەردابکەن، هەستی بە مردنی خۆی کردووە.. لە خۆشیا لە دڵەوە دەخەنییەوە، کە تەواو ئیتر نە کتێب دەبینێتەوە و نە قوتابخانە.. نە مامۆستا و نە بەڕێوەبەر.. ترسی تاقیکردنەوە قورسەکان و لێدان و کوتانی باوکی تەواو...

هەر لە منداڵییەوە باوەڕی وابوو هەریەکێ لەم گەردوونە، دوو ڕۆحی تەواو لەیەکتر جیاوازی هەیە.. یەکێکیان بەدو پیس و سەربەست.. ئەویتریان چاک و پاک و کۆیلە.. ئەم دوو ڕۆحە دوور لە یەکتر دەژین، بەڵام هەمیشە بەدوای یەکتردا دەگەڕێن.. ئەمیان بەدوای پاکبوونەوەدا دەگەڕێت، چونکە پیسیی ئارامی لەبەربڕیوە، ئەویتریان بە دوای سەربەستی و ئاسوودەیی، چونکە لە کۆت و زنجیر بێزارە.. هەرکاتێکیش بەیەک بگەن، ئەوا لە ئانوساتدا بەیەکەوە دەمرن.. هەر خوا (یەک) تاک ڕۆحی هەیە و بێهاوەڵە، هەر بۆیەش نەمر و دەستەڵاتدارە.. مردنیش بۆیە هەیە، چونکە ڕۆحەکان، کاتێ بەیەکتردەگەن، هەست بەئاسوودەیی و نەمری دەکەن، هاوکاتیش ئێرەیی بەخوا دەبەن.. ئەگەرچی هەمیشە ئەو ڕاستییەی لەبەرچاو بوو.. دەیزانی هەرکاتێ بە ڕۆحەکەی تری بگاتەوە دەمرێت، کەچی زۆر بەپەرۆشیشەوە بەدوایدا دەگەڕا.. لە هەموو شوێنێ چاوی بۆ دەگێڕا.. ئەگەر چرکەساتەکانی پێش مەرگیش بە ڕۆحە سەربەستەکەی بگاتەوە هەر باشە... ئەم باوەڕی وابوو خەڵک هەموویان وەکو یەک وان.. هەر هەموویان بەقەدەر یەک چاکە و خراپەیان هەیە.. کەچی تەنها ئەم هەستی پێدەکات و سەرجەم خەڵکی تر لەوە بێئاگان.. خۆی و باوکی کردبوو بە نموونە.. ئەم پاک و داماو و کۆیلە، باوکی بەد و پیس و سەربەست، بەڵام وەکو یەک وان، چونکە هەریەکەیان ڕۆحێکی تری جیاوازییان هەیە.. «جیهانگیر»ێکی بەد و پیس و سەربەست و «جەبار نانەوا»یەکی پاک و داماو و کۆیلەی تریش هەن... کاتێ کەمێ هەراش بوو،

هەستی کرد، ئەم سەر بە ئاینێکی جیایە.. ئەوانەی مەلای مزگەوتی گەڕەک و مامۆستای ئاینی قوتابخانە دەیڵێن، زۆر لەوانە جیاوازن، کە ئەم باوەڕی پییانە.. هەندێ جار دەترسا و موچڕکی پیادا دەهات.. هەستی بە تەنیایی دەکرد.. چۆن دەبێت ئەم بە تەنیا بیری وابکاتەوە و هیچ کەسێ پشتی نەگرێت..؟! بۆیە بەهەر شێوەیەک بوایە لە بیر خۆی دەبردەوە.. کەچی ئەوەندەی نەدەزانی وا جارێکی تریش هاتۆتەوە سەر باوەڕەکانی خۆی.. هەندێ جار دەیویست بە هاوڕێکانی بڵێت، کە ئەم بیر کردنەوەیەکی جیاوازی هەیە، بەڵام لەوە دەترسا گاڵتەی پێبکەن.. یان بە باوکی بڵێن... کاتی خۆیشی، کە تەمەنی چوار پێنج ساڵان بوو شێخێکی زۆر گەورە دیبووی، بە باوکی وتبوو:

ــ ئەم منداڵەی تۆ ئەقڵی زۆر لە تەمەنی گەورەترە .

باوکی زۆر دڵی بەو قسەیەی شێخ خۆش دەبێت.. هەر خێرا پەلاماری دەستی دەدا و ماچی دەکات.. کەچی شێخ بە قسەیەکی تر ترسێکی گەورەی خستبووە دڵییەوە.. پێی وتبوو:

ــ بەڵام ئەمە شتێکی باش نییە.. ئەگەر زۆر ئاگات لێی نەبێت و چاودێریی نەکەیت، ڕەنگە بەلاڕێدا بچێت.

ئەم قسەیەی شێخ لە هەموو گەڕەگدا بڵاوبۆوە.. ئەمیش بە هەندێ هەڵسوکەوت و بە هەندێ شت، کە ئەقڵی پیادا دەشکا، ئەوەندەی تر وایلێکردبوون، باوەڕ بە قسەی شێخ بکەن.. کاتێ لەگەڵ دایکی و ژنانی گەڕەک دەچوو بۆ حەمامی دەرەوە، سەرنجی لە ژنان دەدا.. ئەوانیش هەستیان دەکرد ئەم سەرنجدانە هی منداڵ نییە.. کاتێکیش دەهاتەوە چی دیبوو، وەکو خۆی بەبێ زیاد و کەم بۆ پیاوانی گەڕەکی دەگێڕایەوە... ژنان لە شەرما تەریقدەبوونەوە و بە هەردوو دەست چاوی خۆیان دەگرت.. باوکیان ئاگادارکردەوە و تەمێی کرد. ئیتر لەوەوە لەگەڵ خۆیان نەبرد... ئەمجارە فێری ئەوەبوو جلوبەرگی باوکی لەبەردەکرد و دەهاتە دەرەوە.. هەر ئەوەندەیان دەزانی مرادخانیەکەی بەسەر جلەکانی خۆیدا دەهێنا و پشتێنەکەشی لەسەر دەبەست.. کڵاو و جامانە لە سەر و پێڵاوی گەورە لە پێ و تەزبێحی درێژ

بەدەست.. شتێکی سەیر و سەمەرەی لێ دەردەچوو.. خەڵکی گەڕەک پێی پێدەکەنین و قاقایان لێدەدا.. تاکە کەسێ پێکەنینی پێی نەهاتایە، باوکی بوو.. کاتێ ئاوا دەیدی، دەترسا.. لای خۆیەوە هەزار و یەک مانای بۆ لێکدەدایەوە... ڕۆژێکیان کە ئاوا بینی، شێت و هاربوو.. گرتی و ڕووتی کردەوە.. بردی بۆ مووبەق و پشتی دەستی داخکرد.

ئەوەی سەیربوو لەودا، ئەوەبوو هەر شتێکی نابەجێ کە دەیکرد، تا ئەو کاتە لەسەری بەردەوام دەبوو، کە باوکی دارکاریی دەکرد.. ئیتر لەوەوە ببڕای ببڕای بەلایدا نەدەچۆوە، بەڵام خووی بە شتێکی ترەوە دەگرت.. تاکە شتێ باوکی نەیدەتوانی تیایدا بیگۆڕێت، ئەو ڕقەی بوو بەرامبەر بە کتێبەکانی. ئەگەر «دادە سۆزرەت» نەدەبوو، ئێستا دەمێک بوو چاوی لەم دنیایە ئاوا بووبوو.. ئەو نەبوایە خرابووە تەنوورەوە و گۆشت و ئێسقانی برژاوی دەرخواردی سەگە بەرەڵلاکانی شار درابوو...

ئێستا پڕبەدڵ پەشیمانە، کە خۆی نەداوەتە دەست باوکی... نەفرەت لەو ڕۆژە دەکات، کە «دادە سۆزرەت»ی ناسیوە.. چەند چرکەیەکی ناو تەنوورەکەی باوکی، نەک سەرمای ئەم تەمووزە.. هاکە تۆفانیش هات و ورد و درشت و بەرز و نزمی نقوومکرد.. ئەوەتا هەورە ڕەشەکان تا دێت لە بەرچاوی ڕەشتر دەردەکەون.. تاریکی و سەرما دوو شتی ترسناکن.. «نیتشە»ی فەیلەسووفی بیردەخەنەوە.. ئەویش ساڵگارێ پێش شێتبوونی، لە دەست تاریکی و سەرما داوبێدادی بوو.. سەرمای توندوتیژی ئەڵمانیا پرستی لێ بڕیبوو.. بۆ چەند چرکەیەکی بەر هەتاوی گەرم سوێی بووبۆوە.. دەیان شاخ و کێوی بڕی هەر بۆ ئەوەی بگاتە ئەو ناوچانەی مرۆڤ تیایاندا هەست بەئازاری جەستە ناکات.. هەرکە گەرمی دەبۆوە، هەستی دەکرد لە ئاوەزی جەرمانی ڕەق و تەق و لە کۆت و زنجیر و ئاکارەکانی کریستیانی، بۆ هەتاهەتایە ڕزگاری بووە.. هەر ئەو کاتە هەستی دەکرد «زەردەشت پێغەمبەر» چاوی هەڵێناوە و هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵیدا ڕێدەکات.. «زەردەشت» لە ڕەنگی شینی ئاسمان و بێگەردیی هەوادا چاوی هەڵهێنا، نەک لە میانەی شیکردنەوە و سەلماندنەکان. «نیتشە»ی سەرمابردەڵە لەتاو سەرما «زەردەشت»ی خوڵقاند.. ئارەزووی

گەیشتن بە هەتاوی گەرموگوڕی ڕۆژهەڵات پاڵی پێوەنا گیانی بەبەردابکات.. «نیتشە» نەیدەویست چاوەکانی بنووقێنێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە، ئەگەر لە توانایدا بووایە دەگۆڕا بۆ چاوێک، کە بتوانێت ئەو چرکە گەرموگوڕانەی ورد و باریک تیادا بپارێزێت... ئێستا وا ئەو ئوتێلەی شاری «ڕاپالۆ»ی دێتە بەرچاو، کە «نیتشە» ژوورێکی گەرمی تیادا بەکرێ گرتبوو.. تارمەی ژوورەکەی دەیڕوانییە سەر دەریا.. ئەو ئاگرەی ژوورەکەی گەرم دەکردەوە، هەموو شەوێ وەهمێکی کەم گەرمایی پێدەبەخشی.. شەوان لەناو پێخەفەکەیەوە گوێی لە شەپۆلەکان دەبوو.. شەوی بێ ئەستێرە.. بێ مانگ.. تاک و تەنیا، خەوی بە بەرزاییەکانی مەکسیک و بە ڕووناکی و بە کەشەکەیەوە دەبینی.. ئەوانەی، کە دەتوانن تەندرووستیە لە دەستچووەکەی بۆ بگەڕێننەوە.. هەموو ڕۆژیکیش، کە دەڕۆیی بە ئاواتی ئەوەبوو توانای خەوتنی باشتری بگەڕێنێتەوە.. ئەگەرچی خەو زۆر لەو دوورە، بۆی نایە.. ئەوسا چەند دڵۆپێ «کلۆڕال» دەکاتە کووپێکەوە و بەهێمنی لەودیو هەستەکانییەوە نقووم دەبێت.... سرووشتیش وەکو ئەم چاوەڕێی هەتاو دەکات تا ببوژێتەوە.. ئەو دارسنەوبەرانەی لە سەر گردەکان رووان، لە ئاسماندا شێوەی ڕەشیان کێشاوە.. درەختی زەیتوونیش وێنەی باران خۆڵەمێشی خۆیان دەنوێنن.. تاک و تەنیا خێرا خێرا هەنگاو دەنێت.. ئەگەرچی قوڕو لیتە لە هەندێ شوێندا، زەوییان کردۆتە زەنەک، بەڵام ئەم ناوەستێت... هەموو شتێ تێهەڵکێشی دیمەنێکی خۆڵەمێشی بووە.. درەختەکان، ناوەکانیان گومکردووە.. سنەوبەر و رەندە و ئەرۆکارسە، هەر هەموویان وەکو یەک بە سەوزێکی مەیلەوڕەش دەردەکەون.. سەرەڕای ئەمەش باران خۆشی دەکاتەوە و ڕۆیشتن ئاسان دەبێت.. هەتا هەواش گەرمتربێت، جەستە زیاتر هەست بەخۆشی دەکات.... ئەم هەر دەڕوات و هەر دەڕوات.. بێجگە لە هەراو زەنای شەپۆلەکانیش، کە بەر تاوێرەبەردەکان دەکەون هیچ دەنگێکی تر نییە.. ئەمیش حەز بەوە ناکات، چونکە شەوە درێژ و بەدەکانی بیردەخەنەوە.. (٤)

ئێستا دەزانێت بۆچی «نیتشە» لە سەرما و لە تاریکی دەترسا.. ئێستا دەزانێت پیاوە گەورە و ئازاکان ئەوانەن، کە لە سەرما و لە تاریکی دەترسن.

هەورەکانیش تا دێت ڕەشتر و ڕەشتر لە بەرچاوی دەردەکەون. ئێستا ئاسمان لەو یەک دوو ڕیزە ڕەشماڵە دەچێت، کە قەرەجەکان لە قەراغ شار هەڵیاندابوون.. شەوانی منداڵیی بیر دەخەنەوە، کە هەر جارێ پێش نووستن بۆ شتێ ورکی بگرتایە، باوکی بەو قەرەجانە دەیترساند.. ئەم لە قەرەج دەترسا، کەچی ژنەقەرەجێکی «ئەجیج» ناویش ناوکی بڕیوە و ساڵونیوێکیش شیری داوەتێ.. دەڵێن دایکی حەوت ساڵ منداڵی نەبووە.. باوکی هەموو ڕۆژێ سەرزەنشتی کردووە و چینێکی لێداوە.. لەبەر جوانیەکەشی دەستبەرداری نەبووە، تا وەکو هەر پیاوێکی تر ئەم نا ئەوی پێبکات. ئەویش دەستەودامێنی پیاوچاک و سەید و مەلاکان بووە، بەشکو دووعای بۆ بکەن و لە جەور و ستەمی مێرد ڕزگاریکەن، بەڵام هیچیان بۆ نەکراوە.. شەوێک لە شەوە تاریک و نووتەکەکانی زستان، دایکی بەتەنیا لە ماڵ دەبێت و لە ترسا خەوی لێناکەوێت.. لەناو پێخەفەکەیدا، خۆی گرمۆڵە کردووە و هەڵدەلەرزێت.. ئەوەندە نازانێت چقوهووڕێ لە دەرگاوە دێت و یەکێ خۆی بە ژووردادەکات.. ئەم هەر ئەوەندەی ئاگا لێیە، ئیتر دەبووریتەوە و هۆشی لە دنیا نامێنێت.. کاتێ چاودەکاتەوە، وا ژنێ لە لای سەریەوە دانیشتووە.. ژنە بە قسەیەک ئەو هەموو ترس و لەرزەی لە گیانی دەردەکات و وایلێدەکات دەستکات بەسەما و گۆرانی.. پێی دەڵێت: «مژدەت دەدەمێ.. ڕووناکی لە شێوەی فیلێکی سپی، چۆتە سکتەوە.. کوڕێکت دەبێت لە هەموو دنیا دەناسرێت.. ئەو کاتەی ئەو لە دایکدەبێت، خۆشی و بەختیاری هەموو دنیا دەگرێتەوە.. لە هەموو لایەکەوە مۆسیقا دەژەنرێت.. گوڵ و گوڵزار زەوی دادەپۆشێت.. ڕووبارەکان ڕەوتی خۆیان ڕادەگرن، هەر بۆئەوەی چاوەڕێی ئەو شتە بکەن، کە وا خەریکە ڕوودەدات.. دەریاچەکانیش بەگەڵای لۆتس دادەپۆشرێن»(٥).. هەر ئەمیش ناوی ناوە «جیهانگیر».. باوکی لە هەموو شتێ زیاتر دڵی پێی خۆش بووە و سوێندی خواردووە، ئیتر تا ماوە دەست لە ژنەکەی بەرزنەکاتەوە... ئەم تا ئەو ڕۆژەی پێی نەخستبووە ژوورەکەی «دادە سۆزرەت»ـەوە، ئەمەی نەزانی بوو.. ئەم پێی وت.. زۆر شتی تریشی پێ وت، کە لەمەوپێش نەیدەزانین.. ئیتر ئەوەندەی تر گومانی لە مردنی خۆی نەما و باوەڕی هێنا، کە چاو و دڵی

بەڕۆحە سەربەستەکەی ڕۆشەنبۆتەوە.. ئەوەندەی تر هەستی بە ئاسوودەیی و بەختەوەری کرد.. ئای لە جوانی ئەو ژیانەی قوتابخانە و مامۆستای تیانییە..!! وەزیفەنووسینەوە و لەبەرکردنی تیانییە..!! دەستەڵاتی باوکی تیانییە !! ئەو فنجانی قاوەیە کۆتایی بەهەموو شتێ هێنا.. هەر بۆ بەیانی پێش ئەوەی باوکی بە لەقە خەبەریکاتەوە و بەتەمەڵییەوە هەستێت، هەر خۆی زوو زوو و بەگورجی لە پێخەفەکەی هاتەدەرەوە.. خێرا کەلوپەلەکانی ئاخنیە جانتاکەی: دەستێ مرادخانی.. پشتێنێکی درێژ.. کڵاو و جامانەیەک.. جووتێ کڵاشی دۆمی.. تەزبێحێکی قەزوانی سەدویەک دەنکی.. ئاوێنەیەکی چکۆلە و مووکێشێ... دەرگای حەوشەی کردەوە و بەرەو ئەو ئەشکەوتەی بۆی دەستنیشانکردبوو، کەوتە ڕێ.. دەبوایە ئەو هەموو ڕێگایە بەپێ ببڕێت.. دوایی زانی نهێنی لەوەدا چییە.. هەر دەرگایە نا دەرگایەک، دەخرایە سەرپشت، ماڵەکە گەورە و بچووک دەهاتنە دەرەوە و دوای دەکەوتن.. سەرەتا هەستی پێنەکرد، بەڵام کە زۆر بوون، زانی دوای ئەو کەوتوون.. ئینجا وایزانی جەماوەرەکەین، کە چەند مانگێ لەمەوبەر چەپڵەیان بۆ لێدەدا، بۆیە پێی وتن:

ــ ناچمە دووگۆڵی.

ــ دێین.. دێین.

ــ دەچمە دەشت و دەچمە چۆڵی.

ــ دێین.. دێین.

ــ دەچمە کێوان.

ــ دێین.. دێین.

ــ بۆ ناو خێوان.

ــ دێین.. دێین.

ــ ڕێگام دوورە.

ــ دێین.. دێین.

ــ بێسنوورە.

ــ دێین.. دێین.

ــ درک لە پێتان ڕادەچێت.

ــ چەکمەی ئاسنمان لەپێیە.
ــ گورگ دەتانخوات.
ــ جلی پۆلامان لەبەرە.(٦)

لەمسەری وڵات تا ئەوسەری، هەر دەڕۆیی و دوای دەکەوتن.. نیوەی خەڵک لەگەڵیا دایانە کێو و نیوەکەی تر لە شار مانەوە.. هەر خۆی دەیزانی مەبەست لەو دوو نیوەیە چییە.. هەر خۆی حیکمەتەکەی دەزانی.. ئەوانی تر لێی بێئاگابوون.

شەڕ دەستی پێکرد.. ئەو چاتر.. چونکە چاکترین ڕێگابوو بۆ هەر کەسێ بیویستایە بە ڕۆحەکەی تری بگاتەوە.. کارەکە زۆر ئاسان بووبۆوە.. ڕۆحە پاک و چاک و کۆیلەکان دابوویانە شاخ و پیس و بەد و سەربەستەکانیش لە شار مابوونەوە... ئەو شەڕە خوێناویانەی، کە بەردەوام لە نێوانیاندا ڕووی دەدا، لەبەرئەوە نەبوو ئەوان دوژمنی یەکتربوون، بەڵکو هەڵپەی ڕۆحەکان بوو، کە دەیانویست چی زووترە بەیەکتر بگەنەوە و بەئارامی بمرن.. لەو هەموو شەڕە یەکێ نە لەملا و نە لەولا خۆی نەدزییەوە.. پیاوان بە گۆرانی و ژنان بە هەلهەلەکێشانەوە هێرشیان دەبرد.. «بەدەستەمۆیی بژی لە ژیان، بەدەستەمۆیی بمرە لە مردن»(٧)یان کردبووە درووشم و لە کاتی پەلاماردانا تێکڕا تا هێزیان تیابوو دەیانوتەوە.. هیچ ئاینێکی تر ئاوا بەئاسانی بڵاونەبۆتەوە.. بەبێ ئەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان لای نزیکترین هاوڕێکانی خۆیشی شتێکی لە بارەیەوە درکاندبێت، یان دابێتی بەگوێچکەی کەسێکدا، بڵاویش بۆوە.. هەر هەموویان بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەن، هاتبوونە سەر ئایینەکەی و خوێنیان بۆ دەڕشت.. تاکە ئاین بوو پێویستی بە نووسینەوە نەبێت.. پێویستی بە شمشێر و ڕم و تیروکەوان و قەڵغان و کوتەک و هایووهوو نەبێت.. پێویستی بە تۆقاندن و بەڵگە و بورهان و شێر و ڕێوی هێنانەوە نەبێت.. کەس دوژمنی کەس نەبوو.. نهێنییەکە لەوەدابوو هەردوو بەرەکە، بەرەی شار و بەرەی شاخ سەر بەیەک ئاین بوون. شەڕ شەڕی نێوان بروادار و بێبڕوا نەبوو.. شەڕی چی..؟! کوا شەڕ بوو..!! ئاهەنگ و شایلۆغانی بەیەکگەیشتنەوەی ڕۆحەکان بوو... هیچ کەسێ بۆی نەبوو لە خۆیەوە، بەبێ

فـەرمـانی سـەرۆک بچـێتـە شـەڕ، چونکە هەر خـۆی دەیزانی کـەی ڕۆحـەکـان دەکـەونـە بەرامـبـەر یەکـتـر.. هەمـووی لـە فنجـانـی قـاوەکـەی دەسـتـی «دادە سـۆزرەت»دا ڕێکخـرابوو.. ئەگـەرچی سـەرۆک هەندێ جـار تەواو پێی پەست دەبوو، چونکـە قـوتـابخـانـەی بیـردەکـەوتەوە.. ئەو پرسـیـار و وەڵامـانـەی بیـردەکـەوتەوە، کـە لە تـاقـیـکردنەوەکـان، لە شـێـوەی دوو بڕگـەی بەرامـبـەر بەیەکتر؛ بەنارێکی ڕیز کرابوون و دەبوایە ڕێکیانخات، بەڵام سەرپێچیشی لێ نەدەکـرد.. ئەوانەی سـەرپێـچـیـان دەکـرد و بە دزییـەوە، دەچوون بۆ شـەڕ؛ لە شـەڕگـەدا تاکی خـۆیان نـەدەدۆزییـەوە، لەوسـەر بە زیندوویی و بە ڕووڕەشی دەهـاتنـەوە.. دارودەسـتـەکـەیشی، کـە هـاوڕێی منـداڵیی و کـوڕی گـەڕەکـەکـەی بوون، نەدەبوایە بچن بۆ شەڕ.. خۆشی ئەمەی پێ باشبوو.. سەبووری پیایاندا دەهـاتەوە.. پڕبـەدڵ حـەزی دەکرد ئـەوانیش بەنەمری بمێننەوە و تا مـاوە وەکو سـەردەمی منداڵیی یارییـان لـەگـەڵدا بکـات.. حـەزی دەکـرد ئـەو یارییـانەیان لەگـەڵدا بکات، کـە تـا منداڵ بـوو باوکی قـەدەغـەی کـردبـوون.. هەر زوو زوو تۆپـتـۆپێن و هەڵمـاتێن و بازبـازێن و هـەلووکـێـن و هەتـەکـەوگـۆتەکـە و ئاشـەبـەتەنوورێ و هەنگەشـەلێ و یاریی تریان دەکـرد.. هەسـتی دەکـرد ژیانی منداڵیی بەو شێوەیە بۆ گەڕاوەتەوە، کە خۆی حەزی لێیدەکرد.. دوور لە چاوی باوکی و مـامـۆسـتـاکانی.. دوور لە کتێب و دەفتـەرەکانی.. ئاسـوودە و بێخـەم یاریی خـۆی دەکـرد.. بۆ کـەس وا ڕێکنەکـەوتبـوو دوای ئەو هـەمـوو سـاڵە، جـارێکی تر بگەڕێتـەوە سـەردەمی منداڵیی و لـەگەڵ هـاوڕێکانی منـاڵیی بژی.. شوێن هـەر شوێنی جاران و کات هـەر کاتی جاران بێت.. گاڵتەی لە قسەی ئەو پیـاوە دەهـات، کـە جـارێکیـان وتبـووی: «بێـهـوودەیە گـەڕانـەوەمـان بـۆ ئەو شـوێنانەی، کـە ڕۆژێک لە ڕۆژان خـۆشـمـانویستـوون.. هەرگـیـز جارێکی تر نایانبینینەوە، چونکە وەکو خۆیان لەشـوێندا نەماون و چوونەتە کاتەوە»..(٨).
مـردنی دادە سـۆزرەت و هـاتنی ئەو هەورە ڕەش ڕەشـانە کۆتاییـان بەهـەمـوو شـتـێ هـێنا.. ئەوەتا ئـەوانیش چەند ڕۆژە خـەمـبـار و نیگەران، دەڵێی بەسـەر دنیـاوە نین، لە بـەر ئەو دەرگـایە وەسـتـاون.. هاکـە لافـاو هات و باوبۆڕان هەڵیکرد.. ها ئێستا نا ساتێکی تر مەملەکەتەکەی نغرۆ دەبێت.....

ــ قاوەکەت بخۆرەوە.. بیر لە چی دەکەیتەوە..؟!

«ڤیان»ی خێزانی بوو بەم پرسیارە ڕایچڵەکاند.. لەپێشدا سەیری مێزەکەی بەردەمی خۆی دەکات.. لەمەلا فنجانی قاوەکە بەپڕی و لەولاتر ڕادیۆ بچکۆلەکە، دەنگێکی لێ بەرزدەبێتەوە و هیچی لێ تێناگات.. ئینجا لە دیوارەکەی بەرامبەری ڕادەمێنێت و لە وێنەکەی باوکی ورددەبێتەوە.. سووک سووک سەرنجی دەگوێزێتەوە سەر وێنە ڕەشوسپییەکەی سەردەمی منداڵیی خۆی، کە لەگەڵ چوار پێنج منداڵی تری دراوسێیان گرتوویانە.. دواجار لە پەنجەرەکەوە سەیری ئاسمان دەکات.. هەورەکان کۆمەڵێ ژنی ڕەشپۆشی گەڕەکەکەین.. هەر دەڵێی لە پرسەدا کۆبوونەتەوە و سنگدەکوتن.. ڕەنگە ئەمە فرمێسکی ئەوان بێت ساڵ دوانزدەی مانگ دەڕژێتە سەر خاکی ئەم وڵاتە دوورەدەست و شێدارەوە:

ــ جیهان.. چییتە ئەمڕۆ..؟! دەخێراکە قاوەکەت بخۆرەوە.. ناچییت بۆ قوتابخانە..؟!

ــ نەخێر، ناچم.. ئیتر نە قاوە دەخۆمەوە و نە دەشچم بۆ قوتابخانە.

هەستی کرد بیرۆکەی ئەو چیرۆکەی چەند ڕۆژە لە خەیاڵیدا گینگڵ دەدات، کاتی نووسینی هاتووە.

ئەڵمانیا ــ ژانیوەری ١٩٩٣

---

(١) وتەی زەردەشت پێغەمبەرە.

(٢) دوو چێشتی ناخۆشن، ماڵە هەژارەکانی شاری هەولێر دەیخۆن.

(٣) ئەسکەندەر قولی، منداڵێکی موعجیزەی جیهانی وەرزش بوو. لە سەرەتای ساڵانی حەفتادا سەرنجی هەموو شاری هەولێری ڕاکێشابوو، دواییش وازیهێنا.

(٤)بەشێکی کورتە لە پەخشانێکی خاتوو « بیاتریس کۆمۆنجی»، کە بە ناونیشانی «نیتشە و ڕووناکی»، بە زمانێکی شیعریی زۆر ناسک باسی ساڵە ڕووناکییەکانی نیتشە دەکات.. بەدەسکارییەکی زۆر کەمەوە وەرگیراوە.

(٥ ) خەونی دایکی «بووزا»یە، کە بووزیەکان بە پێغەمبەری خۆیانی دەزانن..

گوایە دایکی «بووزا» پێش ئەوەی سکی بەبووزاوە هەبێت، ئەم خەونەی دیوە.

(٦) سوود لە یارییەکی فۆلکلۆریی منداڵانی شاری هەولێر وەرگیراوە.

(٧) هەڵگێڕانەوەی پوختەی فەلسەفەکەی کامۆیە: «بەشۆڕشگێڕی بژی لە ژیان، بەشۆڕشگێڕی بمرە لە مردن».

(٨ ) وتەیەکی «مارسێل پرۆست»ی نووسەری ڕۆمانی بەناوبانگی «گەڕان بە دوای کاتی ونبوودا»یە.

# ئەستێرە

ئەوە خۆ قسەکانی «سازگار» بوون بە ڕاست..!!

ئێستا هۆڵی تاقیکردنەوە لە تۆو «تارا» و ژنە چاودێرەکە زیاتر کەسی تیا نەماوە.. تەنانەت تەمەڵترین قوتابیی پۆلەکەشتان، ئەوەی لە هیچ وانەیەکدا پەنجای لە سەددا نەهێناوە، تاوێ لەمەوبەر بەدڵساردی دەفتەرەکەی خستە سەر مێزە درێژەکەی بەردەمی چاودێر و هۆڵەکەی جێهێشت.

ئەمڕۆ هۆڵی تاقیکردنەوە زووتر لە ڕۆژان چۆڵ بوو، چونکە لە لایەک پرسیارەکان ئاسان بوون، لەلایەکی تریش قوتابییەکان پەلەی ئەوەیان بوو چی زووترە تەواوییکەن، تا فریای پاسەکان بکەون و بگەڕێنەوە شاری خۆیان.

سەر هەڵدەبڕیت و چاو دەبڕیتە چاوی کاتژمێرەکەی لای سەرووی تەختەڕەشەکە.. تەنها بیست دەقەت بە دەستەوە ماوە. جارێکی تریش دەفتەرەکەی بەردەمت پەڕەپەڕە دەکەیت.. چۆنت وەرگرتووە هەروایە، ئەوەنەبێت لەسەر لاپەڕەی یەکەمی چوار پیتی «ت.. ا.. ر.. ا»ت بەگەورەیی و جیا لە یەکتر نووسیوە. ئەمانە ئەو چوار پیتەن، کە تۆ هەرگیز ناوێریت لە ئاستی خاوەنەکەیدا بەسەریەکەوە بیاندرکێنێت.. خۆ وەنەبێت خاوەنەکەی ئەوەندە کەسێکی ترسناک بێت.. نەخێر، بەپێچەوانەوە.. تا بڵێی ڕووخۆش.. چەند بڵێی ئێسکسووکە.. لەو کچانەیە کە بەیەکەم بینین دەچێتە دڵەوە.. تۆ هەر یەکەمجار بینیت، خۆشتویست.. خۆشتویست و لێی ترسایت.. ئەو دڵەی تۆ ئاوا سەیرە، ترس و خۆشەویستیی بەجارێ تیا دەڕوێت.. یەک دووساڵیشە ئاوات لێهاتووە، دەنا وا نەبوویت.. کەی جاران ئاوا لە ئافرەت دەترسایت..!! دەشێت ئەویش وەکو تۆ ترسنۆک بێت، بۆیە تا ئێستا نەیوێراوە لێت نزیک بکەوێتەوە، ئەگەرچی حەزی دنیاشی لێتە.. بەڵام نا.. ئەو لە تۆ ئازاترە.. ئەگەر قسەکانی «سازگار»ی خوشکی «ڕێبوار»ی هاوڕێت ڕاستبن، ئەوا زۆر لە تۆ

ئازاترە.

بەترســەوە ســەر هەڵدەبڕیت و بە دزییــەوە ســەرنجی دەدەیت.. تەنهــا یەک کــورسی لە تۆوە دوورە.. ئەوەتا ورد ورد بـە دەفــتــەرەکــەیدا دەچێــتــەوە.. ســەرنجـیت داوە هەمــوو ڕۆژێ لـەبیــست دەقــەی یەکــەمــدا، وەڵامـی تەواوی پرسیـارەکان دەداتەوە و دەچێتـە دەرەوە.. چی قوتابیی پۆلەکەشـتان هەن دوای تەواوبوون دەچـن بۆ لای ئەو.. بەخـتـەوەر ئەو کەسـەیە وەڵامـەکـانی وەکـو هی ئەوبن.. ئەی باشــە ئەمــڕۆ بۆچی ناچێـتــە دەرەوە..؟! کـەواتـە «ســازگــار» درۆناکات: «خـۆ کوشـتـمی.. ئەوە دوو سـاڵە من هەرچەند دەمــەوێت خـۆمی لێ نزیک بکەمـــەوە، ئەو هەر خـــۆیم لـێ دوور دەخـــاتەوە.. بەچـی دەنازێت..؟! بە جـوانییـەکەی..؟! بۆچی من کەم جـوانم..؟! دەیان کـوڕ.. کوڕی زۆر قـۆزیش ئەم دوو سـاڵە پێیان وتم و ئەم و ئەویان بەگژدا کردم، دەسـتم بەڕووی هەموویانەوە نا.. تەواو لە وزەمدا نەمـا.. هەر بەیانییم بە دەسـتەوەمـاوە.. ناهێڵم لە دەسـتم دەربچێت.. بۆ هـەر کوێ بچێت بە دوایەوەم».

دوورنییە هـەر بەئەنقەسـتیش ئەم قسانـەی لای «سازگـار» کردبێت، چونکە دەزانێت لەوێشـەوە دەگاتە لای تۆ.. دیارە نیـازی وایە شـەڕێکی دەسـتەویەخەت لەگەڵدا بکـات.. جـا تۆ چۆن دەچیتـە شـەڕێکەوە، کـە سـوور بزانیت دۆڕاویت.. چاکترین ڕێگاش بۆ خـۆپاراسـتنت لەم جۆرە شـەڕانە ڕاکردنە.. چۆن جـارێکی تر خۆت دەکەیت بە گاڵتەجاڕی ئافرەت.. تەواو ئیتر تۆ لە ماڵی خۆت، ئەوان لە مـاڵی خـۆیان.. خـوا دەکات ئەمـجـارەش سـەلامـەت دەردەچیت، جـارێکی تر چی دەتباتە شوێنێ ئافرەتی لێبێت..!! هـەر ئەمجارە و ئیتر تەواو.

ســەر دادەخـەیت.. پـەنجـەکـانت یەکـە بەیەکـە دەتەقـێنیـتەوە.. خـووت پێـوە گـرتووە، هـەر کـاتـێ بیـر لە شـتـێکی ترسـناک بکەیتـەوە، دەکـەویتـە وێزەیان: «دامـاوە بە دەردم نازانێت.. هـەر نەشـیـزانێت چاکـە.. چۆن خـۆمـی لە دەست دەربازکەم..؟! چۆنە هـەر ئێسـتا دەفتـەرەکەم بخـەمە سـەر مێزەکە و بەخـێرایی هۆڵەکـە جـێـبـهـێـڵم.. خـراپ نیـیـە.. هـەر ئەوەندە قـاچـم خـسـتـە دەرەوە، بە ڕاڕەوەکەدا ڕادەکـەم.. تا سـەر شەقـامـەکە ناوەسـتم.. لەوێ خـێرا تاکسییـەک فـریام دەکەوێت. زۆر چاکە وا دەکـەم، بەڵام دەترسم بە دوامـدا بێت. بە دوامـدا

بێت و بانگم بگات.. جا بێنە بەرچاوی خۆت لەبەرچاوی ئەو هەموو خەڵکە ڕێم پێبگرێت.. ئەوکاتە ئەوەندەی تر خەڵک پێم دەزانن.. دەی باشە چی بکەم..؟! خۆ نابێت ڕێک و ڕەوان پێی بڵێم من..... نا نا نەکەی..!! ئەوە شتێ نییە کەس بیزانێت.. بووزم پێوە دەکەن .. تووشی چی بووم..!! ئاخر باجەخان کەی خۆشەویستی ئاوا دەبێت.. تۆ نازانیت من لە خۆشەویستیی ئێوە تەمێ بووم و بۆ هەتا هەتایە تۆبەم کردووە.. مەبەستم خۆشەویستیی بەئاشکرایە ها، دەنا بەدزییەوە هەر دەیکەم. من بۆ خۆم ئەو شێوە خۆشەویستییەم داهێناوە و وازی لێناهێنم.. ئەوە بۆ من لە هەموو شتێ چاکترە.. ماڵی بێددانە.. کەس بە عەیب و عارم نازانێت.. من فێری ئەوە بووم هەر ئافرەتێکم خۆش بوێت، دەیدزم.. هەر بەبێ ئەوەی کەسیش پێی بزانێت دەیدزم.. هەروەکو لەگەڵ تۆشدا وامکرد.. یەکەم ڕۆژ بوو هاتبووینە پۆلەوە.. هێشتا کەس کەسی نەدەناسی.. هەر یەکەی لە شارێ هاتبوو.. تۆ لە پێشی پێشەوە دانیشتبوویت.. بە تۆقەیەکی سوور ئەو قژە درێژ و خاوەت لە دواوە بەستبوو.. تەنکەسووراوێکی جوانیشت کردبوو.. من تۆم هەر نەدیبوو.. خۆ ڕەنگە بەرچاوم کەوتبێتیت، بەڵام سەرنجم نەدابیت.. دەزانی کەی سەرنجت ڕاکێشام..؟! دەزانی کەی ئەو دڵە سست و بێدەنگەی من، کە هەر لە پیانۆیەکی شکاو و لاتەریک دەچوو، هاتی و پەنجە ناسک و شلەکانت خستە سەری و دەیان دەنگت لێ پەیداکرد..؟! کە دکتۆر «خەلیل» لێی پرسیت ناوت چییە..؟ ئەرێ ئەوە چۆنت وت..؟! ناوەکەت خۆی خۆشە، یان تۆ دەزانیت وا بەناسکی و بەو نەغمە بەسۆزەوە بیڵێیت..!! من کەسم نەدیوە ئەو چوار پیتە وەکو تۆ بەسەریەکەوە بدرکێنێت.. حەز دەکەم پێت بڵێم ئەو کاتە دەمت کتومت لە هێلانەی سەر درەختێکی سەوز دەچوو.. چوار پیتەکەش چوار کەناریی ڕۆحسووک بوون، یەک بە دوای یەک لێی هاتنە دەرەوە و لە شەقەی باڵیان دا.. دەزانی لە کوێ نیشتنەوە.. نایزانی وانییە..؟! خۆشم حەزناکەم بیزانیت.. بەڵام ئەوە بزانە لەو ڕۆژەوە زمانت لە ئاستی ئەو چوار پیتەدا لاڵ کردووم.. مەگەر هەر بەدزییەوە لەسەر لاپەرەی کتێب و دەفتەرەکانمی بنووسم.. دوای ئەوەی تێر تێر سەیریان دەکەم ، ئینجا بە قەڵەم لە هەموو

لایەکەوە هێڵیان بەسەردا دەهێنم.. ئیتر شتی سەیر سەیریان لێ دەخوڵقێت.. هاوڕێکانم گاڵتەم پێئەکەن، بە شێتم ئەزانن، کە ئەو شەڕەپشیلەیە بەسەر کتێب و دەفتەرەکانمەوە دەبینن... حەیفە ئەم دەستانەی من ئەوەندە دڵڕەق و ئاوا بزێون، وا لەو ناوەی تۆ دەکەن.. ئەوەش بزانە من خۆم فەرمانیان پێدەکەم، ئەگینا ئەوانیش حەزناکەن.. منیش ناهەقم نییە وابکەم.. دەترسم هاوڕێکانم پێی بزانن.. چاکتریش وایە بڵێم دەترسم تۆ پێی بزانیت. لە کارەساتی خۆشەویستی دەترسم.. دە ئاخر هەر لەبەرئەوەش بوو پەنام بۆ دزینت برد.. ناچاریش بووم بتدزم.. تۆ خۆشت واتلێکردم بتدزم، ئەگینا من کەی بیرم لە دزینی تۆ کردبووەوە..!! گوناهی خۆتە دوو ساڵە لەو ژوورە تەنگ و تاریکە زیندانم کردوویت.. من پێم وتبوویت ئەو چوار پیتە ئاوا بڵێیت..؟! دەزانی بیرم کەوتەوە، هەندێ جار کە چوار پیتی ناوەکەت لەسەر دەفتەر و کتێبەکانم دەنووسم و لێیان وردەبمەوە.. ئەوەندە لێیان وردەبمەوە، تا بەرچاوم تەواو لێڵ دەبێت.. تەمێکی مەیلەوسپی دەکەوێتە سەر گلێنەی چاوم.. پیتەکان لە بەر چاومدا گەورە دەبن.. زۆر زۆر گەورە دەبن.. دەکشێن.. بە هەموو لایەکدا دەکشێن.. تا دەبن بە گۆڕ.. ڕەنگە باوەڕنەکەیت پیت ببێت بە گۆڕ.. با من پێت بڵێم چۆن.. لەپێشدا پیتی «ت» دەکشێت.. دەکشێت.. دەکشێت و ناوەڕاستەکەشی چاڵ دەبێت.. دەبێت بە گۆڕ و لەناویدا ڕادەکشێم.. دوو خاڵەکەی سەریشی دەبن بە دوو بەردی گەورە.. گەورەتر دەبن و بەرز دەبنەوە.. لەپڕ دەیدەن بەیەکدا.. دەبن بە ملیۆنەها پارچەی بچووک بچووک و جەستەم دا دەپۆشن.. دوو ئەلفەکەش دەبن بە دوو کێلی سپی.. یەکێکیان لە لای سەرمەوە دەچەقێت و ئەوی تریان لە لای قاچم.. پیتی «ر» پشتە کۆمەکەی ڕاست دەکاتەوە.. بەدیار سەرمەوە دەبێت بە درەختێکی بەرزی گەلاسەوز.. وەکو ئەو درەختەی هێلانەی چوار کەناریەکەیان بە سەرەوە بوو.. جا چی لەوە خۆشترە من بمرم و لە ناو ئەو چوار پیتە بمنێژن..!! ئەو چوار پیتەی وایانلێکردم بتدزم.. دەسا من ئێستاش سەرم لەو ئازایەتییەی خۆم سوڕماوە.. خۆشم نازانم چۆنم توانی لە بەرچاوی دکتۆر و قوتابییەکان، بەبێ ئەوەی بهێڵم خۆشت هەستی پێ بکەیت هەڵتگرم و تەقەتت

بکەم.. چۆنم توانی ئاوا بەلێزانی بتخەمە ناولەپی دەستم و بتبەم لە ژوورەکەم جێگات بۆ بکەمەوە.. شەوانەش هەر لەناو لەپی دەستمدا دەتنوێنم.. تا نەشخەویت من ناخەوم.. کە دەشنووم هەر دڵم لای تۆیە، بۆیە تا ڕۆژ دەبێتەوە، چەند جار خەبەرم دەبێتەوە و سەیرت ئەکەم.. خۆ شەوی وا هەیە تا بەیانی بەدیارتەوە دادەنیشم.. تۆ نازانیت کەس نییە ئەوەندەی دز لە شتە دزیارییەکانی بترسێت و بەهەندیان هەڵبگرێت..!! ئەمڕۆش دوا ڕۆژمە لەم شارە.. تاوێکی تر ماڵئاوایی لە دار و بەرد و شەقام و ستوونی کارەبای دەکەم.. دەتخەمە سەر دەستم و دەتبەمەوە.. ئا.. ئا.. وا دەکەم.. پێم وتی من تاقەتی سەریەشەی خۆشەویستیی ئاشکرام نییە.. تۆ بۆ خۆت هەر وا تێبگە، کە من لووتبەرزم.. بە لووتبەرزم بزانیت چاکترە لەوەی..... ئاخ..!! بڕۆ بە هەموو خەڵک بڵێ دارا چاوشین لووتبەرزە.. چۆن دەهێڵم جارێکی تر ئێوەومانان بە عەیب و عارم بزانن.. خۆ بەوەنابێت ئێستا وا نەرم و نیانیت.. بۆ بە دەستهێنانم هەموو ڕێگایەک دەگریتە بەر، بەڵام کە زانیت ئەوەی تۆ بە دوایدا وێڵیت، لای من دەست ناکەوێت.. تووڕە دەبیت.. لێم دەتەکیتەوە.. ناتەوێت جارێکی تر چارەم ببینیتەوە.. تازە لێتان تێگەیشتم تەواو.. خۆشەویستیی ئاشکرا گۆبەندی بە دواوەیە.. سەرەتا پێم دەڵێیت، یان پێت دەڵێم: «خۆشم دەوێیت».. دەبین بە دوو خۆشەویست.. ئینجا لە پەناوپەسار دەگەڕێین، تا شێوێنێ بدۆزینەوە دوور لە چاوی پڕ لە گومانی خەڵک.. هەر بۆ ماچێ.. دەستگوشینێ.. ڕامووسینێ........ دوای ماچ و مووچ و دەستبازی شتی تریش دێت.. ئا لێرەدا پۆخڵەواتەکانم دەردەکەون.. من دانی پیادا دەنێم کەسێکی دەستەپاچە و بێدەستەڵاتم.. پیاویش کە ئاوابێت، ناچارە وەکو «وریا» بکات.. ئەو ناوی لە «هی» خۆی نابوو «خۆزگە».. جا هەرکە قسەی لەگەڵ کچەکان دەکرد پێی دەوتن: «خۆزگەم بە ئێوە».. بە هەق و ناهەق وای پێدەوتن.. لە منیش زیاتر کەس لە مەبەستی نەدەگەیشت.. جارێکیان ئەنجامی یەکێ لە تاقیکردنەوەکانمان وەرگرتبووەوە.. «شیلان» تەنها بیستی لە سەددا هێنا بوو.. وریا پێی وت:

ــ «خۆزگە» م بەخۆت.

ـــ خۆزگەی چیت بە من..؟! بیستم هێناوە.

ـــ ئەگەر دەشت هێبابێت، هەر دەڵێم «خۆزگە»م بە تۆ.

ـــ من خۆزگەم بە تۆ شەستت هێناوە.

ـــ ئەو چاتر.

«وریا» بەم قسانە مەست بووبوو.. هەر دەتوت بە ڕاستی خەریکی شتێکە.. تا هاتینە پۆلیش ئەم گفتوگۆیەی لەبەرخۆیەوە دەوت و دەوتەوە.. لێم پرسی:

ـــ دڵت ڕەحەت بوو..؟

ـــ هەر دڵم..؟!

ـــ هەتیو تۆش سەیری.. دەزانی ڕێک وەکو ئەو پیاوەم دێیتە بەرچاو، کە لە قەراغ ڕووبارەکە دانیشتبوو.. نانی لە ئاوەکە دەگوشی و دەیخوارد.. وایدەزانی نان بە ڕۆنی قازەوە دەخوات..؟!

ـــ زۆر چاکی بۆ چوویت، بەڵام من دەزانم ئەو پیاوە هەر بەڕاستی تامی گۆشتی قازی لەو ئاوە چەشتووە.

لە دڵی خۆمدا وتم: «دەشێت تۆ ڕاست بکەیت».. وردە وردە گەیشتمە ئەو باوەڕەی، کە هەرکەسە و جیهانی تایبەتیی خۆی هەیە.. جیهانی سەیر و سەمەرەش.. بەجۆرێک ئەو هەموو جیهانەی لەم جیهانە گەورەیەدا هەن لە ژمارە نایەن.. وەکو ژمارەی ئەو ئەستێرانەی، کە مرۆڤ لە شەوێکی ئەنگوستەچاو، لە دەشتێکی کاکی بە کاکییدا تێیان دەڕوانێت...».

جاران کە منداڵ بوویت زۆر هەڵە لە ئەستێرە گەیشتبوویت.. لە بیرتە ئێوارەیەکی پایز، چوار کرێکار پەیژەیەکی درێژ درێژیان هێنا و کەوتنە گۆڕینی گڵۆپە سووتاوەکانی ستوونی کارەبای گەڕەکەکەتان.. یەکێ لە کرێکارەکان بە پەیژەکەدا سەردەکەوت، گڵۆپە سووتاوەکانی دادەگرت و هی تازەی لە شوێنیان دادەنان.. ئەو ڕۆژە هەر منداڵە و گڵۆپێکی سووتاوی دەستکەوت و تێر تێر یاریتان پێکردن.. تۆ هەر ئەو کاتە بیرت لەوە دەکردەوە ئەگەر هەر ئەو کرێکارانە پەیژەیەکی درێژ درێژ درێژ بێنن، ناتوانن پیایدا سەرکەون و ئەو ئەستێرانە داگرن..؟! واتدەزانی ئەوەندەی گڵۆپێک دەبن، بۆیە حەزت دەکرد کۆمەڵێ ئەستێرەی پڕشنگدارت هەبێت، لەگەڵ «کەژاڵ»ی

پوورت لە حەوشە بچکۆلەکەتان یارییان پێ بکەن.. ئێستا کە ئەو ڕۆژانەت بیردەکەوێتەوە، پێکەنینت بە ئەقڵی جارانی خۆتدێت، بەڵام ئێستاش هەر ئەوەندەی ئەوسای منداڵی دەربارەی ئەستێرە دەزانیت.. هەر ئەوەندە دەزانی ئەستێرە و گڵۆپ وەکو یەک نین.. لە قوتابخانەش هەر فێری ئەوە بوویت پێنج پیتی «ڤی» بەیەکەوە بلکێنیت، گوایە وێنەی ئەستێرەت کێشاوە.. نەک تۆ، هیچ کەسێ نازانێت ناخی ئەو ئەستێرە دوور دوورانە چۆنن و چییان تیایە.. کەواتە ئەبێت تۆش ببیت بە ئەستێرە، ئەستێرەیەکی هەڵکشاو و لە چاوی خەڵکی سەر زەمین دوورکەویتەوە.. ئەوەندە دوورکەویتەوە بە هیچ دووربینێک نەبینرێیت.. ببێت بە ئەستێرەیەکی نێر و لە هیچ ئەستێرەیەکی مێ نزیک نەکەویتەوە.. بەتایبەتیش ئەو ئەستێرە مێیەی بەرامبەرت، کە نیازی وایە ئێستا نا ساتێکی تر خۆیت لێبدات.

ئەرێ ئەوە تۆ چیت کرد..!! خەیاڵ بۆ کوێی بردیت..؟! تۆ بیرت لە پیلانی خۆدەربازکردن دەکردەوە، چی ئەو ڕۆژگارە بەسەرچووەی منداڵییتی بیرخستیەوە..؟! چی ئەو ئەستێرانەی هێنایەوە یادت..؟! ئاخر ئەوا ئەو ئەستێرانەش ئەستێرەی سەر پێڵاوەکانی «ئەحلام»ت بیر دەخەنەوە.. دوو ساڵ لەمەوبەر ئەو جووتە پێڵاوەی لە یەکەمین دووکانی بازاڕی «سیروان» کڕی.. لەوانەیە هەر دە دوانزدە ڕۆژێ لە پێیکردبن، دوای ئەوە تا تینی تیابووبێت تووڕی هەڵدابن.. ڕەنگە ئێستا هەر پارچەشیان نەمابێت، کەچی یەک بەقەبارەی خۆیان دوو کونی خشتیان کردە دڵتەوە.. ئێستا دڵت دوو کونی لە شێوەی جووتێ پێڵاوی ژنانەی تیایە...

بزانە لە چ کاتێکدا بیرت کەوتەوە..!! ئەگەر ئەو ئەستێرانە نەبوونایە، بۆچی بیرت دەکەوتەوە... بەڵام نا.. خەتای ئەستێرە مەگرە، هەر دەبووایە بیرت بکەوتایەتەوە..!! جا کەی بۆ ساتێکیش بیرت چووە..!!.. یەکەم ڕووداوە لە ژیانتدا بیرچوونەوەی بۆ نییە.. شتێکی سەیربوو.. هەر بەڕێکەوت بەوێدا ڕۆیشتیت، ئەوەی بیرت لێ نەکردبووەوە ئەوەبوو، ژنێکی باڵابەرزی قژدرێژی لێبێتە دەرەوە و پێشت لێبگرێت. ئەوەندە بەگەرمی بەرەو رووت هات، واتزانی ناسیاوێکی خۆتە، بەڵام کە بەعەرەبی لەگەڵتدا کەوتە قسەکردن، زانیت کە

یەکەمجارە دەیبینیت، بۆیە دڵت کەوتە خورپەکردن.. داوای لێکردیت لە کڕینی جــووتێ پێــڵاو یارمــەتی بدەیت.. وا دیاربوو ئەو کــوڕە منداڵکارەی ســەر دووکانەکە عەرەبی نەدەزانی.. خۆشت نەتزانی چۆن ڕەزامەندی خۆتت پیشان دا.. هەرکاتێکت زانی وا لەناو دووکانەکەیت.. لەسەر کورسییەکە دانیشت و جـووتێ پێـڵاوی داواکـرد.. پێـڵاوەکـان دوو ئەسـتـێـرەی سـپـیی وەکـو زیویان بەســەرەوەبوو.. بەم زسـتـانە گۆرەویی لە پێدا نەبوو.. قاچەکـانی هەر دەتوت پەیکەرتاشـێکی زۆر کارامـە لە بەفر دایتاشـیون.. دەترسایت بـەهار بێت و لە بەر تینی گەرما بتـوێنەوە.. ئەوەندە بـەناسکی و بەنازەوە دەیخـسـتنە پـێـڵاو و دەریدەهێـنـان، لـەلای خـــۆتـەوە هـەزارویـەک مـــانـات بـۆ لێکدەدایـەوە... لەپڕ هەسـتـایە سـەرپێ و چەند هەنگاوێکی کـورت، وێنەی ئەکتـەرێکی لێـهـاتوو لەمـســەری دووکانەکـە تا ئـەوسـەری چوو؛ گـوایە تاقـیـیـان ئەکاتـەوە.. بەچاو پیشـانی دا، کە بە دڵـیەتی.. ڕوو بەلای تۆدا وەرگـێـڕا و سـەرنجـی دەموچاوی دای، لەگەڵـیـشـیدا بە جـووڵەیەکی سـەر، بەڵام جـووڵەیەکی دڵبزوێن، پەرچەمـە خاوەکەی لە سەرچاوە پڕ لە قەزاوبەڵاکانی لادا و پێی وتی:

ــ لەم شارەی ئێوە سەرنجی شتێکی سەیرم داوە.. ئەوە شەش مانگە لێرەم، سێ جووت پێڵاوم دڕیوە..!!

ــ بڵێم چی..!! ڕەنگە زۆر بەپێ بڕۆیت.

ــ بـەپێـڕۆیشـتـنی چی..؟! زۆر کــەم لە مــاڵەوە دەردەچم.. لـەم غـوربـەتـە کێ دەناسم تا بچم بۆ لای..!!

ــ دە کەوابێت لای ماڵەکەتان کەندوکۆسپی زۆرە.

ــ بەپێچەوانەوە لە خۆشترین شوێنی شارین.. لە خانووی ئەفسەرەکانین.

وەکــو هـەر کــوڕێکی تری ئەم ڕۆژهـەڵاتـە کــاتێ ئافـرەتێکی نەدیوونەناســە بیـاندوێنێت، یەکە بەیەکەی قسـەکانی شی دەکەنەوە، تا بزانن کامیان مـانای «حـەزم لێـتـە» یە؛ کـەوتیـتـە هەڵگێـڕووەرگـێـڕکـردنی قـسـەکـانی و لێـیـان وردبوویتەوە.. هەر بەزۆڵێتیش بوو لێت پرسی:

ــ ئەی پێش ئەو شەش مانگە لە کوێ بوویت..؟

ــ لە بەغدا.. تۆ بەغدات دیوە..؟

ــ ماڵی پوورم لەوێیە.

ــ زوو زوو ئەچیت بۆ لایان..؟

ــ سێ مانگی هاوین لەوێ بەسەر دەبەم.

ــ خۆزگەم بەخۆت.. هیچ شوێنێ لە ناو کەسوکار خۆشترنییە.. من ئەوە شەش مانگە دوورم لێیان، خەریکە بۆیان شێت دەبم.

ـــ بۆچی ئەوانت لەگەڵ نین..؟!

ـــ نەخێر، شووم کردووە ....

هەڵوێستەیەکی کرد.. لەوەدەچوو دوودڵ بێت لەوەی شتێکی تر بڵێت، کەچی هەر وتیشی:

ـــ شـووم کـردووە، بەڵام مـێـردەکـەم بەکـەمی لـە مـاڵە.. لەبەر ئیش و کـار ناپەرژێتە سەر من.

لە دڵی خۆتدا وتت: «تەواو.. ئەوەتا تا تینی تیایە هاوار دەکات: حەزم لێتە.. لە دەست خۆتی نەدەی دارا چاوشێن».. هەستاو پارەکەی دا:

ـــ هەندێ شتی تریشم لەو دووکانەی تەنیشتی پێویستە.. ئەگەر دەزانی لە ئیشەکەت دواناکەویت، لەگەڵم وەرە.

ـــ من هیچ ئیشێکم نییە.

بەجـووتـە چوون بۆ ئەوێ.. هەر خـێـرا سـوخـمـەیەکی مـەمک و مـایـۆیەکی هەڵگرت و هاتنە دەرەوە.. ئیـتـر گـومـانت لـەوەدانەمـا، کە حـەزی لێـتـە، بەڵام دەتویست هـەر بەئاشکراو بێ پێـچـوپەنا پێت بڵێت.. ئەوەی لە سـەر تۆش بوو هەر ئـەوەبوو زەمـــینـەی بۆ خـــۆشکەیت.. هەر چـەند ســـەرت هێنا و بـرد لەم پرسیارە چاکترت نەدۆزیەوە:

ـــ دەربارەی ئەو شـتـانەی وا ئێسـتـا کریت، هیچ تێبینیـەکت نەبوو، وەکو ئەوەی بۆ پێڵاوەکان هەتبوو..؟!

پێکەنـی، بەڵام چۆن پێکەنینـێ..!!.. ددانەکـانی دوو ریز گـڵـۆپی زۆر زۆر ورد بوون، لە ژێر لچ و لێوی سووری داگیرسان و پرشنگیان دا:

ـــ کوری وەکو تۆ بێشەرمم نەدیوە..!

ـــ کەچی بە شەرمن ناسراوم.

ــ بەس نەبوو شەرمنیش بوویت..؟!

ــ جا دەڵێی چی رقت لە کوڕی بێشەرم و چوختییە..؟!

هیچی نەوت، بەڵام ئەو سەیرکردنەی بارتەقای دە ساڵ بەیەکەوەبوون شتی درکاند.. هەر ئەو سەیرکردنەش بوو هەموو شتێکی بریەوە:

ــ ئەوە بۆچی زوو زوو نایەیت بۆ لام..؟! پێت بڵێم ماڵەکەمان لە کوێیە..؟!

ــ وتت لە خانووی ئەفسەرەکانین.. هەر ژمارەکەیم پێبڵێ.

ــ ژمارە هەشتاو پێنج.. دەتوانیت بیدۆزیتەوە..؟

ــ هەوڵدەدەم.

ــ بۆ ئەمشەو نایەیت..؟

ــ هەر ئەمشەو..؟!

ــ ئا هەر ئەمشەو، بەڵام درەنگ وەرە.

ــ کەی باشە..؟

ــ دوای دوانزدە هەر کاتێ بێیت خراپ نییە.

تا لای فولکەکەی ئەوسەر بەجووتە رۆیشتن.. چەند قسەیەکی تریشتان بەیەکەوەکرد.. ناوی خۆتان بەیەکتر وت.. ئەم لەوێ خێرا تاکسیەکی وەستاند، تۆش تازە عاشقی دڵ بە تیری ژنێکی نائاشنا سمراو، وردە وردە بەپێ و بە خەیاڵی پڕ لە خۆشەویستی و شەهوەت بەرەو ماڵ بوویتەوە.

ئەوە کات بۆ لە شوێنی خۆیدا وەستابوو، جووڵەی نەدەکرد..؟! ئەوە شەو بۆ نەدەهات..؟! بەپێچەوانەی شەوانی پێشوو هەر زوو بە پوورە «کەژاڵ»تت وت:

ــ جێگامان بۆ داخە خەومان دێت.

باپیرت لەولاوە هەڵیدایە:

ــ هێشتا زووە.. هەندێکی تر سەعی بکە.

باپیرت بەپێچەوانەی شەوانی تر خەوی نەدەهات.. دەتوت شتێکی زانیوە.. رادیۆ بچکۆلەکەی بە گوێچکەیەوە نابوو.. جار جاریش سەری بۆ دەلەقاندەوە.. شەو راشکا و ئەم هەر نەنووست، هەر باوێشکێکیشی نەدا.. ترست لێهات نەخەوێت و ریسەکەت لێببێتەوە بە خوری.. یادی بەخێر هەر بە دواتەوە بوو.. تۆ هەرچەند خۆت بەگەورە بزانیایە، ئەو هەر بە منداڵی دەزانیت.. خۆ

بیزانیایە ئەو شەوە کارێکی ئاوات بە دەستەوەیە، هەر بە گۆچانەکەی پشتی دەشکاندی.. ئەوجارە لە سەربان چی پێ نەکردیت..!! ئەوسا هەرزەکار بوویت و تازە فێری ئەو شتە نەفرەتلێکراوە بووبوویت.. هەر دەتوت «ئاواز»ی دراوسێتان بەراستی لەژێرتدا پاڵکەوتووە.. ئاگات لە دەوروبەری خۆت هەر نەمابوو.. ئەوەندەت نەزانی پشتت گۆچانێکی بەرکەوت و ژانی بردە دڵتەوە.. وا شپرزە بوویت فریای هەڵکێشانەوەی پانتۆڵەکەشت نەکەوتی:

ــ هەی گاوری خوانەناس.. زۆڵی لە قەحپەکەوتوو، شت نەما بیگێیت پەنجەی شایەتمانی خۆت نەبێت... ؟!

خۆت بە کتێبەکانت خەریک کردەوە، لەژێرەوەش بەردەوام سەرنجی چاوەکانیت دەدا.. چاوەڕێ بوویت فەرمانی نووستن دەرکات..... هەر چۆنێ بوو بەدەم باوێشکەوە بە پوورتی وت:

ــ ئادەی کەژاڵە جێگاکەمان بۆ داخە.

هەرکە خەوتن بەهێواشی دەرگای ژوورەوەت ترازاند، هی حەوشەش بەدوایەوە......... ئەوەی ئەو شەوە بوو بەرێگر لە بەردەم ئارامی تۆ و «ئەحلام» ئەو گۆڕستانە بوو، کە دەکەوێتە سەر ڕێگای ماڵەکەیان.. تاکە ڕێگاش بوو، هەر دەبووایە پیایدا بڕۆیشتیتایە.. ڕێگاکانی تر و بەم درەنگی شەوە هەر وازی لێبێنە.. خۆزگەت دەخواست باپیرت بێداربووبوایەوە و بە گۆچان پشتی بشکاندیتایە، بەڵام ئاوا خۆت لەو گۆڕستانەدا نەدیایە.. دوودڵ بوویت لەوەی بیبڕیت، یان بەرێی خۆتدا بگەڕێیتەوە، بەڵام جورئەتت نایە بەرخۆت: «برۆ برۆ چاوتروکانێکە و دەگەیتە لای.. دەگەیتە لای و ترسی هەموو تەمەنت بیردەباتەوە». چاوتروکانی چی..؟! خۆ ئەو ڕێگایە تەواو نەدەبوو.. دەتوانیت باسی هەموو سەربردەی ژیانت بکەیت، هی ئەو شەوە نەبێت.. خۆشت نەتدەزانی چۆن هەنگاو دەنێیت.. جار جاریش هەورەتریشقە بۆ ساتێ کێلی گۆڕەکانی بەشێوەیەک نیشان دەدایت، زۆر جیا لەوەی، کە بەرۆژ دەتدین.. ئیتر ئەوەندەی تر ڕۆحت دەچوو.. ناهەقیشت نییە لە گۆڕستان بترسیت، بەتایبەتییش ئەو گۆڕستانەی نزیک ئەو گەڕەکە ترسناکە.. ماڵتان لە قەراغ هەرجۆگە و زێ و ڕووبارێ بووایە، ئێستا چاکترین مەلەوان بوویت،

بەڵام ئەو گۆڕستانەی بەرماڵتان کردتی بە ترسنۆکترین کەس.. تا ئەو بەیانیەی جەستەی «پەری» و «زلێخا»ی نەنکیشیت تیا نەدی، ئەوەندە لێی نەدەترسایت.(*) هەرکاتێ بەلای هەر گۆرستانێکدا برۆیت، ئەو رۆژەت بیردەکەوێتەوە.. دوو سەری جیاکراوە لە دوو جەستەی خوێناوی.. کەس لە پێش تۆوە نەیدین.. لەبیرتە باپیرت چەترێکی بچکۆلەی جوانی بۆ کڕیبوویت.. ئەو شەوە هەر دووعات دەکرد بەیانی باران ببارێت.. بەیانی لە خۆشیا زوو زوو لە خەو هەستایت.. کە حەوشەکەتانت بە تەڕی بینی، لە خۆشیا خەریک بوو باڵبگریت.. هەر بەبێ ئەوەی بەرچاییش بخۆیت، جانتا بچکۆلانەکەت هەڵگرت و چەترەکەت هەڵدا.. وەکو رۆژان بەناو گۆڕستانەکەدا رۆیشتیت.. دوو سێ منداڵی کۆڵانەکەشتان بەدواتەوە.. لەپڕ قاچت بەر شتێکی نەرمۆڵە کەوت.. سەیرت کرد جەستەیەکی بێسەر بوو.. لەولاوە جەستەیەکی تر.. لەولاتر دوو سەری دیکە.. زارەترەک بوویت.. تەنانەت هاوارێکیشت بۆ نەکرا.. هەر ئەوەندەت زانی وا لە ماڵەوە پاڵیان خستوویت و نەنک و باپیرو پوورو مامەکانت بەدیار سەرتەوە وەستاون.. لە بەر چاوت دەبوون بە شتی سەیر سەیر.. هاوارت بە سەردا دەکردن:

ــ لاچن لە بەرچاوم .. ئێوە کێن..؟! .. ئەوە بۆچی هەموو گیانتان خوێناویە..؟!

ـــ خوێنی چی دارا گیان..؟! ئێمە ناناسیت..؟!

ـــ نا، ناتنناسم.. کوا کتێبەکانم..؟ کوا دارا و ئازاد..؟ کوا زارا و زەینەب و مام زۆراب..؟!

کتێبەکانیان بۆ هێنایت، لە ژێر لێفەکەتت حەشاردان.. خۆت خزاندە کونجی ژوورەوە و لێی دەرنەدەچوویت.. نەدەبوایە نەنکت بۆ دەقەیەکیش جێتبهێڵێت.. هەرچەند منداڵانی گەرەک هاتن بەشوێنتدا و بانگیان کردیت: «دارا وەرە دەرەوە.. وەرە وەرە.. دارا وەرە دەرەوە».. گوێت لێنەگرتن.. هەرچەند زیاتر بیرت لەو دوو جەستە خوێناویە دەکردەوە، زیاتر دەترسایت و چمکی لێفەکەت زیاتر رادەکێشا و دەموچاوی خۆتت پێ دادەپۆشی.. ترسی ئەوەت لێهاتبوو ئەگەر بمریت، چۆن لەو گۆڕستانە بتنێژن، مەگەر یەکێ

بەردەوام بەدیار سەرتەوە دانیشێت.. بە نەکتت دەوت:

ــ تووخوا ئەگەر مردم نەمخەنە گۆڕەوە.. نەکەن وەکو «سەفین» بمبەن لە گۆڕستان بمنێژن.

ئەمەت ئەوت و دەستیشت بۆ ئەو تاقە درێژ دەکرد، کە بۆ رووناکی کرابووە دیوارەوە.. لە دیوی دەرەوەش بە نایلۆنێکی شەفاف گیرا بوو.. ئینجا دەتوت:

ــ لە سەر ئەم تاقە دامبنێن، بەڵام ئەم نایلۆنەی بگۆڕن و بیکەن بە ئاسن.. با جنۆکە دەستیان پێم نەگات.. دەتۆ سەیرکە بۆچی دەگری..؟! نەکەن بەتەنیاش لەماڵەوە جێمبهێڵن.

تۆ دوایی زانیت ئەوانە جەستەی «پەری» و «زڵێخا»ی نەنکی بوون.. سواڵکەر هەمیشە لای خەڵک ئێسکیان قورسە، بەڵام ئەوان وا نەبوون.. کەس دەستی بە روویانەوە نەدەنا.. رەنگبێت دەنگە خۆشەکەی «پەری»، ئاوا خۆشەویستی کردبن.. ئێستاش بیرتە چۆن، کە دەنگی لێ هەڵدەبری، گەورە و بچووکی لە شوێنی خۆیدا مەست و حەیران دەکرد.. ئەو شەوە «پەری»ت بە هەردوو چاو بینی، بەڵام لە پەرییەکەی جاران نەدەچوو.. ئێسکقورس.. ناشیرین.. بە دەنگی ناسازی گۆرانییەکی ترسناکی دەچری.. مردووەکان تێکرا بۆیان دەسەندەوە.. گوێچکەی خۆشت توند توند دەگرت، هەر سوودی نەبوو.. ئای لەو شەوە ترسناکەی تۆ لەو گۆرستانە تاریکەدا بە سەرت برد..!!

دەرگالێدانەکەی ماڵی «ئەحلام»ت وەکو خەون دێتە بەر چاو.. چۆنت دۆزیبووەوە..؟! چۆن گەیشتبوویتە ئەوێ..؟! نازانیت، هەر ئەوەندە دەزانیت دەرگا ترازا و خۆت بە ژووردا کرد.. چوویت لە ژوورەکە لەسەر سیسەمەکە دانیشتیت.. ئەم تەواو خۆی ئامادەکرد بوو.. لە چاوترووکانێکدا خۆی رووتکردەوە.. تا بەپێوە بوو وەکو کێلێکی لووس و سپییت دەهاتە بەرچاو.. کەمێکی تر لە سەر ئەو بارە بمابوایەوە، هاوارت لێ بەرز دەبووەوە.. هات و لە تەنیشتتەوە دانیشت.. سەرنجت کەوتە سەر مەمکەکانی.. جووتێ کۆتر بوون، ئەملا و ئەولای سوخمەکەیان کردبووە هێلانە و تیایاندا هەڵکورمابوون.. چاوەڕێی دوو دەستی بزێو بوون لە کولانەیان دەربهێنن و دەستبازییان لەگەڵدا بکەن... دەستی هێنا و بەسووکی، بەڵام چەند بەناز کردیە ملتەوە.. تۆش زۆر

بەپەرۆشـەوە دەسـتت کردە ملی، بـەڵام لە بەرئەوە نا ئافرەتە و حەزت لێـیـەتی..
نەخێر، هـەر بۆئەوەی ترسـەکەی گیانت دەربچێت:

ــ ئەوە بۆ وا دەلەرزیت..؟!

دەستی لە ملت ترازاند و وای پێ وتی.

ــ کوا لەرزیوم..؟!

ــ ترسـی هیچ شـتـێکت نەبێت.. تا دوو رۆژی تریش ئـەم دەرگـایە کـەسـی پیادا نایەت.

ئەمـەی وت و کەوتە داکـەندنی جلەکانت.. تا تەواو رووتی نەکردیتـیەوە وازی لێ نەهـێنایت.. دەیـان جـار هێـنابووتە بـەرچاوی خـۆت چـۆن ژنێکی بـاڵابەرزی چاو پرلەئەفسوون، بانگی ماڵی خۆیانی کردوویت.. بە پەنجە نەرم و شلەکانی، کــە نینـۆکــەکــانی بە رەنگێکی ســووری تـۆخ تۆخ بـۆیەکــراون؛ جلـەکــانت دادەکـەنێت.. جـاری وا هـەبـووە لە شـوێنە گـشـتـیـیـەکـانیش بیـری ئاوات کردۆتەوە.. کاتێکیشت زانیوە وا ئەسپێکی سەرکێش لە ناوگەڵتدا دەحیلێنێت و خـۆی رادەپسکێنێت.. سـەرت هـەڵبـریوە و بەشـەرمـەوە، بەڵام بـەوریایی هـەر چوار لای خـۆتت تـاقی کـردۆتەوە.. لەوە ترسـاویت کـەسێ چاوی لێت بێت.. هەمـوو جارێکیش بۆ دامرکاندنەوەی دنیـایەک رووداوی ترسناکت بیری خـۆت خــســتــۆتـەوە.. هەر لە گـۆچانـەکــەی باپیــرتەوە تـا دارکــاریی بەرێوەبەر و مامـۆستـاکان و چـاوسوورکردنەوەی پۆلیسـەکان.. تەنـها لەم کاتانەدا هـەسـتت بەلەزەت و پێویسـتی ترس کردووە، وەکـو ژەهر دەرخواردی ئەسپـەکەتت داوە و لە پەلوپۆت خسـتووە.. نەتدەوێرا سواری ئـەسپێکی شێت و هـاروهـاج بیت، کـە سـوور بزانیت لە سـەریدا دەگلێیت و لەژێر قـاچەکانیدا دەپلیشـێیتـەوە.. ئەوە یەکەمجـار بوو بێباکانە ئاوزنگی لێدەیت.. بەختـی تۆبوو، یان هـی ئەو ژنە تەنیا و دامـاوە، ئاوا ترسـی ناو گـۆرسـتـان نسکۆی بە ئـەسپ هێنا و چوارمـێخـەی کێشـا..؟! جـەسـتـەیەکی سـاردوسـری بێگیـان.. بێـخـوێن.. بێـهـەوڵ و تەقـەلا.. تەنانـەت ئەو پەنجـە باریک و ناسـکانەش نەیانـتـوانی گـیـانی بێننـەوەبەر.. بەو بێچـووەچۆلەکانەت دەهاتە بەرچاو، کە لەسـەر هێلانەکانیان دەکـەوتنە خوارەوە

و سنگیان دەکەوتە سەر کۆنکرێتە ڕەقەکەی قوتابخانە.. هەڵتاندەگرتنەوە و فووتان دەکردە دەمیانەوە.. سوودی نەبوو.. هەر دوو سێ جار بەسستی دەنووکیان دەکردەوە ، دوای ئەوە ملیان لار دەکردەوە:

ـ ئەوە چییتە..؟!

بەچرپە وای پێ وتی.

ـ خۆشم نازانم..!!

ـ خەساویت..؟!

ـ بڵێم چی..!!

ـ بۆ پێت نەوتم، کە پیاو نیت..؟

ـ نەمدەزانی.

ـ ئەوە جووتی چوارەمیشمان هیچ.

ـ مەبەستت چییە..؟

ـ بۆ دەرەوە.

ـ بەم نیوەشەوە..؟!

ـ بۆ دەرەوە.. گوم بە لەبەرچاوم زلی بێهونەر.

ـ ئاخر خوات بێت بەم درەنگی شەوە بچم بۆ کوێ..؟

کوا درەنگی شەو بوو..؟! تۆ لە شپرزەییدا شەو و ڕۆژت لێ تێکچوو بوو، دەنا بەرەبەیانێکی زوو بوو، خەڵک تاکوتەرا لە دەرەوە دەبینران.. هەر خێرا ئەو تەکسیەت وەستاند، کە لە فولکەکەی ئەولا پێچی کردەوە.. تەکسیەکە بەرێگای قەراغ گۆڕستانەکەیدا بردیت.. هەموو گیانت دەلەرزی.. خۆت بۆ دابین نەدەکرا.. وردە وردە بەرچاوت لێڵ دەبوو.. دار و بەرد و ستوونی کارەباش چەمۆڵەیان لێ دەنایت.. مردووەکان هەستابوونە سەرپێ و تێکرا هووهایان بۆ دەکێشایت.. هاواریان دەکرد: «ناپیاو.. ناپیاو».. چەند تاقیکردنەوەیەکی قورس بوو..!! چەند ئەنجامێکی ناخۆش و ڕۆحداخکەر بوو..!! حەفتەیەک پێش ئەوە لەگەڵ «شوان»ی هاوڕێت چوویت بۆ لای دکتۆرەکە تا ئەنجامی نەخۆشیەکەی بزانن.. دەرکەوت نەخۆشیەکەی قورسە و دەمرێت، کەچی ئەوەندەی تۆ شپرزە نەبوو.. ناهەقیشت نەبوو.. «شوان» مرد و

له بیر دۆست و دوژمنیش چووەوە، بەڵام ئەوەی تۆ بیرچوونەوەی نییە.. بوو بە تیــرێکی ژەهراوی و گــوێچکەی راست و چەپی دڵی ســمــیت.. نە ئەوەتا دەتکوژێت و نە دەشهێڵێت بۆ ساتێ ئاسوودە بژیت.. ئەگەر ئەو خەوە نەبوایە، کە ئەو بەیانییەی گەرایتەوە ماڵ بینیت، ئەوا هەر ئەو رۆژە گیانت دەردەچوو.. خۆشیی خـەوەکە لەوەدا بوو هەموو شتێ بەئاسانی و دوور لە تەنگوچەڵەمە پێک دەهات.. بەم نیـوەرۆیە، لەســەر ئەو شــەقامــە گــشتــیــە، بەرووتی و لە بەرچاوی رێبواران شەرمتان نەکرد، باوەشتان بۆ یەکتر کردەوە و توند توند بەخۆتەوە نووساند.. دەمت لە سەر سنگیەوە بەرزکردەوە بۆ لای ملی، دواییش بۆ ناو دەمی.. پەنجەکانت لە ناو پاوانی قژە ئاڵتوونیەکەی بوون بە رەوەیەک ئەسپ و کەوتنە سمکۆڵکردن.. ئەو خەوە بوو وایلێکردیت بڵێیت: «شتەکان لە خەودا جوانتر دێنە بەرچاو..!!» لەپڕ دایکردە باران.. سەرەتا نم نم دەباری و دەموچاو و قژتانی ئاوپرژێن دەکرد، دوایی ورده ورده تاوی سەند.. وایلێهات نەتوانن خۆتانی لەبەر رابگرن.. دەستی «ئەحلام»ت گرت و بەجووتە راتانکرد.. لە پەنایەک دەگــەڕان خــۆتانی لــە ژێردا حــەشــاردەن.. نەبوو.. ســەرتاپای گیانتانی لە ئاوێکی خەست هەڵکێشا.. گیانتان خاو و هەنگاوتان قورس.. نەتاندەتوانی لەوە زیاتر رابکەن.. بارانیش زیاتر تەری دەکــردن.. کــاتێ بێداربوویتەوە، خێرا دەستت لە هەموو گیانی خۆت کوتا.. واتدەزانی هەر بەڕاســتی جلەکــانت تەربوون.. بەڵام نا، هەر لای پێشــەوەی بیــجامــەکــەتی گرتبووەوە.. لەژێریشیدا ئەسپەکە وەک ئەسپی سوارچاکێکی جوامێر و جەربەزە بێت و لە شەری مانونەماندا گەرابێتەوە، هەناسەبرکێی پێکەوتبوو.. لالغاوی کــەفی جــەراندبوو.. جــا هەر بەراســتــیــیش لە شــەری مــانونــەمــاندا گەرابووەوە و مژدەی سەرکەوتنێکی گەورەشی بە تۆ دەدا.. ئەو مژدەیەی تا ئێســتــاش دڵ و دەروونت فــێنک دەکــاتەوە.... ئەوەتا ئێســتــاش ئەســپــەکــە هەســتــاوەتەوە ســەرپاشــوو.. ئەحیلێنێت و خــۆی بۆ هێرشێکی تر ئامــادە کردووە:

ـــ تارا سەیری بەردەمی خۆتکە.. ئادەی دارا تۆ لەوێ لاچۆ، وەرە ئێرە.

ژنە چاودێرەکە بوو لەپڕ ئەمەی وت و بە دەستیش ئاماژەی بۆ کورسییەکەی

بەردەمی خـۆی کـرد.. راچڵـەکـیت.. رەنگت تێکچـوو.. ئەژنۆکـانت دەلەرزن.. هەسـتـان لە کـاتێکی ئاوادا بۆ تۆ ئاسـان نـیـیـە، بـەڵام هەر چۆنێکیش بوو وا هەسـتـایت.. دەفـتـەرەکـەت بەکراوەیی لێ کردۆتە پەنا.. بەڵام هی ئەوە نـیـیـە بشـاردرێتـەوە.. خێسـەت لێدەکات.. رووت لێ گرژ دەگات.. گومـانی تیـا نـیـیـە دیویەتـی.. ئەم بەهەر حـاڵ هەر باجـەخـان نەیدیبێ.. چۆنی نەدیوە..؟! ئەویش دیویەتی.. هەر ئەویش سەرنجی ئەو ژنە جانانەیەی بۆ لات راکێشا، ئەگینا بۆ پێـی دەوت سـەیری بـەردەمی خـۆتکە.. هەر چۆنێک بوو خـۆت گـەیاندە سـەر کورسـییەکە و دەفتەرەکەت بەکراوەیی خستە بەردەمت.. لەشـەرما نە چاوت بۆ هەڵدێت، نەدەشـتـوانیت بچـیـتـە دەرەوە.. ئەوا بەسـووکی سـەر هەڵدەبریت.. بەسـەر سـەرتەوە وەسـتـاوە.. کەوابێت چوار پیـتـەکـەشی دی.. لە لاسـتێکی خەتکوژاندنەوەکە دەگەرێیت، تا بیکوژێنیتەوە، نییە.. چاو بۆ قەڵەمەکە دەگێرت تا چەند هێـڵـێکی راست و چەپی بە سـەردا بێنیت، ئەویش نـیـیـە.. لە سـەر مێزەکەی ئەولات جێهێشتووە.... ئەوا کاتیش تەواو.. چاودێر دەفتەرەکەی هەر بەکراوەیی قۆزتەوە:

ـــ ئەوە هەر بۆ ئەم چوار پیتە ئەو هەموو کاتە منت داناوە..؟

هەڵدەستیت و گوێچکەی خۆتی لێ کەردەکەیت.

ـــ دەترسم دڵیشت بەوە خۆشبێت، کە پیاویت..!!

گوێی نـادەیتێ، ئەوە نەبێت لە نـاوەراستی دەرگاکـە بەشـەرمێکی تێکەڵ بە ترسـەوە ئـاوڕ دەدەیتـەوە.. ئەوەتا «تارا»ش لە شـوێنـەکـەی خـۆی ئـەبڵـەق وەسـتـاوە.. هـەر دەڵێی پـەیکەرەو دەیان سـاڵە لەو شـوێنە قـوتکراوەتەوە.. دەفـتـەرەکـەی دەسـتـیـشی ئەوەندەی تر سـیـمـای پەیکەری پێ بەخـشـیـوە.. لەوەدەچێت بیـر لە چوار پیـتـەکـەی ناوی خـۆی، یان ئەسـتـێـرەیـەکی کـشـاو بکاتەوە.

مایسی ١٩٩٣

---

* کوشـتنی ئـەو دوو مرۆڤە رووداوێکی راسـتـەقینەیە، لە بەهاری (١٩٧٠) لە گەڕەکی (سەیداوە)ی شاری هەولێردا روویداوە.

# خێو

هەر شەو دادێت سێ سێ و چوار چوار دەخزێنە ژوورێکەوە و دەرگاکان بەسەر خۆیاندا دائەخەن.. دەرگاکان تا بەیانی بۆ هیچ مەبەستێ ناکرێنەوە.. ئەگەر لەو ڕاڕەوە بەسەعاتیش گوێچکەت هەڵخەیت، دەنگێ، هاوارێ، تەنانەت تەقەی قاپ و زرینگەی پیاڵە و کەوچکیش نابیستیت.. لە ژوورەوەش هەر بە چپە قسە لەگەڵ یەکتردا دەکەن.. قسەکانیش چیین لە باسی خێوەکەی ئەو شەوە زیاتر، کە کوڕە باڵابەرزەکە دیویەتی..!!

هەریەکە و لە لایەکەوە سەرگوزشتەیەک لەسەر خێو ئدەهێنێتەوە و ئەوەندەی تر زەندەقی یەکتری پێ دەبەن.

هەمووتان دەترسن، بەڵام تۆ لە هەموویان زیاتر، کەچی نەک هەر بەسەرخۆتی ناهێنیت، بگرە واشیان پیشاندەدەیت، کە هەر لە بنەڕەتەوە باوەڕت بەبوونی خێو نییە.. پێیان دەڵێیت:

ــ خۆ منداڵ نین.. هەریەکە بیست، بیست و یەک ساڵ تەمەنتانە، لە چی دەترسن..؟! کەی سەردەمی ئەوەیە خەڵک بیر لە خێو و جنۆکە و شتی لەم بابەتە بکاتەوە..؟!

ــ وازبێنە سامان.. ئەوا زانیمان لە سوورەکانیت و باوەڕت بەم شتانە نییە، بەڵام ئێمە وەکو تۆ نین، دەترسین.

تۆ کە ئەو قسانە دەکەیت، ڕەنگیشت تەواو تێکدەچێت.. لچ و لێو و زمانت بەحاڵ دەجووڵێن.. چاوەکانت ئاوێکی سەیر، کە لە فرمێسک ناچن، پیایاندا دێنەخوارەوە، بەڵام ئەوان ئەوەندە شپرزە بوون، ئاگایان لەوە نەماوە سەرنج لە دەموچاو و قسەکانت بدەن.. ئەگەر ئەوان لە شەوی بینینی خێوەکەوە ترسان، ئەوا تۆ هەر لە یەکەم ڕۆژەوە پێت خستە ناوییەوە، ترسایت و دەیان شتی سەیر سەیریشت بە خەیاڵدا هات.. ئاخر تۆ و شوێنی وایان نەوتووە..

کۆنەکەنییسەیەکە تەمەنی سەدان ساڵە و کراوەتە بەشی ناوخۆی قوتابییان.. پشتی داوەتە ڕیزێ خانووی کۆنی پەڕپووت.. کچێکی عازەبی شێت، لەو سەربانەی تەنیشتتان جار جار سەرەتاتکێی لەگەڵدا دەکردن.. هەتا ڕۆژ بوو یارییتان لەگەڵدا دەکرد.. تاکە پێڵاو و لکەدار و پەلووکەبەردتان بۆ هەڵدەدا.. ئەویش بۆی هەڵدەدانەوە و قسەی هەلەقومەلەقی بۆ دەکردن، بەڵام کە شەو دادەهات لێی دەترسان.. دوای ئەو شەوەی ئەو کوڕە خێوەکەی دی، بەڕۆژیش نەیاندەوێرا سەیریکەن.. دەیانوت: «ئا ئەمە خێوەکەیە..!!». تۆ هەر شەوی یەکەم لە خەوێکی ترسناکدا ڕاپەریت و قوڕگت وشک بووبوو.. خەریک بوو لە تینوا دەخنکایت.. چەندی کردت و کۆشایت نەتتوانی هەستیت پەرداخێ ئاوی سارد لە ڕاڕەوەکەدا بخۆیتەوە، کەچی خۆت لە سەر ئەوان کردووە بە پاڵەوانی چیرۆکە ئەفسانەییەکان.. تۆ هەر کاتێ بەترسەوە بنوویت، خەونی ئاوا سەیر و سەمەرە و ترسناک دەبینیت.. خۆ ڕەنگە ئەم خەونانە، ئەگەر لە ڕووت بێت بۆ کەسانی تری بگێرییتەوە، پێت بڵێن: «جا ئەمە ترسەکەی لە کوێدایە..؟!»، بەڵام تۆ کە بێدار دەبیتەوە هەموو گیانت دەلەرزێت و تا بەیانی ڕۆژنەبێتەوە، ترسی ناخت دەرناچێت و خەوت لێناکەوێتەوە.. هەروەکو ئەو خەوەی ئەو شەوە دیت.. بەکرەیەکی دەزووی گەورەت بەپانی قووت دابوو.. خەریک بوو دەخنکایت.. دایکت سەری دەزووەکەی گرتبوو بە دەستەوە و ڕایدەکێشا.. ئەو هەر چەند بەخێرایی ڕایدەکێشا، بەکرەکەش ئەوەندە بەخێرایی لە هەناوتدا دەخـــولایەوە.. هەرچەندی دەتکرد هاوارێکت بۆ نەدەکـــرا.. دایکت هەر ڕایدەکێشا و دەیزریکاند، کەچی هەر کۆتایی نەدەهات.. سەرەتا لە دەستی و دواییش لە هەموو گیانی خۆی پێچا، تا شتێکی سەیری ترسناکی لێ خوڵقا.. کتومت لەو خێوە دەچوو، کە لە نیوەڕۆیەکی بەهاری چەند ساڵ لەمەوبەر هەڵیکوتایە سەر ماڵەکەتان.. لەبیرتە دایکت لەسەر کورسییەکەی ناوەڕاستی حەوشەکە و تۆش لەسەر یەکەم پایەی قادرمەکە دانیشتبوویت.. ئەم کتێبی «خوێندنەوە بۆ پۆلی دووەمی سەرەتایی»یەکەی بۆ گرتبوویت، تا بزانێت ئەو شیعرەت لەبەرکردووە، کە دەبوایە بۆ بەیانی ئامادەت بکردبایە.. ئێستاش یەکەم دێڕی شیعرەکەت بیرماوە:

ئەوەندەتان نەزانی خێویَ بەلەقە دەرگای حەوشەکەتانی خستە سەرپشت.. بەچەند هەنگاویَ خۆی گەیاندە سەر سەری دایکت و دەمانچەکەی خستە سەر سنگی.. تۆ هەر ئەوەندەت دی، ئیتر چاوت بۆ نەکرایەوە.. ئەوە یەکەمجار بوو خێو ببینیت.. لەمەوبەر نەنکت زۆری بۆ باسکردبوویت.. هەقایەتەکانی ئەو هەمووی هەر باسیان لە خێو دەکرد، بەڵام ئەو خێوەی تۆ دیت لەوانە نەدەچوو، کە ئەو باسی دەکردن.. ئەوانەی ئەو باسی دەکردن کەتەی زل، هەر دەستێکیان بەقەدەر دارەکەی بەرماڵتان و چاوەکانیان ئەوەندەی دوو تۆپی فوتبۆڵ دەبوون، کەچی ئەمەیان وانەبوو.. پیاوێکی ئاسایی بوو وەکو هەموو ئەو پیاوانەی کە ڕۆژانە دەتدین.. ئەوەنەبێت دەموچاوی خۆی پێچابوو.. هەر لەبەر ئەوەش ترسناک بوو.. ئەی بۆچی دوایی نەنکت هەر سووربوو لەسەر ئەوەی، کە خێو بوو..؟! هەر دوای ئەوە بەچەند ڕۆژێ، نەک هەر خانووەکە، شارەکەشتان جێهێشت.. نەنکت پێی وتیت، کە نابێت بە هیچ شێوەیەک خەڵک بزانن خێو هاتۆتە ماڵەکەتان، چونکە باش نییە.. هەر چەندت دەکرد نەتدەتوانی ئەو ڕووداوە بیر خۆت بەریتەوە.. نەنکیشت ڕازیی نەدەبوو لەم بارەیەوە هیچ پرسیارێکی لێبکەیت.. تەنانەت وەکو جاران هەقایەتەکانیشی باسی خێویان تیادا نەما.. هەموو جارێکیش بەدزییەوە دەگریا.. کاتێ تۆ دەتدی وا دەگری لێت دەپرسی:

ـــ نەنە بۆچی دەگری..؟!

ئەم خێرا بە چمکی فەقیانەی کراسە ڕەشەکەی، دەموچاوی دەسڕی و پێی دەوتی:

ــ لە داخی ئەم دنیایە.

بەڵام تۆ دەتزانی بۆ دایکت دەگری.. ئەم لە هەموو دنیا ئەو تاقە کچەی هەبوو، نەیدەتوانی بیری خۆی بەرێتەوە، کەچی ڕازیی نەدەبوو تۆ باسی هیچ شتێ بکەیت، کە پەیوەندیی بە دایکتەوە هەبووایە:

ــ نەنە هەقایەتی ئەو خێوەم بۆ بکە، کە کچە شوانەکە دەبات.

ــ واز لەوە بێنە.

ــ دەی باشە ئەوەیان، کە پیاوەکە چاوی بێچووەگورگەکان دەردەهێنێت.

ــ ئێ ڕۆڵە ئەوە باپیری خۆمە.. ڕۆژێکیان دەچێت بۆ ڕاو.. سواری ئەسپەکەی دەبێت وتاپڕەکەشی دەکاتە شان.. بەلای ئەشکەوتێکدا دەڕوات و دەبینێت وا سێ چوار بێچووەگورگی چاونەپشکووتووی تێدایە.. بە خەنجەرەکەی بەرپشتی چاوی یەکە بەیەکەیان دەردەهێنێت.. ڕۆژ دێ و ڕۆژ ئەڕوات، دەچێت تا بزانێت چیان بەسەرهاتووە.. دەبینێت وا بێچووەگورگەکان هەر بەکوێری گەورە بوون و بوون بەچەند گورگێکی زل.. کاتێ ئەسپەکە دەیانبینێت، دەرەوێتەوە.. باپیرم لەسەر پشتی دەکەوێتە خوارەوە.. ئەسپ بۆی دەردەچێت و گورگە کوێرەکان باپیرم دەخۆن.

ــ زۆر خۆشبوو..!! ئینجا هی خێوەکەش.

ــ دە بنوو دەی.. ئەو هەموو هەقایەتە بوو بە چی..؟!

کاتێ کەمێ هەراش بوویت، گومانت لەوە پەیدا کرد، ئەوەی تۆ دیت خێو بووبێت... واتلێهات هەرکاتێ بیر لە دایکت بکەیتەوە، باوەپیارەکەت و ئەو پیاوەی، کە یەکەمجار دیت، دایکتی ماچکرد، تێکەڵ بە خەیاڵەکانت بن. جارێکیان کە لەسەر لمەکەی بەردەرگای ماڵی دراوسێکەتان دانیشتبوویت، پاکەتێ قەڵەمی بۆیەشت بەدەستەوە بوو، کەتازە نەنکت بۆی کریبوویت.. سوورەکەت دەرهێنا و نووکەکەیت لە لمەکە چەقاند، وتت : «ئەمە دایکمە»، ڕەشەکەش بستێ لە دووری ئەو: «ئەمەش باوەپیارەکەم».. زەردەکەش لەولاتر: «ئەمەشیان پیاوەکەیە». هەرسێکیان سێگۆشەیەکیان پێکهێنا و لێیان وردبوویتەوە.. بیرت لەو شەوە کردەوە، کە ئەم «زەرد»ـە لەبەر دەرگای حەوشەکەتان ئەو «سوور»ـەیانی ماچکرد.. دواییش یەکتریان کردە باوەش.. «سوور» و «زەرد»ـەکەت لە لمەکە دەرکێشا، تا تینت تیا بوو لەناو لەپتدا گوشینت و لەولاتر بەتەنیشت یەکترەوە پاڵتخستن.. ئەوە یەکەمجار بوو ڕقت لە ماچ هەستێت و قێزی لێبکەیتەوە.. کاتێ «سوور»ـەکە زانی تۆ چاوت لێبووە، پێی وتی:

ــ نابێت بەکەس بڵێی، بە نەنەش نەڵێیت باش..؟!

هەر دەمودەست قەڵەمێکی بۆیەی سپییشت دەرهێنا و لەولاتر چەقاندت: «ئەمەش نەنکم».. «سوور» و «زەرد»ەکەشت لەیەکتر ترازاند و هەر یەکەیانت لە لایەکی ترچەقاندەوە.. ئەمجارەیان بوون بە چوارگۆشە.. تا ماوەیەکی زۆر دوای ئەوە، هەرجارێ ئەو ماچەت بیردەکەوتەوە، رقت لە «سوور» و «زەرد»ەکە هەڵدەستا.. بیریشت لەوە دەکردەوە، کە بۆچی پێی وتی: نابێت بەو «سپی»یە بڵـێیت، کەچی ئەوەندەی پێنەچوو لەوە خـراپتریشت دی.. شەوێکیان ئەو «سپی»یە چووبوو بۆ سەفەر.. تەنها تۆ و «سوور» لەماڵ مانەوە.. قەڵەمێکی بۆیەی «شینی ئاسمانی»یت لە ناوەراستی هەموویان چەقاند: «ئەمەشیان خۆمم». نیوەشەو خەبەرت بووەوە، «سوور»ت بەتەنیشتەوە نەمابوو.. کاتێ چوویت بۆ ژوورەکەی تر و بەچاوی خەواڵووەوە دەرگات ترازاند، بینیت وا «زەرد» و «سوور» دەستیان لە ملی یەکترکردووە و نووستوون.. جارێکی تر «زەرد» و «سوور»ت لە شوێنی خۆیان لابرد و بەتەنیشت یەکترەوە پاڵتخستن.. یەکەمجار بوو دیمەنی وا ناشیرین و قێزەون ببینیت.. ماوەیەک دوای ئەوە ئەم «ڕەش»ە هات و لە ژوورەوە لەگەڵ «سوور»ەکەدا کردیان بەشەڕێ ئەوسەری دیارنەبێت.. ئەم ساڵێ بوو لەگەڵ ژنە تازەکەی دوور لە «سوور»ەکە دەژیا. قەڵەمێکی بۆیەی «پەمەیی»شت دەرهێنا: «ئەمەش ژنی باوەپیارەکەم».. «زەرد» و «سوور»ت لەیەکتر ترازاند و لەولاترت دانانەوە.. شوێنی ئەوانی تریشت گوێزایەوە.. ئەمجارەیان بازنەیەکیان بە دەورتدا پێکهێنا.. تۆ لە چەقی بازنەکەدا بەدەوری خۆتدا دەخولایتەوە و بەرقەوە سەیری هەموویانت دەکرد.. ڕقت لە هەموویان هەستا.. لە سوور، زەرد، ڕەش، سپی، پەمەیی، لە شینیش.. هەر هەموویانت خستە سەر بەردێکی زل و بە بەردێکی تر تێیان کەوتیت، تا وردوخاشت نەکردن دەستت لێهەڵنەگرتن.. تەنانەت ئەوانەی لە پاکەتەکەشدا مابوونەوە، لە دەستت دەربازیان نەبوو.. ڕۆژی دوای ئەوە داوات لە نەنکت کرد، پاکەتێ بۆیەی ترت بۆ بکرێت.. درۆت لەگەڵدا کرد، پێت وت داوتە بە کورێکی پۆلەکەتان.. نەنکت پاکەتێکی تریشی بۆ کڕیت، بەڵام تۆ خووت پێوە گرت.. بوو بە ئیشی ڕۆژانەت، نەتدەتوانی وازی لێ بهێنیت.. هەتا ناچارت

نەکردایە بۆت بکرێت وازت لێ نەدەهێنا... ڕۆژێکیان کە خەریکی شکاندنیان بوویت، نەنکتت لێ دەرکەوت.. وا دیاربوو خۆی لێ مەلاس دابوویت.. بەقژ ڕایکێشایت و بەدار تێتکەوت:

ــ هەی زۆڵی حەرامزادە.. ئەوە تۆ ئاوا لەو قەڵەمانە دەکەیت..؟!

دوای ئەو لێدانە خەستوخۆڵەش هەر وازت نەهێنا.. ڕۆژانەی حەفتەیەکت لای خۆتەوە کۆدەکردەوە و لە دووکانەکەی سەر ڕێگای قوتابخانە پاکەتێکت پێ دەکری، لەسەر لمەکە بەدزی نەنکتەوە وردوخاشت دەکردن.. هەموو دراوسێکانتان بەم کارەی تۆیان زانی و کەوتنە گاڵتەپێکردنت.. دەیانوت:

ــ واماندەزانی سامە هەر ترسنۆکە، نەماندەزانی شێتیشە.

ئەوان لەمەوپێش زۆریان لە ترسنۆکیی تۆ دیبوو، بۆیە بە «سامە ترسنۆک» بانگیان دەکردیت.. کاتێ گەورە بوویت، لە هەموو شتێ زیاتر شەرمت بەو ناتۆرەیە بوو.. هەموو هەوڵێکت بۆ ئەوە بوو، وای پیشاندەیت، کە بەخۆڕایی ئاوا بانگت دەکەن، کەچی خەونە ترسناکەکانی شەوانت وازیان لێ نەدەهێنایت و ترسەکەیان لا تازە دەکردیتەوە.. ئەو خەونانەی تا ئێستاش هەر بەدواتەوەن و لێت جیانابنەوە.

ئەگەر دوای ئەو خەوانە پەرداخێ ئاوی زۆر سارد هەبێت، کەمێ لەترسەکەی گیانت کەم دەکەنەوە، بەڵام تۆ لەو کاتانەدا ناتوانیت سەر لەژێر لێفەکە دەربهێنیت.. تەنانەت ناوێریت دەست بۆ ئەو پەرداخە ئاوەش درێژ بکەیت، کە زۆر جار پێش نووستن لە نزیک سەری خۆتی دادەنێیت.

شتێکی تری هەرە ناخۆشی دوای خەونەکانت، ئەو تامێسکانەن، کە لەسەر لچ ولێوت دەردەکەون. کاتێ لە ئاوێنەدا سەرنجیان دەدەیت، هەست بە شەرمەزاریی دەکەیت.. وا هەست دەکەیت هەموو خەڵک بە گومانەوە تێتدەروانن.. خێسەت لێدەکەن.. پێت پێدەکەنن، بۆیە ئەو ڕۆژانە زیاد لە پێویست تووره و هەڵەشەیت.. هەموو قسەیەکی هاوڕێکانت شی دەکەیتەوە... ئەو ڕۆژە «بەناز»ی هاورێت، بەبێ ئەوەی هیچ مەبەستێکی هەبێت، پێی وتی:

ــ ئەوە دەمت تامێسکی لێهاتووە..؟!

کەچی تۆ بە سەریدا هەڵشاخایت:

ــ تامێسکی چی..؟ ئەوە نابینیت هەتاو سووتاندوویەتی..؟!

هەر دەمودەستیش ئەوەت بیرکەوتەوە، کە لەم پاییزە درەنگەدا، هەتاو ئەو تینوتاوەی نەماوە تا لچ و لێوی تۆ بسووتێنێت.. «بەناز» وەک بڵێی چاوەڕێی وەڵامی وای لە تۆ نەکردبێت، لە شوێنی خۆی حەپەسا.. هەرئەوەندەی پێ وتی:

ــ وابزانم پرسیارەکەم ئەوەی نەدەهێنا، تا وا بەسەرمدا هاوار بکەیت..!!

ڕووی لێ وەرگێرایت و جێیهێشتیت.. گوێت لێبوو، کاتێ کەمێ دوورکەوتەوە وتی:

ــ خەتای منە، لەگەڵ هی وەکو تۆ قسە دەکەم.

ڕۆژی دوای ئەوە ئەم و سێ لە هاوڕێکانیت دی، ڕوویان لێ وەرگێرایت و سەلامیان لێ نەکردیت.. کاتێ کەمێکیش دوورکەوتنەوە، قاقایان لێدا.. تۆ لە شوێنی خۆتەوە وشک بوویت.. ڕەنگت هەڵبزرکا.. وای بۆچوویت ئەو کچەتیوە دەمشرە لە یەکە بە یەکەی ژووری کچان گەراوە و باسی ئەو تامێسکانەی تۆی بۆ کردوون.. پێت پێکەنیون.. ئەوانیش هەریەکەی بە ئارەزووی خۆی شتێکی بۆ زیاد کردووە.. ئەوا لێرەش بە «سامە ترسنۆک» ناونرایتەوە.. قسە بێت و بکەوێتە سەر زمانی ئەو کچە دەمشڕانە، هەر خوا ڕەحم بکات... ویستت تا زووە فریای خۆت کەویت.. لە دەرفەتێ دەگەڕایت، کە ئازایەتیی خۆتیان پیشاندەیت.. دوو ڕۆژ دوای ئەوە دەستەی کچان و دەستەی کوران چەند هەنگاوێ لە دووری یەکتر، لەبەر بەرۆچکەکەی بەردەم کۆلیجی پەروەردە وەستابوون.. هەندێ لە کوڕان بەچپە باسی ئەو کەسانەیان دەکرد، کە ئیمزاکەیان کردووە، یان وەکو خۆتان دەڵێن حەبە سەوزەکەیان قووت داوە.. تۆ بەدەنگێکی بەرز، کە مەبەستت بوو دەستەی کچان گوێیان لێ بێت وتت:

ــ ئەوانەی ئیمزایان کردووە ترسنۆکن.. ترسنۆک نەبوونایە خۆیان بە دەستەوە نەدەدا.

چاویشت هەر لە سەر ئەوان بوو، تا بزانیت قسەکانت تا چ ڕادەیەک کاری خۆیان دەکەن.. کاتێکت زانی کوڕان بڵاوەیان لێکرد و بەتەنیا مایتەوە.. تۆش ناچار ئەو ناوەت جێهێشت.. خۆت گەیاندە ژوورەوە و لە سەر قەرەوێڵەکەت پاڵکەوتیت.. لێفەکەشت تا سەر چاوت هێنا.. هەموو گیانت دەلەرزی.. ئەو

شەوە تا بەیانی خەو نەچووە چاوت.. چاوەڕێ بوویت کۆمەڵێ خێوی کەتەی زل بێن و هەر بە جلی خەوەوە لە جێگات دەربهێنن.. هەر یەکەی شەقێک و دووان و دەت تێسرەوێنێت... ئای ئەو تامێسکە سەربەگۆبەندانە چیان لێ کردیت..!! تۆ و قسەی وایان نەوتووە، بەڵام چی بکەیت، هەرجارێ بتەوێت ترسێ بشاریتەوە، ئازایەتییەکی ئاوا دەنوێنیت «بەڵێ، مرۆڤ بۆ ئەوەی ئازایەتییەکی گەورە بنوێنێت، پێویستە ترسێکی گەورەی بەئەندازەی ئەو ئازایەتییەی لە دڵدابێت». ئەمەت لەبەر خۆتەوە وت.. هەستت کرد پەیت بە نهێنیەکی گەورە بردووە لەناخی مرۆڤدا.. وتت هەر ئەمشەو دەستبەسەرت نەکەن، ئەوا لە بەیانییەوە هەرچی کتێبی «فرۆید» و «یۆنگ» و «ئەدلەر» و «فرۆم» و «ڕایش» و ئەوانی تر هەن، لاپەڕە لاپەڕە دەیانخوێنیتەوە، تا بزانیت ئەوان لەپێش تۆوە ڕێگایان بە نهێنیی وا گەورە بردووە..؟! ئەگەر نەیانبردبێت، ئەوا تا زووە کتێبێکی لەسەر بنووسیت.. بەشکو بتوانیت لەم ڕێگایەوە ناوبانگ پەیداکەیت.. ئەوسا خەڵک ئەوەندەی باسی ئەو شاکارەت دەکەن، نایانپەڕژێتە سەر ڕابردووت.. هەتا ئەگەر چەند کەسێکیش لەملا و لەولا قسەی خراپت لەسەربکەن، ئەوا هەزاران کەسی تر بەرگریت لێ دەکەن.. دەڵێن: «هەموو کاتێ نووسەر و فەیلەسووفە گەورەکان لەلایەن کەسانی بوودەڵە و هیچ لەبارنەبوودا دەکەونە بەر تانە و تەشەر»... بۆ تۆ ناوبانگ لە نان و ئاویش گرنگترە.. هاوینی ڕابردوو کتێبی «زەردەشت ئاوا دەدوا»ی «نیتشە»ت خوێندەوە.. لە هەموو شتێکی زیاتر ئەو وتەیەی سەرنجی ڕاکێشایت، کە دەڵێ: «مرۆڤ ناتوانێت بەئاسوودەیی بژی ئەگەر هەندێ ناوبانگ و پارەی نەبێت».. بە قەڵەمەکەی دەستت هێڵێکی تۆخت بەژێر وشەی «ناوبانگ»دا هێنا.. لەو ڕۆژەوە زیاتر لە جاران شەیدای ناوبانگ بوویت.. کەوابێت دوودڵی لە نووسینی ئەم کتێبە نەکەیت چاکە، چونکە تاکە شتە بتوانێت ناوبانگێکی گەورەت بۆ مسۆگەر بکات.. لەسەر ئاو و ئاگر بوویت.. ئاخۆ خێوەکان دەتبەن و لە ژێرزەمینە ئێجگار تاریک و نووتەکەکاندا حەشارت دەدەن.. بۆ هەتا هەتایە لەبیر دۆستە هەرە نزیکەکانیشت دەبەنەوە، یان دەرگای بەختت بۆ دەخرێتە سەر گازەرای پشت و دەبیتە لووتکەیەکی هەڵکشاوی جیهانی

نووسین..؟! هەر کامیان بێت، ئەوا تۆ هەر لە ناوچەوانی ئەو تامێسکانەی ببینە.. شت بە گەورەیی و بچووکی نییە.. تۆ بزانە ئەو تامێسکە ورد وردانە دەتوانن چەند ڕووداوی گەورە گەورە بەدوای خۆیاندا بهێنن.. ئەوەتا مردن و ناوبانگ ئەوان بڕیاری لەسەر دەدەن.. نەتدەزانی رقت لێیانبێت، یان خۆشت بوێن..؟! تاکە تەنگوچەڵەمەیەک، کە ترسایت بێتە سەر ڕێگای نووسینی کتێبەکەت، ئەوە بوو چۆن بتوانیت بەو هەموو سەرچاوانەدا بچییتەوە، تا تەواو لەوە دڵنیابیت، کە هیچ زانا و فەیلەسووفێکی تر بێجگە لە تۆ خۆیان لە قەرەی بابەتی ئاوا پەنهان نەداوە، چونکە نەتدەویست شتێ بنووسیت، لەمەوپێش نووسرابێت.. دەتویست ڕێبازێکی تازە لە دەروونناسییدا دابهێنێت.. «فوئاد»ی هاوڕێتت بیرکەوتەوە، کە شارەزاییەکی چاکی لەم بوارەدا هەیە و دەتوانێت کارەکەت بۆ ئاسان بکات.. بڕیاریش بوو دووشەممە یەکتر ببینن.. ئەوەندەی پێنەچوو پەشیمان بوویتەوە بەو بڵێیت.. بە خۆتت وت: «کەی ڕۆژی ئەوەیە متمانە بە کەسانی تر بکەیت.. بەتایبەتییش لە مەسەلەیەکی ئاوادا.. دوورنییە لەپێش منەوە دەستی خۆی بوەشێنێت و خۆی بکات بە خاوەنی.. نەخێر، پێی ناڵێم.. با ڕۆژێ لە ڕۆژان وەکو هەر خوێنەرێکی تر بچێت کتێبەکەم لە بازاڕ بکڕێت و بیخوێنێتەوە».. لەوەش ترسایت بە نهێنیی دڵت بزانێت و پێت بڵێت: «ئەگەر ئەمە لە خۆت ڕووی نەدابێت، چۆن ئاوا بۆی چوویت..؟!» باش بوو فریای خۆت کەوتی، ئەگینا ئەوەندەی تر ناوت دەزڕا.. لە بیرتە جارێکیان وتی:

ــ هەموو ئەو فەیلەسووف و زانا سایکۆلۆژیانە، هەر شتێ دەیڵێن، ئەوە هی ناخی خۆیانە.. ئەوان بۆئەوەی شتەکە لە خۆیان دوورخەنەوە، سەگ و پشیلە و مشک دەهێننە ناو ناوانەوە، گوایە تاقیکردنەوەیان لەسەر کردوون.

جارێکی تریش کە بەیەکەوە، لە شەقامی «دەواسە» پیاسەتان دەکرد، پێی وتی:

ــ ئەگەر دەموچاو نەبوایە، مرۆڤ دەیتوانی زۆر شت لە دڵیدا بشارێتەوە، بەڵام دەموچاو کەم و زۆر ناخی مرۆڤ دەردەخات.

ئەوە مەبەستی چی بوو..!! وادیارە هەستی بە شتێ کردووە، ئەگینا بۆچی

ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر خۆیت لێ نزیک دەکاتەوە..؟! دەسا هەبێت و نەبێت مەبەستی ئەوەیە وەکو سەگ و پشیلە و مشک تاقیکردنەوەت لەسەر بکات.. هەر ئەوەندەت زانی لەکتێبێکدا ناوی لەپاڵ ناوی ئەمانەدا نووسیت و ڕیسوای کردیت.. وا چاکە خۆتی لێ دوورخەیتەوە.. دووشەممەش نەچیت بۆ لای.. با بۆ خۆی هەر چاوەڕێ بکات.. دوای ئەوەش لە هەر شوێنێ دیت، ڕووی لێ وەرگێرە... چۆنت وت ئاوات کرد.. ڕۆژێکیان «فوئاد» ڕێگەی لێ گرتیت و پێی وتی:

ــ ئەرێ ڕۆحەکەم ئەوە چییتە لەگەڵ من..؟! هیچ شتێ بووە، ئاوا خۆتم لێ نەناس دەکەیت..؟!

تۆ ڕەنگت تێکچوو.. شڵەژایت.. بە دەموپلێکی تێکئالاوەوە پێت وت:

ــ کاکە گیان هیچ نەبووە، بەڵام من ئازادم قسەت لەگەڵدا بکەم، یان نەیکەم.

ــ من ناڵێم قسەم لەگەڵدا بکە، بەڵام هەر ئەوەندەم پێبڵێ هیچی خراپت لێ دیوم..؟!

بۆ ئەوەی لەوە زیاتر دەموچاوت نەخوێنێنێتەوە و چیتر بە نهێنیی دڵت نەزانێت، خێرا پشتت تێیکرد و ڕۆیشتیت، بەڵام ئەم پێی وتی:

ــ تۆ ئاوا بیردەکەیتەوە، ناترسی ڕۆژێ بەتەنیا بمێنیتەوە..؟!

ــ من دەترسم..؟ ئەوە چاک بزانە لە ژیانمدا نە لە هیچ ترساوم نە لە هیچیش دەترسم.

«فوئاد» دوای ئەو قسە ڕەقانەش، کە پێت وت، هێشتا هەر وازی لێ نەهێنایت.. هات دەستی کردە ملتەوە و ماچی کردیت، بەڵام تۆ قاچت زەوییان نەدەگرت... هەرچۆنێ بوو خۆت لە دەستی ڕاپسکاند.. بەحاڵەحاڵ، خۆت گەیاندە سەر قەرەوێڵەکەت و لە سەر پشت لێی ڕاکشایت.. هەستت کرد دڵت تێکهەڵدێت.. بە پەلەپرووزێ خۆت گەیاندە بەربەلووعەکە و ڕشایتەوە.. تایەکی گەرمت لێ هات.. دوایی زانیت دوو ڕۆژ لە نەخۆشخانە کەوتوویت.. کاتێ چاوت کردووە «ڕێبوار» و «ڕزگار» لە ملا و لەولای سەرتەوە دانیشتبوون.. ئەوان بە درێژایی ئەو دوو ڕۆژە بۆ ساتێکیش جێیاننەهێشتبوویت. بۆیان

باسکردیت، کـە زۆر نەخـۆش بوویت، لە تاوا ورێنەت کـردووە.. کـاتێ بـاسی ورێنەیان کـرد، کسـپە لـە دڵـتەوە هـات.. لەوە ترسـایت باسـی ترسـەکـەی دڵـت کردبێت، بۆیە یەکسەر لێیان تووڕەبوویت:

ــ کێ بە ئێـوەی وتوە من بێئن بۆ خـەسـتـەخـانە..؟! ئێـوە شـەرم ناکـەن دەتانەوێت بە نهێنیی دڵی خەڵک بزانن..؟!

ئـەوان ئەم قـــســـــانـەی تۆیـان زۆر بـەلاوە ســــەیر بوو.. وا دیـار بـوو لەبـەر نەخۆشییەکەت لێیان نەگرتی.. «رێبوار» زۆر بەنەرم و نیانی پێی وتی:

ــ سامان گیان ئێمە هیچ مەبەستێکی خراپمان نەبووە، تۆ بۆچی خراپ لە ئێمە تێدەگەیت.؟

ــ زۆر چاک لە مـەبەسـتـتـان دەگـەم، بەڵام ئێـوە درۆ دەکـەن.. نە ورێنەم کردووەو نە لە هیچیش ترساوم.

ـــ جا بەقوربان کێ باسی ترسی کردووە..؟!

ـــ وازم لێ بێئن .. گوم بن لە بەرچاوم.

کاتێ لە نە خۆشخانە دەرچوویت، بەتەواوی پرۆژەی نووسینی کتێبەکەت لە مێشکی خۆت دەرکـردبوو، بەڵام هێشـتـا لە ڕێگایەک دەگـەڕایت، کە لێـیـەوە ناوبانگ پەیداکەیت. بۆچی تۆ چییت لەوانە کەمترە، کە ناوبانگیان بە هەموو دنیادا بڵاوبووەوە.. ئەوەتا زۆر لە خەڵکی شار بوون بە شت و ناوبانگیان پەیدا کرد.. زۆر کەس لە دز و ڕێگر و چەقۆکێش و قومارچی و هەتیـوباز بوون بە گۆرانـیـبێـژ و یاریکەر و ئەکـتـەر و شـاعـیر و چیرۆکنووس... «شـەریف»، ئەو کورەی کەس نەیدەزانی کێ باوکیەتی، کەسیش چاکی پێ نەدەوت.. هەمیشـە لە ناو خەڵک سـەرشۆڕ و چاوبەرەوژێر بوو.. کاتێ گۆڕاش وەکو کەس نەگۆڕا.. لە ماوەی چەند ساڵێکدا ناوبانگی بە هەموو لایەکدا بڵاوبووەوە.. ئەم کە حەزی بەرزبوونـەوەی لا پەیدابوو، لە سـەرووی خـۆیەوە ڕانەمـا، بەڵکو بـەرزبووەوە، تا لەوێوە بزانێت لەژێر قاچەکانیدا چی هەیە..(*). ئەم ڕووی کردە شاخ و کێو.. برنەوێکی بەقەدەر باڵای خۆی کردە شان.. هێندە ئازا بوو ڕێگای چەند ساڵی بەچەند مـانگێ بڕی.. بوو بە سـەرلەشکر.. ناوی خۆی نا «برووسکە» و بوو بە برووسکە... یاخـــوا هیچ بنکەیەکی دەوڵەت بەر برووسکەی «برووسکە»

نەکەوتایە.. ئەو ڕەبییە و تەپۆڵکانە لەژێر دەستی «برووسکە»دا هەردەتوت لە قوڕی دەستکرد درووستکراون، سەربازەکانی ناویان هەروەک ئەو سەربازە نایلۆنانەبن، کە منالآن یارییان پێ دەکەن، لە چاوترووکانێکدا بەسەریەکتردا دەکەوتن.. خۆ لەو ڕادیۆیەی شۆڕشدا باس هەر باسی «برووسکە» بوو.. کەم کەس لە خۆی ڕادەبینی لەگەڵ «برووسکە»دا بچێت بۆ شەڕ.. «جەمالی حاجی برایم»، کە جاران هەر بەچاوداگرتنێ چواری وەکو «برووسکە»ی بەپێش خۆی دەدا، چەکەکەی دانا و هاتەوە ناو شار و لە ماڵەکەی خۆیدا سەری شۆڕ کرد.. کاتێ لێشیان پرسی بۆچی وازیهێناوە، هەر بەبێ ئەوەی بەلایەوە شەرم بێت وتی:

ــ گیانی خۆم لە سەرەنوێڵک نەدۆزیوەتەوە.. هەموو شتێ بەخوێ و خوێش بەمەعنا.. ئەوەی برووسکە دەیکات و لە ئێمەی داوا دەکات، مەگەر هەر لە فلیمدا بینرابێت.

هەر ئەویش بوو جارێکیان وتی:

ــ کەم کادیر هەیە ئەوەندەی برووسکە سەری لە کاروباری سیاسی دەربچێت.. قسەڕەوانی وەکو خۆی نەبووە و نابێتەوە.. خەڵکی لادێ ئەوەندەی گوێ لەو دەگرن، لە هیچ مەلا و پیاوچاکێکی ناگرن.. قسەکانی لە شیعر چاکتر لەبەردەکەن.. خەڵکی ئەو لادێیانە ڕۆژ بەڕۆژ پشت لە مزگەوت و ڕوو لە برووسکە دەکەن.. مەلاکان هەتا دێت خەڵکیان لە دەوروپشت کەم دەبێتەوە.. هاکە زانیتان کەس نەما نوێژیان لە دواوە بکات.. ئەم بەڵێنی پێ داون تا گیان لە جەستەیدا مابێت، هەر کوڕ و برایان بێت.. هەموو جارێ دەڵێ:

ــ تا بستێ لەم خاکە لە ژێر دەستی ڕژێمی داگیرکەردا بێت، چەکی شانی من داناگیرێت.. تا ڕژێمێکی تازە لەسەر بناغەی یەکسانیی کۆمەڵایەتی، لەجێی ئەم ڕژێمە دانەمەزرێت، ئەم شاخ و کێوە جێناهێڵم.

خۆ هەرکاتێ برووسکە ئەو قسانەی تەواوکردبێت، دەنگی چەپڵە لە ورد و درشت بەرزبۆتەوە و چی باڵداری ئەو ناوە هەیە، لە ترسی دەنگی چەپڵە هەڵەتە بوون.

«فەرهاد»، کە بەوە ناسراوە لە هەموو شوێنێ قسەی خۆی دەکات وتی:

ــ ئەو برووسکەیەی نەیتوانی بازنە بچووکەکەی دواوەی خۆی بپارێزێت، چۆن ئەم هەموو خاکەی پێ دەپارێزرێت..؟!

«جەمال» زۆر بە توورەیی وەڵامی دایەوە:

ــ تۆ نابێت ئاگـــات لە دەمی خـــۆت بێت..؟! نابێت بزانیت باسی کێ دەکەیت..؟! ئەو رۆژانە بیری خۆت بەریتەوە چاکە.. ئەگەر تۆ خۆت پێ لەو باشترە، بۆچی ناچی جێگای ئەو بگریتەوە..؟!

یەکەمجار بوو «فەرهاد» بۆ وەڵام دابمێنێت.. داماوە دەمی بوو بە تەڵەی تەقیو.. ئەمجارەیان « جەمال » بە نەرم و نیانی تێهەڵچووەوە:

ــ کوڕی باش با بەویژدانەوە باسی خەڵک بکەین.. ئەو برووسکەیەی تۆ ئاوا باسی دەکەیت، چی جوتیار و ڕەشورووتی لادێ هەیە، دەست دادەنێن ئەم بەسەریدا بڕوات.. هەموویان ئاواتی ئەوە دەخوازن، چاوی بخاتە سەر کچەکانیان، تا شانازی بەوە بکەن، کە جوامێرێکی وەکو ئەو بووە بە زاوایان.. باوکی جوانترین کچی ئەو لادێیانە نەک هەر ئاواتی ئاوا دەخوازن، بەڵکو زۆریشیان دا بە گوێچکەیدا، کە ئەو شەرەفە گەورەیان پێ ڕەوا ببینێت، بەڵام برووسکە هەمـــوو جـــارێ دەست بە ڕوویانەوە دەنێت.. ئەوەندەیان پێ وت، ناخۆشیان کرد. ناچار بوو لە هەموو دانیشتنێکدا بەهەق و ناهەق باسی ئەوە بکات، کە تا سەرتاپای وڵات ڕزگاری نەبێت، هیچ ئافرەتێ ناکاتە هاوسەری خۆی.. کەس نەماوە لەو لادێیانە ئەوە نەزانێت، کە ڕزگاربوونی دوابستی خـــاکی وڵات و زەمـــاوەندی برووسکە بە یەک ڕۆژ دەبێت... جـــارێکیـــان لە دانیشـتنێکدا گەورە و بچووک ئامادە بوون، قسـە هاتە سەر مەسەلەی ژنهێنان.. ئەم وەکو هەموو جارێ ڕاکەی خۆی وت.. یەکێ لە شۆڕشگێرەکان پێی وت:

ــ ببوورە هاوڕێ برووسکە.. ئەمەی تۆ دەیڵێیت ئەوە ناگەیەنێت، کە ئافرەت ڕێگرە لەبەردەم خەباتی چینایەتی و نیشتیمانیدا..؟!

«برووسکە» وتی:

ــ ئێوە خۆتان چاک دەزانن من ڕام لە سەر مەسەلەی ئافرەت چۆنە.. من هەرکاتێ قسە هاتبێتە سەر مەسەلەی ئافرەت، بەرگرییم لە مافی رەوایان

کردووه.. هەردەم وتوومە: «ئازادی وەکو منداڵ وایە، بەبێ هاوکاریی ژن و پیاو بەرهەم نایەت».

گفتوگۆ لە سەر ئەم مەسەلەیە گەرم بوو.. یەکەمجار بوو جوتیار و ژنەجوتیار و کچەجوتیار و کوڕەجوتیار حەز بەوە بکەن «برووسکە» پشتی بە زەوی بکەوێت.. هەموو خواخوایان بوو لەم گفتوگۆیەدا ببەزێت و باوەڕ بە ژنهێنان بهێنێت، بەشکو ئەوە دنیایە ئەم بازی پاشایەتییە لە سەری ئەوان بنیشێتەوە، بەڵام چی پشتی «برووسکە»ی بە زەوییدا دەدا.. ئەم بۆ هەر قسەیەکی ڕای دەیان نووسەر و فەیلەسووفی گەورەی دەهێنایەوە و سەرچاوەکانیشیانی دەستنیشان دەکردن... ئەوە یەکەمجار بوو «برووسکە» لە دژی بەرژەوەندیی زەحمەتکێشانی لادێدا بوەستێت و لە دڵەوە برینداریان بکات... «برووسکە» لە سەر ڕاکەی خۆی سوور بوو، ئەو تاجە زێڕینەی نەنایە سەر هیچ کامێکیان.. تەنانەت بۆ نانخواردنیش ناچێت بۆ ماڵیان.. ئەم تا نانەرەقەی ناو توێشەبەرەی خۆی هەبێت، چاوی هیچ شتێکی تر نابینێت.. هەموو شتێکی ئەو ماڵە لادێییانە لەم حەرامە، هەر لە ژن و بێوەژن و کچ و گەورەکچ تا مانگا و مەر و بزن و مریشک.

کەس نەیزانی «برووسکە» کێ کوشتی و بۆچی و چۆن و لە کوێ کوژرا، هەر ئەوەندە زانرا لە سەرتاپای شارەکان بوو بە شین و شەپۆر و واوەیلا.

کەم شاعیر ما شیعری بۆ هەڵنەبەستێت.. کەم چیرۆکنووس هەبوو چیرۆکێ دووانی لەسەر نەنووسێت.. وایلێهات لە پاڵ ناوی ئەودا، ناوی دەیان نووسەر بیسترا و ناوبانگیان پەیداکرد. تەنانەت شاعیر و چیرۆکنووسانی شاریش، شیعر و چیرۆکی ڕەمزییان لە سەر دەنووسی.. بۆئەوەی لە سانسۆریش دەربازبن و بگەنە سەر لاپەڕەی گۆڤار و ڕۆژنامەکان، دەیان وشەی وەکو باو باران و بەفر و تەرزە و زوقم و ڕەهێڵەیان لەپاڵ دەنووسی.. تاکە پێوانەیەک بۆ ئەدەبی راستەقینە ئەوە بوو چەند باسی لە «برووسکە» کردووە.. کۆمەڵێ دیوانەشیعر و کۆمەڵەچیرۆک لە یەک کاتدا بەناوی «برووسکە»وە کەوتنە بەردەستی خوێنەر.. نووسەران لە پەنادیوار و گازینۆکاندا دەبوو بە شەڕیان، لەسەر ئەوەی کامیان یەکەمجار

دیوانەشـیـعـرەکـەی، کـۆمـەڵەچیـرۆکـەکـەی ناوناوە «برووسکـە»..؟! کـار بەوە گەیشت هەر کۆلکەنووسـەرێ، بۆئەوەی خوێنەر و ناوبانگ پەیداکات، لە کۆڵان و سـەر شـۆسـتـە و گـۆرەپانی یاری و گـەرمـاوەکاندا باسـی دۆسـتـایەتی خـۆی و «برووسکە»ی دەکرد.. یەکێ لەوانەی نۆبـەرەی دیوانەشیعرەکـەی خۆی ناونابوو «برووسکە»، جارێکیان وتبووی:

ـــ هەر لەمنداڵیـیـەوە تـا چووە دەرەوە، بۆ سـاتێکیش لە یەکـتـر جـیـا نەبووینەتەوە.. هەموو شتێکمان هەر بەیەکەوە دەکرد.

یەکێکی تر بە درۆی خستبووەوە و پێی وتبوو:

ـــ تۆ نـووسـەریت ئاوا درۆزنیت، ئەی ئەگـەر نووسـەر نەبوویتـایـە چۆن دەبوویت..؟! ئاخر هەتیو تۆ لە «باداوە» و ئەو لە «تەیراوە».. تۆ لەمسـەری شار و ئەو لەوسـەری، پێم ناڵێی چی بە یەکـتـری دەگـەیاندن..؟! دەڵێن درۆ لەگـەڵ مـردوودا دەکرێت، بەڵام برووسکە نەمـردووە، تا شـیـعری نەمری منیش مـابێت، ئەویش زیندووە.

سـەرنووسـەری یەکێ لە گۆڤارەکان بە ئامۆزاکەی خۆی وتبوو:

ـــ ئێمە چاک دەزانین مـەبەست لەو هەمـوو شیـعـر و چیرۆک و شـانۆگەرییـە چییـە، کە لەم ماوەیەدا بەناونیشـانی «برووسکە» دەنووسرێن و پێمـان دەگات.. خـۆ دەبەنگ نین.. ئەگـەر نەزانین قـازانجی خـۆشـمـانی تیـایە چۆنیـان بڵاودەکەینەوە.. ئێستا چوار ئەوەندەی جاران لە گۆڤارەکەمـان چاپ دەکەین و لە ماوەی دوو ڕۆژدا یەک دانەی لە کتێبخانەی شارۆچکەکانیشدا نامینێت.

منداڵـە دەسـتـفـرۆشـەکـانیش بەیانیـان زوو زوو سـەرەیان لـە بەر دەرگـای کتێبخـانەکاندا دەگرت.. هەرچی ڕۆژنامـە و گۆڤـار هەبوو دەیانقۆزتنەوە و بە دوو قات و سێ قات دەیانفرۆشتنەوە.

دوو شـاعـیـر شـەڕێکی گەورەیان لەسـەر ئەو کۆپڵـەشـیـعـرە بەرپاکـرد، کە منداڵانی «سـەیداوە» و «سـێتـاقـان» و گـەڕەکـەکـانی تر لەبەر دەیانوتەوە و بە تەباشیر و خەڵووز لە سەر دار و دیواری گەرەکیان دەنووسی:

ئـەگـەر دەتـەوێ ببـی بـە بـرووسـکــە
لـە شەوەزەنـگـدا بـبـی بـە تـرووسکـە

روو لـه شـەرەف و پشـت لـه فلـووسكـه
خـۆت لـه دەفـتەری نـەمریی نـاونووسکه

ئەوەندەیان لەسـەر وت و وتـەوە، تا هەمـوو دەرگا و پەنجـەرە و کـون و درز و دەلاقەی گۆڤار و ڕۆژنامـەکانیـان بەسـەردا داخسـتن، کەچی دەرکـەوت هـی هیچ کـامـێکیـان نیـیـە و هـی «کـەریم سـەیداوەیی»ـە... دایکی «کـەریم» لەکـاتی مـانگـادۆشـین و بەردەرگـاگسكدان و نیـسک و نـۆک بژارکـردندا.. تەنـانەت لە کـاتـی سنگکوتان و خـۆرنینەوە لە پرسـەکـانیـشـدا، ئەم کـۆپلـەشـیـعـرەی لەبەرخـۆیەوە وتۆتەوە.. منداڵە چەقـاوەسووەکـانی گەڕەکیش لە بەریانکردووە و لە هەمـوو شـاردا بڵاوبۆتەوە.. گەیشـتـۆتە بەردەمی شـاعیـرەکانیش.. لەوێشـەوە بۆ سـەر لاپەڕەی ڕۆژنامـەو گۆڤـارەکـان. «دایکی کـەریم» ئەوەندە ئافـرەتێکی بێ دەمـوپل نییە، تا بهێڵێت هـەقی بەسـەر کەسەوە بچێت. دەڵێن چووە بۆ گازینۆی نووسـەران و چی خراپە بەو دوو شاعیرەی کردووە.. پێی وتوون:

ــ ئێـوە چیـن تـا شـیـعـر لەسـەر برووسکە بنـووسن.. بڕۆن لەسـەر دەرپـێ بێنوێژەکـانی دایکتـانی بنووسن.. کوره بڕۆن لە سـەر ئەو گەوادانەی بنووسن، کە کەس نازانێت کێن و ئێـوەیان لە قنگی دایکتـان خسـتـەوە.. شیـعری کوڕی من نابێت بە هـی ئێوە، بەڵام زمـانی من بە بڕینـچێت پێش ئەوەی تەواوی بکات، لە دنیـادا بڵاومکردەوە.. ئەوەی ئێـوە دزیوتـانە بەشـێکی زۆر کـەمـە لەوەی لای خۆمان هەیە.

لەوەتـەی ئەدەب ئەدەبـە ئەوەندەی ئـەم مـاوەیە وشـەی با و بەفـر و باران و برووسکە و بارێژە و تەرزە و زوقم و ڕەهێڵـەی بەخۆیەوە نەدیوە.. ئەدەبی «تەر» و «وشک»، بوون بـە دوو ڕێبـازی دژ بە یـەک و جـێگای هـەمـوو ڕێبـازێکی تری ئەدەبیـان گـرتەوە.. «نووسـەرە تەرگـۆ»کـان «نـووسـەرە وشکگۆ»کـانیـان بەوە تاوانبـار دەکـرد، کە ڕێگرن لەبەردەم بەرهەمـهێنانی ئەدەبێکی تەڕ و پاراو و برووسکەداردا.. ئەوانیش قسـەی خۆیان پێبوو، تا بـۆیان بکرایە نەیاندەهێشت بەسـەریانـەوە بچێت و بەرپەرچیان دەدانـەوە.. تـەنانەت «نووسـەرە تەڕگۆ»کان، لە نێـوان خـۆشـیـانـدا کـردیان بە شـەر لەسـەر ئەوەی کێ بە پێـشـەنگ و دەمـڕاسـتی ئەو ڕێبـازە دادەنرێت.. کار بـەوە گـەیشت دەسـتـەی نووسـەرانی

گۆڤار و ڕۆژنامەکان ڤیروسیا لەو هەموو قازانجە بکەن، کە لەم ماوەیەدا لە فرۆشتنی ئەو ژمارە بێشومارەی گۆڤار و رۆژنامەکانیان دەستیان دەکەوت.. بڕیاریاندا لەمەودوا هەر نووسینێک لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیان تەڕبکات، یان شێداری بکات، بڵاوی ناکەنەوە.. ئیتر «نووسەرە تەڕگۆ»کان هیچ شوێنێ نەما بەرهەمی خۆیانی لێ بڵاوبکەنەوە، سەر کێلەکەی گۆڕی «برووسکە» نەبێت.. ئێستاش نەزانراوە کێ یەکەمجار بیری لەو شوێنە کردەوە و یەکەم شیعری خۆی لە سەر نووسی.. هەر شیعرێ لەوێ بنووسرایە، تەنها بیستوچوار سەعات دەمایەوە، چونکە شەوی داهاتوو شاعیرێکی تر دەچوو دەیسڕییەوە و شیعری تازەی خۆی لەسەر دەنووسی.. ئەو کێلە هەر ڕۆژێ بە ڕەنگێ بۆیە دەکرا و هەموو ڕۆژێکیش شیعرێکی تازەی لەسەر دەنووسرا.. بە قسەی «سامی کوورانی»، کە خۆشی چیرۆکنووسێکی ناسراوی ئەم ڕێبازەیە، هەموو نووسەرە تەڕگۆکان ماڵی خۆیان گوێزاوەتەوە ئوتێلێکی نزیک ئەو گۆرستانەی «برووسکە»ی تیادا نێژراوە، بۆئەوەی هەرکە شەوداهات خێرا خۆیانی بگەیەننێ و دوا شیعری خۆیانی لەسەر بنووسن.. هەرچی نووسەری تەڕگۆی شارەکانی تریش هەن، هەر هەموویان ڕوویان کردۆتە شارەکەی «برووسکە» و هەر سێ سێ و چوار چوار ژوورێکیان لەو ئوتێلە بەکرێ گرتووە.. خاوەنی ئوتێلەکەش پیاوێکی دڵتەڕبووە و زۆر خۆشی لێیان هاتووە، بۆیە بڕیاری داوە هەرچی نووسەر نەبێت و نووسەری تەڕگۆ نەبێت، نەهێڵێت پێ بخاتە ئوتێلەکەی.. ناوەکەشی کردووە بە «میوانخانەی برووسکە».

ڕەخنەگرێک گلەیی زۆری لە گۆڤار و ڕۆژنامە و هەموو دەزگا چاپەمەنییەکان کردبوو، کە دەرگایان بەڕوودا داخستوون، ئەگینا لێکۆڵینەوەیەکی نایابی لەسەر ئەدەبی بەراوردکاری نووسیوە و بەراوردی نێوان شیعری «تەڕ» و «موعەلەقات»ی کردووە.. بە قسەی خۆی لەو لێکۆڵینەوەیەدا وتویەتی: «ئەم تەرزە شیعرە لەوەدا لە شیعری موعەلەقات ئەچێت، کە هەردووکیان لەسەر دوو شوێنی پیرۆز نووسراون.. یەکەمیان لەسەر گۆڕی برووسکە و دووەمیان لەسەر دیوارەکانی کەعبە، بەڵام لەوەدا جیاوازن، کە شاعیرە تەڕگۆکان، ژمارەیان لە شاعیرانی موعەلەقات زیاترە».

هەر ئەو ڕەخنەگرەش بوو لە کۆڕێکدا وتبووی: «ئەدەبی تەر کودەتایەک بوو بەسەر ئەدەبی وشکدا.. وەرچەرخانێکی گەورەش بوو لە ئەدەب خۆیدا».

چیرۆکنووسەکان ئێرەییان بە شاعیرەکان دەبرد و خۆشیان بەهەقخوراو دەزانی، چونکە کێلەکە جێگای نووسینی چیرۆکی تیا نەدەبۆوە، بۆیە هەندێکیان ڕوویان کردە نووسینی شیعر و ئەوانی تر بە چیرۆکی زۆر کورت گیرسانەوە.. تاکە یەک چیرۆکنووس، کە تیایاندا ڕای جیاوازی هەبووبێت «جەلیل تەعجیلی» بوو.. داوای لە چیرۆکنووسەکان کردبوو، وڵاتی پڕ لە خێر و بەرەکەتی «چیرۆک» نەخەنە ژێر پۆستاڵی ڕەشی سوپای «شیعر»ی داگیرکەرەوە.. تا بۆیان دەکرێت بەرگری لێ بکەن. ئەم وەکو ئەوان نەبوو، دوور دەیروانی و لەوە دەترسا چی کچە مەنەلۆجی «ڕاستەوخۆ» و «ناڕاستەوخۆ» و «دیالۆگ» و «فلاشباک» و «شەپۆلی هۆش»ی وڵاتی چیرۆک هەن، وەکو کەنیزەی شەڕ بکەونە ژێر دەستی سەربازە چاوبرسی و حەشەرییەکانی شیعر.. ئەم بێجگە لە چیرۆک سەری لە ئابووریش دەرئەچوو.. پێشنیاری کردبوو چوار دیوار لەشێوەی دیوارەکانی کەعبە بەدەوری گۆڕەکەدا هەڵبچنن، ئەوسا جێگای چیرۆکیشی تیادا دەبێتەوە.. دوورنییە ڕۆژێ لە ڕۆژان وەکو شوێنێکی زۆر پیرۆزیش سەیر بکرێت و خەڵک بەمەبەستی حەج لە هەموو لایەکەوە ڕووی تێبکەن، بەڵام کەس گوێی لێ نەگرتبوو.. ئاخر ئەوان بەدوای ناوبانگدا دەگەران.. ناهەقیشیان نەبوو.. ئەی شەوانە چۆن بەئاسوودەیی و بەبێ خەم سەر بخەنە سەر سەرین.. لەجیاتی خەون بە خێوەوە ببینن، بە کچە «شیعر»ی باڵابەرزی سنگ و مەمک وەک سوورەماسی.. بە شۆڕەژنی «چیرۆک»ی چاوشین و قژدرێژی تا سەر سمتی خڕ و خەپان.. بە گەورەکچی «ڕەخنە»ی سنگ و مەمک تینووی مژین و دەست و پەنجەی باریک و درێژی شەیدای گوشین و دەستبازییەوە ببینن.. کێ دەتوانێت خەونی ئاوا ببینێت، ئەگەر ناوبانگی نەبێت..!!

بەهاتنی چیرۆکنووسان بۆ ڕیزی شاعیران ، ژمارەی پێشبڕکێکەران زیادی کرد.. ئیتر هەر شاعیرە و مانگی جارێ بۆی دەلوا شیعری خۆی بڵاوکاتەوە، بۆیە ناچار بوون پێیان لە جەرگی خۆیان نا و بەرۆژیش هەر دەچوون.. ئەمەش

کارێکی وایکرد، دەوڵەت پێیان بزانێت و گۆڕەکە تەخت بکات.

دوای ئەم کارەساتەش شاعیرە تەرگۆکان وازیان نەهێنا.. ئەمجارەیان پەنایان بردە بەر نووسینی دیوارەکان.. دیوار نەما لەو شارە شیعری تەری لەسەر نەنووسرابێت.

ئەو نووسەرانە ئەگەر لەسەر هەموو شتێ ناکۆکبن، ئەوا لەسەر ئەوە کۆکن ئەگەر «برووسکە» نەبوایە، ئەدەبی تەڕ و پاراو لە دایک نەدەبوو.. هەموویان لەوەدا یەکدەگرنەوە، کە ئەگەر «برووسکە» نەبوایە، ئەوان نەیاندەتوانی ئەو هەموو داهێنانە لە ئەدەبدا بکەن.. ئەوان بۆ هەر مەبەستێ لەسەر «برووسکە»یان نووسیبێت، ئەوا ئارەزووی خۆیانە، بەڵام ئەوەندەی تر بە دنیایان ناساند.. کارێکیان کرد هەزارەها کەس خۆزگەی پێ بەرن و بڵێن: «خۆزگە ئێمەش دەمانتوانی وەکو ئەو بکەین..!!».. بەتایبەتی ئەوانەی ڕابردوویان لە ڕابردووی ئەو دەچوو.. دەستە دەستە خۆیان دەگەیاندە ئەو شاخ و داخە.. ناوی خۆشیان دەنا «برووسکە».. ئەمان کە خۆیان لەپاڵ ئەوانەدا ئەدەدی، کە لەوەتەی هەن ناپاکییان لە جەستە و خاکی خۆیان نەکردووە، هەستیان بە ئاسوودەیی و پاکبوونەوەی ناخی ناخی ڕۆحیان دەکرد، بەڵام کە ئەو جیاوازییە گەورەیان لە نێوان خۆیان و ئەواندا دەدی، هەستیان بە دڵەڕاوکێ دەکرد و شەرمیان لە خۆیان دەکردەوە.. ئەوانە «مرۆڤە پیرۆزەکان» بوون.. ئەوانەی ڤایرۆسی ناخپیسکەری شارستانیەت، پەی بە شوێنی سەخت و قایمیان نەبردبوو.. ئەوان شاریان هەر نەدیبوو، مەگەر بە شەو و بۆ شەڕ.. هەر بەپیرۆزییش لە دایکببوون، چونکە باوکیان، کە لەهیچی نەبووەوە کردبوونی بە مرۆڤ و گیانیان بە بەردا کردبوون، چەکەکانیان هەر بە شانیانەوە بوو، هەر بۆیە سڵیان لە مردن نەدەکردەوە.. ئا ئەوە بوو ئەو جیاوازیەی بەئاسانی هەستی پێدەکرا.. ئەمان وانەبوون.. دەترسان.. زۆریش دەترسان.. لەوە دەترسان پێش ئەوەی ڕۆحیان پاکبێتەوە، بمرن و لەو دنیا بۆ هەتاهەتایە لەناو ئاگری بەتینی دۆزەخدا بمێننەوە.. هەر بۆیە دەیانوت: «گڕی چەند چرکەی فیشەکی ناپاکێ، نەک ئاگری هەمیشەی خوای مەزن..!!» بەڵام کەی..؟! دوای ئەوەی، کە بەتەواوی پاکبوونەوە.. ئەو کاتەش دەزانن

پاکبوونەتەوە، کە چیتر «مرۆڤە پیرۆزەکان» بەگومانەوە سەیریان نەکەن.. ئەوان هیچ شتێ ڕۆحی داخنەکردبوون، ئەو سەیرکردنە پڕ لە گومانەی «مرۆڤە پیرۆزەکان» نەبێت، چونکە بەوەدا دەیانزانی چەند پیس و گڵاون، هەر بۆیە دەستەودامێنیان بوون، بەشکو لە خوای گەورە بپاڕێنەوە و بارانێکی ڕۆحپاککەرەوەیان بۆ ببارێنن. «مرۆڤە پیرۆزەکان» دووعایان بۆ کردن و هەر خێراش دووعایان گیرا بوو.. هەر هەمووویان بەڕووتی، لەسەر لووتکە و قەدپاڵی شاخەکان، لە بەر بارانی مژدەبەخشی ڕۆحدا، چەند شەو و چەند ڕۆژ وەستان.. ئەوانەی مردن بەپاکی و ئاسوودەیی مردن.. ئەوانەی مانەوەش، بەپاکی و سەربەرزی مانەوە.. دوای ئەو بارانە پیرۆزە، بەلێشاو ڕوویان دەکردە شاخ و کێو.. بەقسەی بەڕێوەبەری دایەرەی پۆلیسی «قەڵاچۆکردنی تاوان»، ژمارەیەکی زۆر لەوانەی وەکو «برووسکە» وابوون، چوونەتە ڕیزی یاخییەکان.. وادیار بوو لەولاش هەستیان بەو دیاردەیە کردبوو، بۆیە لێپرسراوێکی گەورە بەمەبەستی پاراستنی ئابرووی شۆڕش، لە چاوپێکەوتنێکی ڕادیۆییدا وتبووی:

ـ مەرج نییە ئەوانەی ڕابردوویان لە یەکەتر دەچێت، داهاتووشیان هەر لە یەکتر بچێت.

ئەم ئەگەرچی ناوی کەسی نەهێنابوو، بەڵام خەڵک دەیانزانی مەبەستی لە کێیە، چونکە ئەو ڕۆژانە خەڵک لە «برووسکە» زیاتر بیریان لە هیچی تر نەدەکردەوە.. هەموو ڕووداوێ، هەموو جووڵەو هەڵسوکەوتێ، هەموو قسەیەک، ئەمی بیردەخستنەوە.. ناهەقیشیان نەبوو وا لەو لێپرسراوە تێبگەن، چونکە ئەم لە کاتی قسەکانیدا، ئاماژەی بە کتێبی ( ١٨)ی برۆمێر.....»ی «مارکس» کردبوو.. وتبووی:

ـ مارکس لە سەرەتای ئەم کتێبەیدا نووسیویەتی، هیگل دەڵێت: هەموو ڕووداو و کەسەکان دوو جار لە مێژوودا دەردەکەون.. دەبوایە بشیوتایە یەکەمجار بەتراژیدی و دووەمجار بەکۆمیدی.

هەروەها هەموو ئەو نموونانەشی هێنابووەوە، کە «مارکس» بۆ ڕاستی و درووستی قسەکانی هێناویەتیەوە، بەڵام ئەوان گوێیان لە هیچ قسە و باسێ

نەدەگرت.. هەرکەسە و پەلەی ئەوەی بوو ڕۆژێ زووتر ڕابردووی ڕەشی خۆی بسڕێتەوە و ناوبانگ پەیداکات.. هەر کەسێ یەک تۆز گومانی لە ڕابردووی خۆی بکردایە، سێ و دووی لێ نەدەکرد و خۆی دەگەیاندێ.. هەرزەکار و مەرزەکاریش دەچوون.. ژمارەی شۆڕشگێری لووسکە دەقات زیادی کرد.. هی وا هەبوو شەو بەبێ دایک و باوکی نەیدەوێرا بچێت میزەکەی بکات، کەچی حەماس وایلێکرد شەو لە ئەشکەوت بکاتەوە و بە نوێژی نیوەڕۆ دابەزێتە ناو شار و ئەفسەر و سەرباز بە پێش خۆی بدا.

ئەو دایک و باوکانەی لە ڕێبازی شۆڕش نەگەیشتبوون، نەیاندەوێرا ڕاستەوخۆ یەخەی «برووسکە» بگرن، بەڵام چی جنێوی سووک هەبوو بۆ نووسەرانیان دەنارد، کە ئاوا جگەرگۆشەکانیان هەڵفریواندن.. بەتایبەتی شاعیرەکان، چونکە چیرۆکنووسەکان داماوانە کوا هێشتیان وەکو پێویست ڕۆڵی خۆیان ببینن..!!

کچانی بێبن و بنداریش دەستە دەستە ڕوویان کردۆتە شاخ و کێو.. هەر ئەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان لەمەلا و لەولا ماچکرابێت، چاوێکی داگرتبێت، لەسەربان سەرەتاتکێی لەگەڵ کوڕەدراوسێدا کردبێت، خەوێکی بێئەدەبانەی دیبێت، داڵغەیەکی ناماقووڵی لێدابێت، درەنگە و زووەی لێ نەکردووە.. خۆ هەر کاتێ دایک و باوکیان، یان برا و کەسوکاریان ڕێگایان لێگرتبن، یان سووکە ناڕەزاییەکیان دەربڕیبێت، ئەوا خێرا وتەکەی «برووسکە» یان بۆ هێناونەتەوە، کە دەڵێت: «ئازادی وەکو منداڵ وایە، بەبێ هاوکاریی ژن و پیاو بەرهەم نایەت».. ئیتر نەیانتوانیوە دەم هەڵهێننەوە.

کچ و کوڕ بەجووتە لەپاڵ یەکتردا جەنگاون.. مەلەیان کردووە.. خۆیان شتووە.. کچان کوڕان و کوڕان کچانیان شتووە.. کچان بە قژ و مەمک کوڕانیان شتووە، بەبێ ئەوەی زەوقیان بزوابێت، یان هەستیان بە گۆڕانێ کردبێت لە خۆیاندا.. کوڕەشوان کاتێ دیمەنی وایان دیوە، وتوویانە: «ئای لە جوانیی وڵات و لە گەرمیی شۆڕش..!! ».. هەر خێرا ڕانەمەڕیان جێهێشتووە.. بەئومێدی ئەوەی ئەوانیش، ئاوا کچی شار بە قژی ئاوریشم و مەمکی قوت

بیانشۆن، چوونەتە ڕیزەوە.. خۆ هەرکاتێ گەیشتوون و لەگەڵیاندا ژیاون، ئەو ئارەزووەیان نەماوە.. هەر دەتوت ئەو شاخ و داخە نهێنییەکی تیایە، ئاوا حەزی جووتبوون لە نێر و مێدا ناهێڵێت..!!

پیاوانی ئاین چەندی دەیانکرد و دەیانکرد سەریان لێ دەرنەئەکرد.. نەیاندەزانی چ فتوایەک بدەن.. بە یەکە بە یەکەی کتێبە پیرۆزەکاندا چوونەوە، بەشکو لە کونجی یەکێ لەو هەمووانە شتێ بدۆزنەوە باس لە عاجباتیی وا بکات..!! ئەوان کە تێکەڵبوونی نێر و مێیان قەدەغەکردووە، لە ترسی ئەوەیە نەوەکا زۆڵ بخەنەوە و شیرازەی ژیان تێکبچێت.. ئەوان لە پاشاگەردانیی کۆمەڵگا دەترسن، بەڵام ئەوەتا ژنی ئەمسەری وڵات و پیاوی ئەوسەری وڵات تا بەیانی لە باوەشی یەکتردا دەنوون، بەبێ ئەوەی هیچ شتێکیش لەنێوانیاندا ڕوویدات.. مریشک و کەڵەشێر بوونایە، بەشی کێشوەرێ هێلکەیان بەرهەم دەهێنا..!!

سەرەتا جوتیاران زۆر نارەزاییان دەربڕی.. گلەیی و سکاڵایان لای دەیان سەرکردە کرد.. ئەوان لە دوو شت دەترسان.. لەوە دەترسان خوا غەزەبیان لێبگرێت و چیتر باران نەبارێنێتە سەر کێڵگەکانیان.. خۆیان و ماڵ و منداڵیان لە برسان بمرن.. لەوەش دەترسان کچانی خۆشیان چاویان لێبکەن، بۆیە تا بۆیان بکرایە نەیاندەهێشت پێ بخەنە ماڵەکانیان، بەڵام دوایی کە تێگەیشتن چۆنە، لای ئەوانیش بوو بە ئاسایی.. سەدان کچەجوتیاریش چوونە ڕیزەوە.. ژمارەی ئافرەت لە ڕیزی شۆڕشدا لە هی پیاو کەمتر نەبوو.. ترسیان لێهات ئەوەی ئەوان دەیکەن سەرپێچی بێت لە فەرموودەکەی «برووسکە»، چونکە ئەگەر ئەو مەبەستی لەو ژن و پیاوانە بێت، کە منداڵ و ئازادی بەرهەم دەهێنن، ئەوا ئەوان ناگرێتەوە، بەڵام تازە بڕیارێ بوو دابوویان، پەشیمان بوونەوەی مەحاڵ بوو.. ئەوان بۆ ناوبانگ و خۆپاککردنەوە هاتبوون، نەدەکرا جارێکی تر گوناه و کوفری وا گەورە بکەنەوە.. هەر زوو زوو «ئینجیل»یان بیر خۆیان دەخستەوە، کە دەڵێ: «ئەوەی سەیری ئافرەتێکی کرد، بۆئەوەی حەزی بچێتە سەر، ئەوا لە دڵەوە زینای لەگەڵدا کرد.. ئەگەر چاوی ڕاستت تووشی هەڵەی کردیت، ئەوا دەربێنە و لە خۆتی دوورخەرەوە، چونکە وا بۆ تۆ باشترە

ئەندامێک لە ئەندامەکانت لە دەست بدەیت، نەوەک هەموو جەستەت بخەیتە دۆزەخەوە. ئەگەر دەستی ڕاستەت تووشی هەڵەی کردیت، ئەوا بیبڕە و لە خۆتی دوورخەرەوە، چونکە وا بۆ تۆ باشترە، ئەندامێک لە ئەندامەکانت لە دەست بدەیت و هەموو جەستەت نەچێت بۆ دۆزەخ».

کوڕەشوان قژی کچی شاریان لێ بووبوو بە خوری.. مەمکیان لێ بووبوو بە گوانی مەڕ و سەبووریی خۆیان پێ دەدایەوە.. چی هەیە ئەوەندەی مەڕ لای شوان پیرۆز و مەحرەم..!! شوان دەستی بچێتە هەرچی، نایچێتە مەڕ، چونکە لە دایک و خوشکیشی نزیکترن لێیەوە.. شەوانەش هەر کوڕەشوانە و لە باوەشی کچێکی شاردا دەنووست.. دەستی لە قژی و دەمی بە مەمکیەوە دەگرت.. مڵچ و مڵچ و مڵچ.. لە خەویشدا هەر دەیانمژی.. ئەمە تاکە شت بوو کوڕی لادێ و کوڕی شار لە یەکتر جیابکاتەوە.. هەر ئەوەندە وازیان لەو خووەشیان بهێنایە، ئەوا بۆچوونەکانی «مارکس» لەمەڕ مەسەلەی نەمانی جیاوازی نێوان شار و لادێ، سەد لە سەد ڕاست دەردەچوون.. چەپەکان زۆر چوونە بنکڵێشەی شوانەکان، تا وایان لێبکەن واز لەو خووەیان بێنن، بەشکو دەمی ناحەزانی «مارکسیزم» بشکێنن، بەڵام ئەوان نەیاندەتوانی وا بەئاسانی وازبهێنن.. ڕاسترەوەکانی ناو شۆڕش ڕەخنەی توندوتیژیان لە چەپەکان گرت و بە «ئیرادەگەر» تاوانباریان کردن.. هەروەها ئەمەشیان کردە بەڵگەیەک بۆ ئەوەی، کە ئەوان هەمیشە پێش قۆناغی سەردەم دەکەون و ڕەچاوی باری خودی و بابەتیی کۆمەڵگا ناکەن.. ڕاسترەوەکان لە سەر هەق بوون، چونکە شوانەکان لەو هەموو مەڕوماڵاتی وا زۆر، تەنها ئەو قژ و مەمکانەیان بۆ مابووەوە، کەی ڕەوایە ئەم هەقەشیان لێ زەوت بکەن..!! ئەم بەرگرییەی ڕاسترەوەکان هەڵوێستی شوانەکانی بەهێز کرد و کەس بۆی نەبوو سووکە گلەییەکیان لێ بکات، هەر بۆیەش ژمارەی کوڕەجوتیار ڕۆژ بەڕۆژ لە ریزی شۆڕشدا زیادی دەکرد.

سەربازەکانیش کە بەم کارەی شوانەکانیان زانی، بنکەکانی خۆیان جێهێشت و پاڵیان پێدان.. هەر ئەوەندەت دەزانی لە ڕادیۆی شۆڕشدا هەواڵی خۆبەدەستەوەدانی لەشکرێک و دوان و سێیانت دەبیست.. هەمووی خوا خوای

بوو ڕۆژێ زووتر خـۆی بگەیەنێـتـە باوەشی کچـێکی ڕووت و مـاندووبوونی ئەو هەمووساڵەی شەڕی بحەسێنێتەوە.

دەسـتی شـۆڕش دەگەیشـتـە هەمـوو لایەک.. خەڵک دووعـا و سـێعا و دەعـا و سـەدان عـایان بۆ «برووسکە» دەکـرد.. هـەر خـۆشـیـان دەیانوت: «باشـە بۆ هـەر برووسکە..؟! ئەی نووسەرەکان..؟! یاخوا ماڵی ئەوانیش ئاوابێت».

دەوڵەت لەوەتەی هەیە ئاوا شـپرزە نەبووە.. ڕۆژ بەڕۆژ هێـزی ئەو کـەم و هـی شۆڕش زیادی دەکرد.. سـەرۆکی خاوەنشکۆ دەیان پیاوی مـاقووڵی خۆی ناردە لای سەرۆکی شۆڕش، بەشکو گفتوگۆی لەگەڵدا بکات، بەڵام سەرۆکی شۆڕش وتبووی:

ــ گفـتـوگۆ مـەحاڵە.. لەوەتەی فـامـی سیـاسیم کـردۆتەوە بەدوای تۆوەم.. لێت دەپاڕێمـەوە.. دەستت مـاچ دەکـەم.. بە شان و باڵتدا هـەڵدەدەم، کەچی تۆ مێش مـیــوانت نەبووە.. ئـەوا دەزانـی کـۆتاییـتـە، داوای گـفـتـوگـۆ دەکـەیت..؟! بڕۆ نەمکردووە و نایکەم.

دەڵێن خـاوەنشکۆ خـۆیشـی هەوەسـی بـزوواوە و شـەو و ڕۆژ خـەونـی بەو شـوێنەوە دیوە.. لە ڕووشـی نەهاتووە وەکـو کـەسـێکی ئاسـایـی بچـێـتـە ڕیزی شـۆڕش.. بۆ ئەو جـوان نیـیـە، دوای ئەو هەمـوو سـاڵە.. دوای ئەو هـەمـوو سـەرکەوتنە لەم شـەڕ و لەو شـەڕ، تازە بەتازە لە سـەرەتاوە دەست پێبکاتەوە.. دەڵێن خــۆزگــەی بەو شــوانانـە بردووە، کــەشــەو تا بـەیانـی مــەمکـی ئەو ناسکەکچـانەیان بەدەمـەوەیە.. هەمـوو ڕاوێژکـارانی خـۆی کـۆکـردۆتەوە، تا تەگـبـیـرێکی بۆ بکەن، ئاخـۆ بچـێت باشـە یان بمێنێـتـەوە..؟! ئەوانیش دەسـتـەودامـێنی بوون کـە نەچێت، چونکە هەرکێ چووبێت بۆ ئەو شـوێنە لە پیـاوەتیـی کـەوتووە.. لە کـاتێکدا دەوڵەت لە نان و ئـاویش زیاتر پێـویسـتـی بە نەوەیـەکی تازەیە، کـە بە ڕەپتـەتەی ئەو بەرهەم هـاتبن.. ئەوان بـەم قـسـەیان ترسێکی تریشیـان خستە دڵی سەرۆکەوە.. ئەم تا ئەو کاتە نەیزانی بوو مرۆڤ لەو شـوێنە لە پیـاوەتیی دەکەوێت.. ئـەم ئەگەرچی باوەڕی وابوو هەزار شـوێنی ئاوا کار لە هـی ئەو ناکەن و ناتوانن قولانجێ لە سەرەکەی کەم بکەنەوە، بەڵام لە هـی خـەڵکەکـە دەترسـا.. لـەوە دەترسـا ئیـتـر کـەس منداڵی نەبێت، بۆیە

جارێکی تر پەنای بۆ سەرۆکی شۆڕش بردەوە.. پێی وتبوو:

ـــ تۆ داوای بکە و من جێبەجێی دەکەم.. تاکە مەرجم هەر ئەوەیە، با جارێکێ تر ئەو خەڵکە بگەڕێنەوە ماڵ و حاڵی خۆیان.. وا بڕوات ژنان منداڵیان نابێت.. ئەوە لای خۆی لە هەوڵی ئەوەدام کارێ بکەم پیاویش بیبێت.. خۆت دەزانیت هێشتا یەک لە سەر دەی ئەو شەڕانەم نەکردووە، کە بڕیارە بیانکەم. بە قوربانت بم وا بڕوات کەس نامێنێت شەڕم بۆ بکات.

ئەم ئەو هەمووەی ڕستبوو، کەچی سەرۆکی شۆڕش تەنها بە سێ پیتی «ش. د. خ» وەڵامی دابۆوە.. ئیتر ئەم خۆی دەیزانی ئەو سێ پیتە کورتکراوەی «شۆڕشمان درێژخایەنە»یە و لە هەموو شتێ زیاتر پێێ پەست و نیگەران ئەبوو.. لە داخا شێت و هار بووبوو.. پوازەکەی دەگرت بە دەستەوە و دەیوت:

ـ بەدوو شت دادەمرکێتەوە.. بەچوونم بۆ ئەوێ، بەوازهێنانی ئەو خەڵکە لەو خووەی گرتوویانە.

هەرچەند هێزەکانیشی کەم دەبووەوە، ئەوەندە هەوەسی زیادی دەکرد و لە داخا پەنجەکانی توند توند دەکرۆشت.. تەواو ئارامی لێ هەڵگیرابوو.. هەرچەندی دەکرد و دەکۆشا بیری خۆی بەرێتەوە، نەیدەتوانی.. پێیان وت:

ـ لە هەرکوێ حەز دەکەیت جوانترین ئافرەتت بۆ دەهێنین، بەس واز لەوێ بێنە.

ئەم هەر نەیتوانی.. پێشی وتن، کە یەکە بەیەکەیان دەخاتە تێزابەوە، ئەگەر چارەسەرێکی بۆ نەدۆزنەوە.. ڕاوێژکارێ پێشنیاری کرد، کە چەند پیاوێکی سەرۆک بەنهێنی بچن بۆ ئەوێ و بە کامێرای تەلەڤزیۆن شوێنەکەی بۆبگرن... سەرۆک ئەمەی بەدڵبوو.. هەر خێرا کۆمەڵێک خۆیان گەیاندە ئەوێ و دوو شەو و دوو ڕۆژ خەریک بوون.. خاوەنشکۆ شەو و ڕۆژ بەدیار ئەو فیلمانەوە دادەنیشت و دەستیشی هەر بە گەڵوگونیەوە بوو.. ئاگای لە هیچ کاروبارێکی دەوڵەت نەما، تەنانەت لە سێ ژەم ژەمێکی بەتەواوی بۆ نەدەخورا.. دارودەستەکەی ترسیان لێهات و لە دەرگایان دا، بەشکو بیکاتەوە و چارەسەرێ بدۆزێتەوە.. دەترسان لەپڕ شۆڕشگێڕان بەسەر کۆشکدا بدەن و ونجڕ ونجڕیانکەن، بەڵام ئەم گوێی لەوان نەدەگرت و چاوی لە تەلەفزیۆنەکە

نەدەترووکاند.. ئەوەندەی سەیرکردن تا تەواو لێیان بێزاربوو.. هەرچی فیلم و ڤیدیۆ و تەلەڤزیۆن هەبوو لەو کۆشکە، هەر هەموویانی بەلەقە لەتوکوت کرد.. وێنەی گورگێکی هار و برسی هاتە دەرەوە.. چاوەکانی سوور سوور هەڵگەڕابوون.. خۆی بە دار و بەردا دەکێشا.. پێی وتن:

ــ تەواو.. لەوزەمدا نەماوە.. ئەمجارە پرسیارتان لێناکەم ئاخۆ بچم، یان نا.. دەمەوێت پێم بڵێن چۆن بچم بەبێ ئەوەی کەسیش بمناسێتەوە..؟!

هەر خێرا کۆمەڵێک لەو هونەرمەندە کارامانەی ماکیاج بۆ ئەکتەرانی فیلم دەکەن، هێنایان وپێیان وتن، کە سەرۆک بکەن بە کوڕەشوانێکی هەژار.. دەمودەست کردیان بە کوڕەشوانێ، کە دەتوت هەموو ژیانی هەر لە لادێ و لەگەڵ مەڕومالاتدا بەسەربردووە.. لەماوەی شەو و ڕۆژێکدا خۆی گەیاندە ئەوێ.. شەو لە باوەشی جوانترین کچدا پاڵکەوت.. هەر خێرا ڕەنگوڕووی کچە گۆڕا.. هەستی کرد وا مەمکی لە دەمی کوڕەشوانی تازەدا تەزوویان پیادادێت.. وردە وردە تەزووەکە هەموو گیانی دەتەنێتەوە.. تا کاتێکی زانی وا کوڕەشوان دەینووسێنێت بەخۆیەوە و بەیەکەوە لکاون.. تا بەیانی نەیانتوانی لە یەکتر بترازێن... بەیانی کە کچە هاتەوە هۆش خۆی و بەهەر چوار لادا ڕوانی، بینی وا هەر دوو دوو بەیەکەوە لکاون.. هەمووی هەر لەشی قورس بووە و جووڵەی بۆ ناکرێت.. ڕۆژانی تر زۆر بەگورجی لە خەو هەڵئەستان و هەر کەسە و بۆ ئیشی خۆی.. دواییش هەر مەفرەزە مەفرەزە دەچوون بۆ شەڕ.. وا ئەم بەیانییە کەس تاقەتی هەڵگرتنی چەکەکەی نییە.. هەمووی ورەی بەرداوە و ئەژنۆی دەلەرزێت.. لە هەموو لایەکەوە هاوار بەرز بووەوە:

ــ ئاشبەتاڵە.. ئاشبەتاڵە..!!

خاوەنشکۆ لە پایتەختەوە و لەسەر تەلەڤزیۆن سەری دەرهێنا.. داوای لە خەڵک دەکرد بێنەوە ماڵ و حاڵی خۆیان.. با لەمەودوا لە کەروێشک زیاتر بایەخ بە زاوزێ بدەن.. هاوکات سەرۆکی شۆڕش داوای گفتوگۆی کرد، بەڵام کەس گوێی لێنەدەگرت.. تاکە شتێ، کە بۆی مابووەوە ڕادیۆکەی شۆڕش بوو.. تیایدا هاواری دەکرد:

ــ ئێ خۆ من هیچی خراپم بۆ ئەم نیشتیمانە ئازیزە ناوێت، بۆچی گوێم

لێناگرێت..؟! ئاخر بۆ..؟! ئێ تووخوا بۆ.. بۆ.. بۆ.. بۆ....؟!

ئەو هەموو «بۆ»یە چی بوون سەرۆکی شۆڕش بە سەریەکەوەی دەوتن، ئاوا بۆمبائاسا لەناو سەرتدا تەقینەوە، ئەو ژاوە ژاوەیان تیادا پەیدا کرد و بەرچاویان تاریک کردیت..؟! ئەوەندەت نەزانی خۆت لەسەر لووتکەی شاخێکی بەرز بینیەوە.. ئەوە چی تۆی هێنایە ئەم ناوە..؟! تۆ چەکدار نەبوویت، قوتابیی زانکۆ بوویت.. ئەی چی دەکەیت لێرە..؟! ئەوەتا لە پشت سەرکردەی شۆڕش وەستاویت... هەر هەموویان ڕادەکەن.. هەرکەسە و تفەنگەکەی.. دەمانچەکەی.. فیشەکەکانی.. قایشوقرۆشی پشتی.. هەرچی بەردەستی دەکەوێت، فڕەیدەدات و بەرەو خوار، بۆ لای زیلەکان پەلەپرووزێیەتی.. هەر کەسە و پەلەی ئەوەیەتی زووتر بگاتەوە ناو شار.. تەنها تۆ و سەرۆک لە شوێنی خۆتاندا جووڵە ناکەن.. تۆ لە پشت سەرۆک و سەرۆک لە پشت مایکرۆفۆنەوە وەستاوە و بانگەواز دەکات:

ـ بڵاوەی لێمەکەن.. بڵاوەی لێمەکەن.. ئاشبەتاڵ نییە.. گفتوگۆیە.. گفتوگۆیە.

چ ڕۆژێکی ڕەشە..!! کەس گوێ لە سەرۆک ناگرێت.. ئەوانەی بەئاوات بوون لە نزیکەوە بیبینن.. دەستەکانی.. ئەملا و ئەولای.. هەر هیچ نەبێت پێڵاوەکانی ماچبکەن و تێر تێر بینووسێن بە سنگیانەوە و هەواو بۆن و بەرامەکەی ناوی هەڵمژن.. ئەوانەی گرێکوێرەی ئەو پرسیارە هەراسانی کردبوون، ئاخۆ سەرۆک کەسێکە وەکو خۆیان.. وەکو ئەوان پێدەکەنێت.. پاڵدەکەوێت.. قرقێنە لێدەدات.. دەپژمێت.. چڵمی دەسڕێت، تارات دەگرێت، یان جیایە..؟! وا بەلایدا تێدەپەڕن و ئاوڕیشی لێنادەنەوە... ئەوان قەیناکا نەفامن.. ئەی ئەو هەموو سەرۆکزادە و بەگزادە و سەیدزادە و شێخزادە و مەلازادە و چەپڕەوزادە و ڕاستڕەوزادە و حەرامزادەیە بۆ کوێ چوون..؟! بەوە باشە سەرۆک لە هەموو ژیانیدا ئاوڕی لە دواوەی خۆی نەداوەتەوە، ئەگینا ئەیزانی کەسی بەدواوە نەماوە.

ئای ئای..!! خۆ ئەوە مایکرۆفۆنەکەی بەردەمیشی سووک سووک خۆی لێ دەدزێتەوە..!! لەپێشدا بەنەرمەغار و دواییش تا تینی تیا بوو ڕایکرد.. باڵی

گرت.. بەرەو کوێ..؟! بۆ لای زیلەکان.. ئەویش خۆی بەدەستەوە دەدا.. هەر ئەو نییە، هەموو ئامێرەکانی تری ئێستگەن.. هەر هەمووی باڵی گرتووە.. ئەوا سەرۆک بەدوای مایکرۆفۆندا ڕادەکات و هەر هاوارهاواریەتی.. بەلاتەوە جوان نەبوو تۆ بوەستیت و ئەم بە دوای مایکرۆفۆندا ڕابکات.. دوای کەوتیت و پێت وت:

ــ گەورەم تۆ بوەستە ، من.....

ئەم گوێی بەقسەی تۆ هەر نەدا.. دەستی بە جامانەکەیەوە گرت و سوێسکەئاسا بۆی دەرچوو. ڕەنگە لەمەوپێش پێشبینیی ئەم کارەساتەی کردبێت.. زانیبێتی ڕۆژێ دەبێت پێویستی بە ڕاکردن بێت، بۆیە تاکە سەرۆکە لەم کێشوەرەدا ورگ و گیپاڵی لە خۆی نەکردۆتە بار.

ئەرێ ئەو هەموو چەکە چیین لەو ناوە فرێدراون، وا لە ژێر قاچەکانی سەرۆکدا قرچە قرچیانە..؟! جار جاریش لێیان هەڵدەنووتێت و بەپشتدا دەکەوێت..؟! بەوە باشە هەر خێرا هەڵدەستێتەوە، ئەگینا دەمێک بوو مایکرۆفۆن خۆی بە شاردا کردبووەوە.. لەم ئانوساتەدا هاوار لە خەڵک بەرزبووەوە:

ــ ئەها سەرۆکیش خۆی بەدەستەوە دات..!! سەرۆکیش خۆی بەدەستەوە دات..!!

کەس ئاگای لە ڕاستیەکان نییە، تۆ نەبیت.. خۆت بەم سەرەوە ئاگات لە هەموو شتێکە.. ئەم خەڵکە وەکو ئەو ڕێویەیان لێهاتووە، کە تەڵە کلکی قرتاندبوو، حەزی دەکرد هەرچی ڕێوی هەیە بێ کلک بمێننەوە.. بەدەست خۆت نەبوو نەتتوانی چاو لە ڕاستی بپۆشت و بەرگری لە سەرۆکی خۆت نەکەیت.. تا تینت تیابوو هاوارت بە سەردا کردن:

ــ ئەرێ ئێوە ویژدانتان نییە..؟! ئەرێ ئێوە نامرن بوختان بە سەرۆکی خۆتان دەکەن..؟! ئێوە نامرن لەم ڕۆژگارەدا ڕووتان لە سەرۆکی ئەولا و پشتتان لە هی خۆتان کرد..؟! ئەوە نابینن بەشوێن مایکرۆفۆندا ڕادەکات..؟!

ئا ئەوەتا مایکرۆفۆن گەیشتە لای زیلەکان و گورج خۆی هەڵدایە دواوەی یەکێکیان.. هاکە سەرۆک دەستی لە قورگی گیرکرد و هێنایەوە سەر لووتکەی

شاخ.... ئای ئای..!! ئەوە چی بوو..؟! ئەوە چاوی تۆ ڕەشکەوپێشکە دەکات، یان سەرۆک خۆی بوو، خۆی هەڵدایە دواوەی زیلەکە و قنج لە دواوەی مایکرۆفۆنەکەوە دانیشت..؟! ئەوا زیلەکەش خرایە گەڕ و بەرەو شار ملی نا.. سەرۆک و هەموو ئەوانەی لەدواوە لەگەڵی دانیشتوون، دەستیان کرد بە چەپڵەڕێزان.. ئەی هاوار ئەو هەموو لۆتی و شەقاوە و چەقۆکێش و شایەرە چین لە گەڵ سەرۆک دانیشتوون..!! خۆ ئەوە سەرۆکە گۆرانی دەڵێت و ئەوانی تر کۆرس ئاسا بۆی دەسەننەوە:

هەی بەلار و بەلار و بەلارەوە

کۆرس: توو سەری باوکت وەرەماڵەوە

سەرۆک: قەڵاکەی هەولێر ژێرەکەی بۆشە

ماچی گەورەکچ بەپێوە خۆشە

ئا ئەمە ئەو ڕۆژەیە، کە سەرۆک لێی دەترسا و دەیوت:

ــ لە ژیانما لە هیچ نەترساوم، بەڵام لەو ڕۆژە دەترسم گەلەکەم ڕاستیی لە بەردەمابێت و نەیبینێت.

ئێستا لە تۆ زیاتر کەس ڕاستییەکان نابینێت.. تەنانەت سەرۆک خۆیشی لێیان بێئاگایە.. هەر تۆ دەزانیت بۆچی سەرۆک گەیشتە دواوەی زیل.. تەنها تۆ دەزانیت ئەو لە داخا گۆرانی دەڵێت.. ئەو لەوەتەی هەیە حەزی لە سروود و ڕقی لەگۆرانییە... دڵی هەر بە «ئەنتەرناسیونال» و «ئەی ڕەقیب» دەکرایەوە، ئێستا لەداخا گۆرانیی «بەلار و بەلار» دەڵێت.. ئاخ..!! لەو ڕۆژەی تێیکەوتن..!! ئەو کچەتیوە سەربەگۆبەندە پانۆڵەی لە بێخەوە هەڵتەکێت، چۆن جیاوازیی لە نێوان شوان و خاوەنشکۆدا نەکرد، ئاوا ئەم شۆڕشە مەزنەی تواندەوە و ئاشبەتاڵی پێکرد..؟! ئەوە سەدان ساڵە خەڵک دەڵێن: «دار پوازی لە خۆی نەبێت هەزار ساڵ دەژی»، بەبێ ئەوەی کەسیش بزانێت «پواز» چییە.. ئەوا دەرکەوت و بۆ هەموو دنیا ڕوون بووەوە، کە «پواز» چییەو چ ئەندامێکی بەکاری جەستەی خاوەنشکۆیە..!!

ئەوە بۆ کەسێ نییە چۆڕێ ئاوی سارد بدات بە سەرۆک و بە پەڕۆیەکی شێدار دەموچاوی بسڕێت..؟! بەشکو بێتەوە هۆش خۆی و فریای خۆی

کـەوێت.. چی گـەورە و بچـووک هەیە ئاوی ئامـوون و توونی باباچن.. وەکـو نووسـینی سـەر تەختـەڕەش بسـرێنەوە، بەڵام سـەر پەنجـە تووتەی سـەرۆک نەڕووشێت.

زیلەکەی سـەرۆک لە دواوەی دانیشـتووە لە هەموویان خێراتر ملدەنێت.... ئەوا هـێندە دوورکـەوتەوە لـە چاوان ون بـوو.. تازە تۆ دوای سـەرۆک ناتـەوێت هیچ شـتـێکی تر ببـینیت.. بەچەپۆک دەکـەویتـە دەمـوچاوی خـۆت، بەشکو کوێربیت و لەسەر لووتکەی ئەم شاخـە ڕەق بیتـەوە.. کوێر بیت باشتـرە لەوەی ڕێگەی شار بگریت.

ـــ ئەرێ کــاکــە تۆ چیـیت لێ قــەومــاوە، ئاوا بـە دەمــوچاوی خــۆتدا دەکێشیت..؟!

سـەرت هەڵبڕی.. «سـیروان» بوو بە سـەر سـەرتەوە وەستـا بوو.. داخـی دڵی خۆتت بەو ڕشت:

ـ لە داخـی ترسنۆکی وەکو ئێوە، کە ئاوا سـەرۆکی خۆتان جێهێشت.

ئەم بەسووکی دەستی خستە سەر شانت و پێی وتی:

ـ هـەر چیـمـان پـێ بڵـێیت، هەقی خـۆتە.. تۆ شـایانی ئەوەیت پێت بوترێت سەرۆک.. تۆ ئەمشەو سەلماندت، کە شتێ نییە ناوی خێو بێت.

وردە وردە دەهاتیتەوە هۆش خـۆت.. پێش ئەوەی سـەیری هـەر شـتێ بکەیت، بەبـەژن و باڵای خــۆتـتـدا ڕوانـی.. ئەوەتا لـە ســـەر کــورســـیی ناوەڕاســـتی حـەوشـەکـەدا، هەر بەجلی خـەوەوە دانیـشـتـوویت.. کـتـێـبـەکـەشت هەر بە دەستـەوەیە... ئەمە «سـیروان»ـە بە تەنیشـتـتەوە وەسـتـاوە و ئەمـانەش ئەوانی ترن، وا لە پەنجـەرەکـەوە سـەیرتان دەکەن.. ئەوە خـەیاڵ بـۆ کوێی بردبووی..؟! چی بوو ئەو خـەونە ترسـناکە..!! کەواتە ئەمشـەوت لە دەرەوە کردۆتەوە و هـەر ئاگاشت لێ نییە.. بەڕاستی ئازایەتی وا هـەر لە ترسنۆکی وەکو خۆتدێت..!!

* * * *

لەو ڕۆژەوە بێـجگە لە تۆ کـەس بیـری لە خـێـو نەدەکـردەوە.. ئاخـر تۆش

پێویستت بە کەسێکە لە خۆت ترسنۆکتر بێت، تا ئازایەتیەکی لەوەی تۆ گەورەتر بنوێنێت.. وانەبێت نە ترست لە خێو دەشکێت و نە ناوبانگیش پەیدا دەکەیت.**

---

* مەبەست لەو وتەیەی «نیتشە»یە، کە لە زمانی «زەردەشت»ەوە دەریدەبڕێت: «ئێوە کاتێ ئارەزووی بەرزبوونەوە دەکەن، لە سەرووی خۆتانەوە ڕادەمێنن، بەڵام من بەرز بوومەوە.. تا وام لێهات بڕوانمە ژێر قاچی خۆم.» کتێبی «زەردەشت ئاوا دەدوا».

** ئەم چیرۆکە لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٥ لە شاری «مووسڵ» نووسراوە و لە بەهاری ساڵی ١٩٩٤دا دەسکاریی کراوە. لەبەر ئەو گۆڕانکارییە زۆرەی بەسەر ناوەرۆک و شێوەی چیرۆکەکەدا هات، ناچار بووم مێژووی گۆڕانکارییەکە بە مێژووی نووسینی بزانم.

(هەموو ئەو قوتابیانەی لە بەشی ناوخۆی ژمارە ١٥دا بوون، وایان دەزانی خێوی تیایە.. بەتایبەتی دوای ئەوەی یەک دوانێکیان دیان و بوورانەوە و نەخۆشکەوتن. ئەم ڕووداوانە هەوێنی نووسینی ئەم چیرۆکەن. تەنانەت بەشی ناوخۆکەش، کە لە بنەڕەتدا کەنیسەیەکی کۆنبووە، بەو شێوەیە کە وەسف کراوە.. هەموو پاڵەوان و ڕووداوەکان، بێجگە لە بینینی خێوەکە ــ ئەوە ئەگەر بەڕاستی دیبێتیان ــ زادەی خەیاڵی نووسەرن، بەڵام ئەگەر کەسێ، یان لایەنێ خۆی لە چیرۆکەکەدا بدۆزێتەوە، ئەوە گوناهی لە ئەستۆی خۆیەتی.. من ویستوومە چیرۆک بنووسم ، نەک مێژوو ، بۆیە مەبەستم هیچ کەس و لایەنێکی دیاریکراو نییە.)

# خوێنی کونەپەپوو

کـە کـارەبا بـڕا و گڵـۆپەکان کـوژانەوە، من خـەریکی بۆیـەکردنی نینـۆکەکـانم بووم.. ئـەمـڕۆ هــەر دەتوت لە غـەیبــەوە پێیـان وتم شـەو کـارەبا دەبڕێت، چووم لای «شیلان»ی هاوڕێم قژمم لەسەر تازەترین مۆدێل بڕی و ماکیاجێکی جوانم کرد.. بلووز و تەنووره تازەکەشم لەگەڵ ڕەنگی گواره و تۆقە و پێڵاوەکانم زۆر جـوان ڕێککەوتبـوون.. دەشـــمــزانی وەکـو هەمــوو ئێــوارەیەکی تر لـە بەردەم کتێبخانەی (دواڕۆژ)، لەگەڵ هاوڕێکانی دەوەستێت، بە لەنجەیەکی کوڕکوژانە بە بەردەمـیدا ڕۆیشتم، گـوایە هـەر نەشـمـدیوە.. مـەگەر هـەر خـۆم بزانم چۆن هەموو ناو دەمـارەکانیم پڕکرد لە خۆشەویستی، لە سۆز، لە حـەز و شەهوەت.. ئەوەنـدەی تر ئۆقـره و ئـارامم لێ بڕی.. بـاوەڕناکــەم لەوە زیـاتر بتــوانێت دان بەخـۆیدا بگرێت.. هاکـە بەبیـانووی چراکـە هـات و لە دەرگـای دا.. هـەر خـۆم دەزانم بە چ شـێـوەیەک دەرگای لێ دەکەمەوە. حـەفتـەی پێشـوو ملم بشکایە و خــۆم لێــمبکردایەتەوە.. من چـوزانم ئەوە.. ئەگــەر دەمــزانی چۆن بەڕاکــردن نەدەچووم، بـەڵام خـۆ باشـیش بـوو نەچووم.. بەبێ پیـلان و لەناکـاو چیـیم پێ بوتایە..!! ڕەنگە لە شـپـرزەییدا زمـانم تـەتەڵەی بکردایە و نەمـتـوانیـایە ئەوەی مـەبەسـتمە مـەیسـەرم بکردایە.. باشتـر نەچووم.. ئەمڕۆ بەم هەموو جـوانییـەوە بمبـینێت، شـتـێکی ترە.. حـەفتـەیەکە خـۆم ئـامـاده دەکـەم.. چۆن دەرگـای لێ بکەمــەوە و چی بڵــێم و چۆنـی بڵـێم.. هەرکـە لـە دەرگـای دا، خـێـرا یەکێ لە چراکـان هەڵدەگـرم.. بەوەش بـاشـە لای دەرگـاکـەوە نزیکم.. هـەر خـێـرا بەبێ ئەوەی مۆڵەتی دایکم بدەم لە شوێنی خۆی بجووڵێت؛ دەستی بۆ درێژ دەکەم و خــۆم دەگـــەیەنمە پشـت دەرگـــای حـــەوشـــە.. لەوێ هەڵوێســتــەیەک دەکــەم.. بەنازێکەوە، یاخود وەکو خۆیان دەڵێن بەخۆتەسککردنێکەوە دەپرسم:

ــ کێیە..؟

ـ خۆمانین.. هاوارم.

ـ هاوار کێیە..؟ کەس ناناناسم بەم ناوە.

ـ هاواری دراوسێتان.

لە دایکم دەپرسم:

ـ دایکە دراوسێی ناو هاوارمان هەیە..؟

جا بۆ دایکم ئاگادار دەکەمەوە.. بۆچی ئەم دەورژووێنم، ئەگەر هات..؟! نا نا هەر بە خۆی دەڵێم:

ـ ببورە ناتناسم..!

ـ هاوار، کرێچییەکەی ماڵی مام سابیری نانەوا.

هیچ ناڵێم.. ناڵێم: «ئێ ئێ باشە زانیم»، با وانەزانێت بیرم لێی کردۆتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەک دەرگای لێدەکەمەوە، کە وابزانێت نەک هەر نایناسم، بەڵکو دەشترسم.

چراکە بەرزدەکەمەوە، گوایە دەمەوێت دەموچاوی ببینم، بەڵام لە ڕاستییدا وانییە، دەمەوێت خۆمی پیشاندەم.. دەمەوێت ئەو من ببینێت.. قژە کارێکەم، چاوە سەوزەکانم، باڵا بەرزەکەم، یەک بەیەکیان لە نزیکەوە ببینێت، تا دەرفەت بۆ قسە نەهێڵمەوە.. هەر بەبێ چەندوچوون باوەشم پیادا بکات و بەخۆیەوەم بنووسێنێت.. دەمەوێت ڕێگای چەند مانگ و چەند ساڵ کورتکەمەوە و بیکەم بە چاوترووکانێ.. من ڕقم لەو قسانە هەستاوە و قێزیان لێ دەکەمەوە، کە هەموو کوڕ و کچێ تا دەگەن بەیەک، بە یەکتری دەڵێن.

سێبەرەکانمان، کە بەسەر دییوارەکەوە بەگەورەیی دەرکەوتوون، لەپێش خۆمانەوە، هەر بەبێ ئەوەی شەرم بکەن، یان سڵ لە شتێک بکەنەوە، ئاوێزانی یەکتر دەبن و یەکتر ڕادەمووسن.. ئێمەش چاویان لێ دەکەین.. نەخێر، من وا خۆم پیشان نادەم، کە حەزم لێیەتی، بەڵکو وێنەی کچێکی سەنگین، بەشەرمەوە خۆمی لە دەست ڕادەپسکێنم.. ئەوەندە هەیە ناقیژێنم، نایکەم بە زریکوهوڕ، گوایە پیاوێکی نەدیو و نەناس پەلاماری داوم، نەبادا لێم بتەکێتەوە و خەڵکم لێ کۆبێتەوە.. هەر خۆم دەزانم چۆن چۆنی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکەم.. تاکە شتێ، کە نابێت بیرم بچێتەوە ئەوەیە، لە ئاست کوڕان

جارێکی تر خۆم ساکار پیشان نەدەم.. تا بۆم بکرێت شتیان لێ ئاڵۆز دەکەم و سەریان لێ تێکدەدەم.. جاران نەفام بووم.. زۆریش نەفام بووم.. ئەوەی ئێستا دەیزانم، ئەوسا بمزانیایە، ئاوا سووک و ڕیسوا نەدەبووم.. ئەو فیز و لووتبەرزییەم باشترە لەوەی وەک جاران دڵی خۆمم کردبووە کاتژمێری قەد دیواری کەنیسە، هەموو کەسێ بەئاسانی دەیتوانی بیخوێنێتەوە.

لای هەموویان بەقسەخۆش و نوکتەچی ناسرا بووم.. هەندێ لە کوڕان، گوایە هەر لەبەرئەوە خۆشیان دەویستم، کە وەکو کچانی تر شەرمن نیم و پیاوانەم.. ڕۆژێکیان «سالار»ی فیزیا پێی وتم:

ـ ئەوەی لەگەڵ تۆ بێت، قەت پیرنابێت.

نازانم چۆن شەرمم نەکرد پێم وت:

ـ دەڵێی چی هەر بەیەکەوە بژین، بۆئەوەی لە ژیانتدا پیری بەچاو نەبینیت..؟!

چ وەڵامێکی ئامادە و لەبەرکراوی داماوە:

ـ چۆن قسەی وا دەکەیت، تۆ وەکو خوشکم وایت..؟!

ئەوە بۆچی ئەوەندە دەبەنگ بووم لە درۆ و دەڵەسەیان نەدەگەیشتم..!! من خۆشەویست بووم.. ناو هەر ناوی من بوو.. ڕەخنە، بگرە جنێوی سووک سووکیش بۆ ئەو کچانە دەنێردرا، کە لەگەڵ کوڕان قسە ناکەن، یان بەپارێزەوە دەیکەن.. ئێواران لەگەڵیان نایەن بۆ پیاسەی بەردەم زانکۆ.. ڕۆژانی هەینی لەگەڵیان ناچن بۆ دارستان، کەچی هەر ئەوەندەم دەزانی دەیانوت:

«ـ سازگار و سمکۆ یەکتریان خۆشدەوێت.»

«ـ پەیمان و هەڵۆ ڕۆحیان بەسەر سەری یەکەوە دەردەچێت.»

«ـ شیلان و ڕێبوار هەموو شتێکیان بڕاندۆتەوە.»

«ـ بەرزان ئەڵقەی کردۆتە پەنجەی ناسک.»

ئەوان، بەتایبەتی مارکسییەکان بەرامبەر بەو جورئەتەی من سەرسام بووبوون.. گوایە من تاکە کچی هۆشیارم، بایەخ بە ماکیاج و خۆڕازاندنەوە و ڕواڵەتکاریی بۆرژوایانە نادەم.. تاکە کچم سنووری نێوان خۆم و پیاوم

سـڕیوەتەوە، کـەچی دەرکـەوت هـەر ئەو کـچانـە پەسـەندبوون، کـە حـورمـەت و عەورەتی خـۆیان پاراسـتبوو.. یەکێ لەوانەی حـەزی دەکرد خـوشکەکەی وەکو من شـەرم نەکات و پیاوانە بێت، لای « جوان» وتبووی:

«ــ چییە ئەو بەرەڵلایە، لە هەموو دیزەیەکدا ئەسکوێیە..!!»

هـەروەکو چـۆن دەمی هـەر پیـاوێ بکـەیتـەوە، دەڵێ: «ئافـرەتی ڕەشـئـەسـمـەر جـوانە».. هەرچی گـۆرانی هـەیە بەسـەر ڕەشـئـەسـمـەردا هـەڵدەدرێت، کـەچی وەکوتر هـەر سوور و سپی پەسەندە.. لای ئەوانەی خۆشمـان هەمان شت بوو.. لەسـەر ئەو کچانە دەبوو بە فڕکان فڕکان، کە بەیانیباش و ئێوارەباشیـان لێ نەکـردبوون، بەدریژایـی ئەو چوار سـاڵە بەڕێککەوتیش لە کـافتـریا لەگـەڵیـان دانەنیشـتبـوون.. من ئێسـتـاش سـەرم لەوە سـوڕمـاوە چـۆن و کـەی و لە کویێ یەکـتــریان دەدی..؟! چۆن ئـەوســا کــوێر بـووبووم و پـەییم بە نـاخی کــور نەبردبوو..!! ئەو هـەتیـوە چەنەبـازە چی بوو، کـە هـەمــووی چەند ڕۆژێک بوو وەرگیرابووم، لێم پەیدابوو.. ئامۆژگاریی کردم و پێی وتم:

ــ ئافـرەت وەکـو پەڕەسـێلکە وایـە.. هـەردووکـیـان وەکـو یەک ناسـکن، بەڵام وەکو یەک ئازانین.. پەڕەسێلکە زۆر لە ئافرەت ئازاترە.. پەڕەسێلکە لە هـەرچی باڵندەی تریش هـەیە، ئازاترە.. هـەڵۆ بەو هـەمـوو ئازایەتیـیـەی خـۆی دوور لە دەسـتی مـرۆڤ هێـلانە دادەنێت، کـەچی پەڕەسـێلکە بێ ترس و سـڵـەمـینەوە، دەچێت لە ژوورەوە جـوانتـرین هێلانە دەڕازێنێتـەوە.. بەم ئازایەتییەی کـارێکی کـردووە، مـرۆڤ نەک هـەر پارێزگـاریی لێـبکات، بەڵکو بـە پیـرۆزیشـی بزانێت.. ئەو مـاڵەی پەڕەسـێلکە هێلانەی تیا بکـات، پیت و فەڕی تێدەکەوێت.. بۆئەوەی پیاو هـەڵتنەلووشێت و بە پیرۆزت بزانێت، دەبێت ببێت بە پەڕەسێلکە.

هـەمـوو گیـانم تەزووی پیـادا هـات.. هـەر خـێرا ئەو دەفتـەرە ڕەشـەی تازە بۆ «مـێژووی سـەدەکانـی ناوەڕاسـتی ئەورووپا»م کـڕیبـوو، دامـێ و داوام لێی کـرد بۆمـی بنووسـێـتـەوە.. بە دەسـتـوخـەتێکی جـوان لە لاپـەڕەی یەکـەم بۆی نووسیمەوە.. چەند خۆشحـاڵ بووم، کە یەکەم لاپەڕەی ئەو دەفتەرە ڕەشەم بەو وتە پڕ لە حیکمەتە ڕازایەوە.. ئەوەندەم خوێندەوە، تا جوان جوان لەبەرمکرد.. لە هـەمـوو قـسـە و باسـێکدا، بەهەق و ناهـەق، هـەر بەبێ ئەوەی یەک پیـتی

بپەڕێنم دەموتەوە.. ڕۆژێکیان «شەرمن» پێی وتم:

ــ ئەرێ ناخۆشت کرد.. کەس ناوێرێت قسەیەک بکات، تۆ خێرا دەیبەیتەوە سەر پەڕەسێلکە..!!

ئەوە چۆن تەریق نەبوومــەوە..؟! تەریقــبــوونەوەی چی..؟! هەر خــێــرا وەڵامیشیم دایەوە:

ــ من دەمەوێت بتانکەم بە پەڕەسێلکە.

ــ قسەی هیچ..!! پەڕەسێلکە..!! ئازابە خۆت ببە، خەمی ئێمەت نەبێت.

ئەو ڕاستی کرد.. من کونەپەپووێکی زۆڵ بووم، لافی پەڕەسێلکەم لێدەدا.. من کە لە دامێنێکی بێنوێژ کەوتبوومە خوارێ، شیرێکی حەرامم خوادبوو، لە باوەشــێکی بەدی دایکێکی بەرباد و ســۆزانی هەڵگیــرابووم، چییــم دابوو لە باڵندەیەکی پیــرۆزی وەکو پەڕەسێلکە، کە دەیان جار ناوی لە کتێبەکانی ئاسماندا هاتووە..؟! دەڵێن قەلەڕەشێک هەبووە وەکو من لاسایی باڵندەی تری کردۆتەوە.. ڕۆژێکیان بە بەرچاویەوە هەڵۆیەک پەلاماری بەرخێکی ساوا دەدات و بە چنگە بەهێزەکانی هەڵیدەگرێت.. ئەویش هەر خێرا پەلاماری پیرەبەرانێ دەدات و دەیەوێت بۆ ئاسمانی هەڵبڕێت.. نینۆکەکانی لە تیسکەخورییە درێژەکانی بەران گیر دەبن و لە سەر پشتی دەکەوێتە باڵەفرە.. هەرچەند دەکات و دەکۆشێت خۆی پێ دەرباز ناکرێت.. شوانەکە دەگاتە سەر سەری و دەیگرێت.. پەڕی باڵەکانی یەکە بەیەکە دەردەهێنێت و بەدیاریی بۆ منداڵەکانی دەباتەوە.. ئەوانیش لێی دەپرسن:

ــ باوکە ئەم باڵندەیە ناوی چییە..؟

پێیان دەڵێ:

ــ ئەمە ناوی قەلەڕەشە، بەڵام دەیەوێت ببێت بە هەڵۆ.

ئاخــر من کــچی «ناهیــدە»ی دەمــوچاوهەڵگر بووم، کــە هەرچی لۆتی و شــەقــاوە و چەورە و مــەورە هەن لەم شــارە دەیناســن و ناوەکــەیان لە ســەر دەســتــیــان کــوتیــوە، چی دەیکردم بە پەڕەســێلکە..!! ئەوە بۆچی خــۆم بیــرچووبۆوە..؟! ئەوان چونکە وەکو من نەبوون، هەمــوو بوون بە پەڕەسێلکە، هەریەکــەیان گــوێســەبانە و تاقی ژووری کــوڕێکیــان کــردە هێــلانە، منی

کونەپەپووی کچی کونەپەپووش، چاوشۆڕ و زارەترەک هاتمەوە کەلاوەکەی خۆم.. سەرم نا بە سەری کونەپەپووەکەی ترەوە.. کێ هەیە ئەوەندە دەبەنگ بێت بە دەستی خۆی ماڵی خۆی وێرانکات، باڵندەیەکی ڕەزاگرانی شووم بەرێتەوە بۆ ماڵەکەی.. تا ئێستا نەمدیوە و نەمزانیوە، دەسا نەشمبیستووە، کەس هەبێت ئارەزووی بەخێوکردنی کونەپەپووی هەبێت.!!

چ دەرفەتێکی گەورەم لە دەست خۆم دا.. من دڵم بەوە خۆش بوو، کەس نەیدەناسیم، نەیاندەزانی لە تایەفەی کونەپەپووم، بۆچی وام لە خۆم کرد.. جا خۆزگە ئاوا ئابرووشم نەچووایە و نەکەوتمایەتە سەر زاری هەتیوەوردکەش، هەر قەیدی نەدەکرد.. کاتێ بەخۆمم زانی، هەموو شتێ تەواو بووبوو.. دەیان چیرۆکی سەیر سەیریان بۆ هەڵبەستبووم.. نازانم چ کوڕی باشێکە چۆتە بنجوبنەوانم، ئاوا دنیای لێ پڕکردووم:

«ــ ماکەرە کونەپەپووش بوو ئاوا خۆی لەسەر ئێمە کردبوو بە پەڕەسێلکە.!!»

«ــ من هەر سەیری چاوی ئافرەتکەم دەزانم بایی چەندە.. هەر یەکەم ڕۆژ دیم زانیم تەواو نییە.»

شەوان کوڕان خواردنەوەیان هێناوە و مێزیان ڕازاندۆتەوە.. هەر پێنج و شەشیان لە ژورێکدا کۆبوونەتەوە.. تا گۆرانییان وتووە، گۆرانییان وتووە.. دوایی کە تەواو مەست بوون، نۆرە هاتۆتە سەر من.

لە ژووری مارکسییەکان وتوویانە:

«ــ ئازادی تێگەیشتنە لە یاسا مەوزووعییەکان و بەکارهێنانیانە لەخزمەتی کرێکار و زەحمەتکێشدا، نەک بەرەڵلایی.. ئەوەی لەو کچەم دیوە (کێ دەڵێ کچیشە..!! ئا بەڕاست کونەپەپووە) لە هیچ کەسێکی ترم نەدیوە.»

«ــ ڕاستە بوونی مولکدارێتی تایبەت سەرچاوەی هەموو چەوسانەوە و بەدڕەوشتییەکی ناو کۆمەڵگایە، بەڵام نەبوونی و بێدەرامەتی نییە پاڵ بەمەوە دەنێن لەشی خۆی بفرۆشێت، بەڵکو تەنها لەزەتێکی ڕووتە.»

«ــ ئەوە ڕێک لەو خڵتانەیە، کە مارکس و ئەنگلس لە مانیفێستدا باسی دەکەن.»

لە ژووری ناسیۆنالیستەکانیش وتوویانە:

«ــ عەرەب و تورکمانیش پێی فێر بوون.»

«ــ کونەپەپوویەکی ئومەمییشە، ئێمە نەمانزانیوە.!!»

«ــ نا توخوا مەیکەن بە گاڵتە..!! ئەمە شتی گاڵتە نییە، دەبێت سنوورێکی بۆ دابنرێت. وادیارە تەواو شووڵی لێ هەڵکێشاوە.»

«ــ کــورە بە خــوا لە داخــا وا دەڵێم ، ئەگــینا دەزانم چۆن ســەری شۆڕکردووین.»

لە ژووری ئەو کوڕانەی، کە نزیکی سیاسەت نەدەکەوتن وتوویانە:

«ــ ئافرەتم زۆر تاقیکردۆتەوە، هی وا تەڕ و ئاودارم نەدیوە.»

«ــ حیزبابە لەشولارێکی سەیری هەیە.»

«ــ هیچی ناگات بەو جووتە مەمکەی. کە دەیخەمە دەممەوە، وا مەست ئەبم، ئاگام لە خۆم نامێنێت، ئەگەر لەدواوە دەکەس بە شەق و پێلەقە تێمکەون، بەخۆم نازانم.»

«ــ چەند ساڵە هەرچییم لە فلیم و گۆڤارەکاندا دیوە، هەمــوویم پێ تاقیکردۆتەوە.. پیاو بۆ خوا بڵێت خۆیشی چاکی لێ دەزانێت و زۆر شتی لێوە فێربووم.»

«ــ ئێ هەتیو تۆش کەریت، خۆ بەخۆڕایی نەیانوتووە بێچووی قاز و مراوی هەر سەریان لە هێلکە بجووقێت مەلەوانن.»

«ــ بەڵام تۆش لەو کەرتریت، چونکە بێچووی قاز و مراوی نییە، هی کونەپەپووە.»

«ــ دەزانن کوڕینە ناوەکەی پڕ بە پێستی خۆیەتی..؟!»

«ــ بەپێــــچــــەوانەوە..!! من هەر جـــارێ چووبم بۆ لای و ئەو ناوەیم بیرکەوتبێتەوە، ساردبوومەتەوە.»

«ــ دەڵێی چی لەبەر خاتری تۆ بە پەڕەسێلکە بانگی بکەین، خۆیشی شێتی ئەو ناوەیە..؟!»

«ــ حیزی وا حەددی چییە بــە پەڕەسێلکە دەبێت، لە پەڕەسێلکە پیرۆزتر هەیە..!! ئەوە بزانن من لەوپەڕی سەرخۆشییشدا کفر ناکەم.»

ئەو هەموو قسەیەم بۆ هەڵبەسترابوو، هەر پێشم نەزانی بوو.. نازانم ئەو کەسەی ئەو هەموو شتانەی لە دوو لاپەڕەی خورشیدیدیدا نووسیبووەوە و بەدزییەوە خستبوویە ناو دەفتەرە ڕەشەکەم، بەچاکە وای کردبوو، یان خۆیشی یەکێ بوو لەوان.. بەهەر نیهادێکەوە کردبێتی، ماڵی ئاوابێت.. جا بە کەڵکی چییم هات.. خۆزگە هەر نەمزانیایە.. ئەو هەواڵە ناکاوانە چی بوون ڕۆحیان کردم بە بێژنگ.. بۆ ناکاو بوون..؟! هەر دەمزانی ئەو خەڵکە شتێکیان لەگەڵ مندا هەیە.. بەخۆڕایی نەبوو ڕۆژ بە ڕۆژ دۆست و ناسیاوەکانم لێم دووردەکەوتنەوە. ئەو سەیرکردنەیان هەزار و یەک پرسیاری لا خولْقاندبووم... ئەو چپەچپەیان بێ مەلامەت نەبوو.. هەر خۆم دەزانم چەند ڕقم لە چپەیە.. چپە و سەرلەقاندنەوە.. چاکترین ڕێگان بۆ بڵاوبوونەوەی هەواڵ.. لە هەزار مایکرۆفۆن چاکتر ئیشی خۆیان دەکەن.

ئەرێ کەی بوو ئەو هەوالانەم پێگەیشت..؟! بەیانی بوو یان نیوەڕۆ..؟! هەوری ڕەش ڕەش بەری ئاسمانیان گرتبوو، یان خۆر داخی دڵی بەزەوی دەڕشت..؟! نازانم، نا.. خۆشم نازانم.. من کوا چاوم هیچی دەدی..!! چۆن گەیشتبوومەوە ژوورەوە و لەسەر قەڵەوێرەکەم پاڵکەوتبووم..؟! ئەویش نازانم.. ئێستاش نازانم بۆچی ڕووت بووم.. خۆم جلەکانم لەبەرخۆم داکەندبوو یان کێ..؟! خۆم بووم.. ئەوەیانم بیرماوە.. گومان وای لێ کردم وابکەم.. بەبێ ئەوەی بەخۆم بزانم منیش چوومە پاڵ ئەوان.. من تاک و ئەوان کۆ، من کەم و ئەوان زۆر، بۆچی ئەوان درۆ بکەن و من ڕاست..؟! ئەو چوار ساڵەم ڕۆژ بەڕۆژ دەهێنایە بەرچاوی خۆم، تا بزانم کەی و لە کوێ ئەو هەموو سەرچڵییەم کردووە، هیچ شتێکم بیرنەدەکەوتەوە، کەچی هێشتا نەمدەتوانی باوەڕ بەخۆم بکەم.. خەیاڵم بۆ ئەوە چوو تووشی نەخۆشیی لەبیرچوونەوە بووبم.. جارێکیان لە گۆڤارێکدا خوێندبوومەوە، کچێکی هەژدەساڵان تووشی نەخۆشییەکی زۆر سەیر بووبوو، هەرچی ڕووداوی گرنگ هەیە لە ژیانی، بیری چووبوو، کەچی شتی زۆر لاوەکی و بێمانای سەردەمی منداڵیی خۆی بیرمابوو.. ئەمە زیاتر وای لێ کردم گومان لە خۆم بکەم.. مێزەکەم ڕاکێشی لای ئاوێنە بالانۆماکەی قەد دیوارەکە کرد.. هەرچی کتێب و دەفتەر و شانە و قوتووی ماکیاجی خۆم و

«ڕووناک» و «مەهاباد»ی لەسەر بوو، هەر هەمووویم لابرد و بەو ناوەدا بڵاومکردنەوە.. لە سەری پاڵکەوتم و قاچەکانم بۆ ئاسمان هەڵبڕی، تا بەئاسانی هەموو شتێ ببینم.. پەنجەکانم خستنە کار.. گەڕام.. بەترسەوە و سووک سووک دەمجووڵاندن.. بەڵام بۆچی..؟! لە چی دەگەڕام..؟! دەمویست چی بۆ خۆم بسەلمێنم..؟! بۆ خۆم نەبوو.. بۆ ئەوان بوو.. ئاخر منیش یەکێک بووم لەوان.. ختووکەم پیادا دەهات، یان دەترسام..؟! ترس بوو.. ترس. دەبوایە بترسم.. یارییم بە ئاگر دەکرد.. دەیان جار دایکم لەسەر شتی زۆر لەوە کەمتر، قژی ڕاکێشابووم.. چاوی لێ سوور کربوومەوە.. بە سەریدا هاوار کردبووم.. زۆر جاریش بەخۆشی ئامۆژگاری کردبووم:

ـ تۆ چاو لە کوڕان مەکە ، هەموو یارییەک هی تۆ نییە.

ئەوسا منداڵ بووم چاک لە دایکم حاڵی نەدەبووم.. دوایی زانیم بۆچی وادەڵێت.. ئەمە هەر قسەی ئەو نەبوو بەتەنها، هی دایکی هەموو دەستەخوشکەکانیشم بوو.. جارێکیان «ست گوڵاڵە»ی زیندەوەرزانی کۆئەندامی زاوزێی ئافرەتی بۆ باسدەکردین.. وێنەیەکی گەورەی بە تەختەڕەشەکەوە چەسپ کردبوو.. یەکەم شت، کە پەنجەی خستە سەر ئەو بوو.. نازانم لە شەرمابوو، یان لە ترسا ئاوا ڕەنگی تێکچوو بوو.. بە دەموپلێکی تێکئالاوەوە وتی:

ـ کچینە ئەمە ئەو بلیتەیە، دەبێت پێتانبێت، کاتێ دەچن بۆ ماڵی مێرد.

باشە من بێجگە لە ماڵەکەی خۆم، کە هەر لە هێلانەی کونەپەپوو دەچێت، تەمام بە ماڵی هیچ کەسێکی تر نەمابوو، بلیتم بۆچی بوو..؟! بۆچی ئاوا خۆم سەغڵەت کردبوو..؟! ئێ ناڵێم گومان پاڵی پێوەنام وابکەم..!! دەمویست هیچ نەبێت بۆ خۆمی دەرخەم، کە ئەوەی وتوویانە ڕاستە یان درۆ..؟! هەر ئەوەندەشم لە توانادا بوو.. دەی باشە با بڵێین دەتویست بەم کارەت ئەوان بەدرۆبخەیتەوە، بەڵام هەی گەوجی نەفام.. سەرت بتاشن.. نەتدەزانی چاکترین بەڵگەت دەدایە دەست، کە هەرچی وتوویانە ڕاستە..؟! باش نەبوو «ڕووناک» و «مەهاباد» هاتن بەسەرتدا، ئەگینا چییت دەکرد..؟! چییم دەکرد..؟! بۆ من چ جیاوازییەکی هەیە.. چی لە مەسەلەکە گۆڕی..؟! کچێ وا

مەڵێ زۆری گۆڕی.. ئەی ئەوە نییە ئەو کوڕە چۆن شێت و شەیدام بووە.. بۆ هەر کوێ دەچم، بەدوامەوەیە.. خواخوایەتی ڕووی لێ گرژ نەکەم.. خێسەی لێ نەکەم.. دڵی لە ئاستمدا واناسک و لەرزۆک بووە، ڕەنگە بەرگەی بزەیەک، یان چاوداگرتنێکم نەگرێت.. با بوەستێت بۆم بزانە چۆن لە خشتەی دەبەم.. دەبێت وای لێ بکەم بە هەموو شێوەیەک پێم ڕازیی بێت.. هەر ئەوەندە ئاگام لە خۆمبێت، وا خۆم پیشان نەدەم، کە حەزم لێیەتی.. ئەوەم بیرنەچێت کوڕان شێتی ئەو کچانەن، کە بەئاسانی دڵی خۆیانیان بۆ ناکەنەوە، چونکە ئەو کاتەی پیاو هەموو گرێکوێرەکانی ژیانی ئافرەت دەکاتەوە، ئەوە ئەو کاتەیە، کە هیچ ئیشێکی پێی نەماوە.. تەواو جارێکی تر نابم بە پەشمەک، هەر بمخەنە سەر زار و بتوێمەوە.. دەبم بە بەرد و دەبێت تاماوە خەریکی توانەوەم بێت.. کارێکی پێ دەکەم نەیپەرژێتە سەر ئەوەی بەدوای ڕابردوومدا بگەڕێت.. لەوەناچێت لەو کوڕە زۆرزان و بلیمەتانەش بێت، ئەگینا کەست دیوە لە ماڵی کونەپەپوو داوای ڕووناکی بکات..؟! بەڵام ئەو لەو ڕووناکییە مەبەستی هەیە.. ئا ئا مەبەستی منە.. ئەگینا ئەوە هەمووی ماڵە بۆچی هەر بۆ ماڵی ئێمە دێت..؟! بەزەییشم پیایدا دێتەوە.. کێ دەڵێت ئەمیش وەکو ئەوانی ترە..!! بۆچی ئەوەندە دڵڕەق بم هەقی ئەوانیش لەم بکەمەوە.. داماوە کەس و کار و شارەکەشی جێهێشتووە، هاتووە لەم غەریبایەتییە خوێندن تەواوکات.... ئای ئای ئەوە من چی دەڵێم..؟! چەند زوو لەو بڕیارەی خۆم پاشگەزبوومەوە.. ئەی نەموت نابێت جارێکی تر بەزەییم بەهیچ نێرینەیەکدا بێتەوە..؟! هەزاریان بە جارێ لە بەردەممدا پەلەواژبنەوە، لایان لێ نەکەمەوە..؟! درۆیە من بتوانم ئەو دڵەی خۆم بگۆڕم، بۆیە واچاکە لە بێخەوە هەڵیتەکێنم.. یان هیچ نەبێت دڵێکی تر پەیداکەم، ئەمیان بۆ خۆشەویستی، ئەویان بۆ ڕق.. ڕەنگە ئەمەش چارەسەر نەبێت، دەترسم بە هەڵە بەکاریان بهێنم.. وا چاکە دڵە پڕلەڕقەکەیان بۆ کوڕ و ئەویتریان بۆ کچ بەکاربێنم.. ئەمەشیان ڕاست نییە.. خۆ کچیش کەمیان پێ نەکردم.. «ڕووناک» و «مەهاباد» هاوڕێ شەو و ڕۆژم بوون، ئاوا ڕیسوایان کردم.. ناهەقیشیان نەبوو.. لە کاتێکی خراپ دیمیان.. خۆ من لای خۆی دەرگام داخستبوو، بەڵام بۆ بیرم نەمابوو ئەوانیش

کلیلی خـۆیان پێـیـە.. هـەر ئەوەندەم زانی چـقـوهـووڕێ لە دەرگـاوە هـات.. لە شوێنـی خۆم تاسام و فریای هیچ شتـێ نەکەوتم.. دەرگا ترازا و بەدەرکەوتن.. واقیان وڕما.. سەراسیمە بوون.. دەرگایان بەکراوەیی جێهێشت و لە بەرامبەر من ئـەبڵــەق وەســتــان.. منیش بـە ڕووتوقــووتی لـەســەر ئــەو مــێــزە لێی پاڵـکەوتبـووم.. هــەر ئەدەتوت ئـەو وێنـەیەم، کـە «ست گـولاڵە»ی زیندەوەرزانی ئەوجـارە بە تـەختـەڕەشـەکـەی پۆلی چەسـپکردبوو... هەر دەبوایە قـسـەیەک بکەن.. جا بۆ نەیانکرد..؟! ئەوانیش بەشی خۆیان پێکردم:

ــ ئەو هەموو کوڕە سوکناییت نادەن، هەی لەوە ڕیسواتربیت..!!

ــ چاوحـیـزی بەڕەللا.. ئـاخـر چواری وەکـو تۆیە، ئاوا ناوی هـەمـوومـانی زڕاندووە.

ــ نـەزۆک نەبـوویتـــایە، دەبوایە هـەر فــریای بـەخـێــوکــردنی منداڵی تۆ بکەوتینایە..!!

ــ منداڵی چی..؟! بڵێ بێچووەکونەپەپوو..!!

جنێوی خۆیان دا و چوونـە دەرەوە.. نەیاندەویست چارەی کەسێ ببینن، کە هەرچی گیانی هەیە نقوومی خراپەکارییە.. خۆ باشیش بوو جێیانهێشتم، ئەگینا دەبوایە تا گیانم دەردەچێت لەسەر ئـەو مێزە ڕەق و تـەقـە نـەجووڵێم.. چۆن لـە ڕووم دەهـات سـەر هەڵبڕم و سەیریان بکەم.. هەرچۆنێ بوو هەستـام دەرگاکەم بەسـەر خۆمدا داخستەوە.. تاقـەتی لەبەرکردنی جلەکانمم نەمابوو، هەر بەڕووتی چوومـە ژێر لێفـەوە.. باشــە بۆ ڕاست و درووست پێم نەوتن من چی دەکـەم..؟! بـۆچی بەرگـریم لە خـۆم نـەکـرد..؟! چۆنم بکردایە..؟! من خـۆم گـومـانم لە خــۆمکردبوو.. ئەو گـومـانـەی تاکـو ئێـسـتـاش بەدوامــەوەیە.. کونەپەپوویەکی شوومـە و بەردەوام لە ناو کەلاوەی سـەرمدا دەخـوێنێت.. چی هەیە لـە دەنگی کـونەپەپوو ناخـۆشـتـر..!! واز لەوە بێنـە، ئەوە چۆنیـان زانیـوە نەزۆکم..؟! ئای لە منـی بێکەس و داماو، خـۆ دواکـەسم بە حـاڵی خـۆم دەزانم.. کـوا دەشـیـزانم..!! هەموو شـتێک لەبەرچاوم لە شـێوەی نیـشـانەی پرسـیـار دەردەکـەوێت.. نیشانەی پرسـیـاریش داسـی تیژ تیـژن لە چاوم دەچەقن.. ئەرێ ئەو ڕۆحــە پیس و گـلاوە چییـە ئـەوەندەم خـۆش دەوێت..؟! هـەرکـەسـێکی تر

بووایە لە شوێنی من، دەمێک بوو پیاڵەیەک ژەهری خواردبووەوە، یان بە پەتێ خۆی خنکاندبوو.. من دەبوایە ئەو ڕۆژە خۆم زیندەبەچاڵکردایە، کە بەڕووتی لەسەر مێزەکە دیمیان.. ئەی هەوڵم نەدا بەشێوەیەک خۆم بکوژم، هیچ کچێکی داوێنگلاوی تر ڕێی پێ نەبردبێت..؟! گوناهی من بوو سەری نەگرت، یان هی ئەو خەڵکە نەفامە، جیاوازییان لە نێوان کچێکی ڕووت و کونەپەپوویەکدا نەکرد..؟! بەڵام ئەوە بەڕاستیی نەبوو، بەڵکو نووستبوویت و خەونت دەدی، بڵێم بەئاگابوویت و دەهاتە بەرچاوت..!! بەڵام ئێستاش هەر دەڵێم بەراستیی بوو.. نە خەون بوو و نە خەیاڵ.. بە ڕووتی و بێباکانە چوومە دەرەوە، بەبێ ئەوەی لە شتێ بترسم، یان سڵ بکەمەوە.. ترس و سڵەمینەوەی چی..؟! من دەمویست هەرچی خەڵکی ئەو شارە هەیە لە خۆمیان کۆکەمەوە.. هەر بە تف و شەق و پێلەقە و تاکەپێلاو و مێشکوژ، تێمکەون، تا ئێسک و پرووسکیشم بەسەر دنیاوە ناهێڵن.. کەچی وانەکەوتەوە.. هەرکێ دەیدیم، واقیوڕدەما.. لە شوێنی خۆی دەتاسا.. هەر ئەوەندەیان پێدەکرا بە سەرسوڕمانەوە بڵێن:

ــ ئای ئەوە چ کونەپەپوویەکی گەورە و سەیر و سەمەرەیە..!!

من لەوان ئەبڵەقتر و سەرسامتر.. زۆر لەوان زارەترەکتر.

ئەوە یەکەمجار بوو تەواو بڕوابکەم من لە بنەماڵەی کونەپەپووم.. تا ئەو کاتە هەر وامزانی بوو ناتۆرەیەو دوایان خستووین.. زۆر جار لە دراوسێکانمانم بیستبوو، گوایە باوکم کوڕە شێخێکی زۆر گەورەی ئەم گەرمیانە بووە، دایکیشم کچەقەرەجێ، بەمەبەستی وردەواڵەفرۆشتن چۆتە تەکیەکەی باپیرم.. باوکم دیویەتی و عەشقی بووە.. باپیرم، کە ئەمەی بیستووە، زۆر تووڕەبووە.. باوکم گوێی نەداوەتێ و لە فەرمانی باپیرم یاخی بووە.. کچەقەرەج هەڵدەگرێت و دێنە شار.. ئەویش دووعای لێ کردووە، کە لە بەر چاوی ببێت بە کونەپەپوو و بێزی نەیەت بچێت بەلایدا.. دووعای باپیرم گیرا دەبێت.. کچەقەرەج بەو هەموو جوانییەوە، لە بەر چاوی باوکم دەبێت بە کونەپەپووێکی شوومی ڕەزاگران.. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر خۆشی دەوێت.. تەنانەت کە دەزانێت دایکم ناپاکیی لەگەڵداکردووە و سکی بەمنەوە هەیە، دڵی

نایەت لە گوڵ کاڵتری پێ بڵێت، بەڵام لە داخا خۆی دەکوژێت.

من ئەو هەموو شەڕەم لەگەڵ خەڵکدا کرد.. ئەو هەموو جنێوەم پێ دان.. چووزانم هەرچی وتوویانە ڕاستە.. ئینجا بۆم دەرکەوت من چەند پیس و چەپەڵ و گڵاوم.. لە منیش گڵاوتر دایکمە.. ئەی باوکە لە گۆڕیشدا ئۆخە نەکەیت و نەحەسێیتەوە، کە بە لەقە ناو سکیت نەدڕی.. هەر هیچ نەبوایە منت لە باربردایە.. خۆشم نازانم بنیادەمم، یان کونەپەپوو.. ؟! لە هیچیان ناچم.. من ئاوا گلەیی لە باوکم دەکەم، کەچی خۆشم لەو ئازاتر نیم.. لە دنیادا لە کوشتن زەحمەتتر نییە.. ئەو شەوە بۆم دەرکەوت، کە ویستم دایکم بکوژم.. لە ئێوارەوە خۆم بۆی ئامادە کردبوو.. چەقۆکەم بەدزییەوە خستە ژێر سەرینەکەم.. خۆم کرد بەنووستوو.. چاوەڕێ بووم خەوی لێ بکەوێت.. کە زانیم چۆتە خەوی قووڵەوە، دەستم بۆ چەقۆکە برد.. نەخێر، بەو ئاسانییە نەبوو.. هەموو گیانم دەلەرزی.. دەستم چەقۆی نەدەگرت.. دەیان شتی سەیر سەیر بە خەیاڵمدا دەهاتن و ئەدەچوون.. ژوورەکەم هەندێ جار بە ئەشکەوتێکی تاریک و هەندێ جاریش بە هێلانەی کونەپەپوو دەهاتە بەرچاو.. دەنگی کونەپەپوو و دەیان دەنگی ترسناکی تر لە ناو سەرمدا دەزرینگایەوە.. بەو ترس و لەرزەشەوە هێشتا هەرسوور بووم لەسەر کوشتنی.. هەر چۆنێ بوو خۆم گەیاندە سەر سەری.. دەمویست لە پێشدا نووکی چەقۆکە بەتەواوی ئاڕاستەی سەر دڵی بکەم، دواییش هەموو گیانی ونجڕونجڕکەم، کەچی چەندی دەمکرد دەستم بۆ بەرز نەدەکرایەوە.. ئەو چەقۆیەی هەموو ڕۆژێ لە مووبەقەکەدا تەماتە و پیازم پێ دەجنی، ئەوەندە لام قورس بووبوو، بۆم هەڵنەدەگیرا.. دوایی فیێڵەکەم دۆزییەوە.. هەرچیم بەسەرهاتبوو، هەر هەموویم بیر خۆم خستەوە.. هەر لەو ڕۆژەوە، کە لە دامێنی گڵاوی فڕەیدابوومە ئەم دنیا تاریک و نووتەکەوە، تا ئەوکاتەی لای نزیکترین دەستەخوشکەکانم ڕیسوا بووم و بە نەفرەتیان کردم.. لەپڕ ددانم جیڕبوونەوە و دەمارەکانم کرژ بوون.. دڵم بوو بە بەردی شاخ.. چەقۆ لە دەستمدا بوو بە قەڵەم.. هەر دەتوت دەمەوێت نامەی دڵداریی پێ بنووسم.. ئەو نامەیەی هەموو ئاواتم بوو ڕۆژێ لە ڕۆژان بەچاوی پڕ لە فرمێسک و دڵی پڕ لە

حەز و ئەوینەوە بۆ هەتیوێکی بنووسم و هەر ڕێکنەکەوت.. چەند ئازایانە لێفەکەم لەسەری لادا و دەستم بۆ سەرینەکەی خۆم برد، تا بیخەمە سەر دەمی و لە چاوترووکانێکدا کۆتایی بە هەموو شتێ بێنم.. کەچی جارێکی تر دەستم و هەموو گیانم لەرزین.. مووچڕکەم پیادا هات.. ئەمجارەیان هەر ترس نەبوو بە تەنیا، بەزەییش بوو.. ئەوە بۆچی بەزەییم بە کەسێکدا هاتەوە، کە گیانێکی بۆگەنی بەبەر جرجێکی نابووتی وەکو مندا کردووە و فرێیداومەتە ناو ئەو چڵپاوەوە..؟! ئەوە چ پارچەگۆشتێکی بۆگەن و کرماوییە لە بەرازییان پچڕیوە و لەجیاتی دڵ خستوویانەتە ناو قەفەزەی سنگمەوە، هەموو جارێ وام لێ دەکات بڵێم: «ئەی دایکە بۆگەنەکەم چەندم خۆش دەوێیت..!!».. ئەی دایکە بۆگەنەکەم نهێنی لەوەدا چییە هەرچی خراپە هەیە لەگەڵتدا کردووم، کەچی هێشتا ناتوانم هەقت لێ بکەمەوە..!! هەروەکو چۆن ئەو شەوە نەمتوانی.. نەمکوشتوویت، کەچی خۆم بە تاوانبار دەزانم، کە هەوڵی کوشتنم داویت.. چەند دەکەم ئەو دیمەنەم لە بەرچاو لاناچێت، کە لێفەکەم لە سەرت لادا و ئاوا خەمبارانە نووستبوویت.. چەند گوناح و داماو هاتیتە بەرچاوم.. باش بوو فریای شاردنەوەی چەقۆکە کەوتم، ئەگینا کە خەبەرت بووەوە، دەتدی بە دەستمەوە.. چەند بەسۆزەوە دەستم لە ملت کرد و چەند بەکوڵیش بۆت گریام.. تۆ واتزانی خەونم دیوە، بەڵام خەون نە بوو.. خەون نەبوو دایکە گیان خەون نەبوو.. نەمکوشتی، کەچی بەدەست خۆم نییە خۆم بەبکوژی تۆ دەزانم.. هەر بۆیە لەو ڕۆژەوە بەبێ ئەوەی بهێڵم تۆ پێم بزانیت، بۆت دەگریم.. هەست ئەکەم بەتەواوی عەشقت بووم.. بووی بە خولیای شەو و ڕۆژم.. ئەوە چ گرێیەکی دەروونییە لە مندا هەیە، لەلایەک دەمەوێت بتکوژم، لە لایەکی تر بەزەییم پیاتدا دێتەوە..؟! وا نەزانیت وازم لە کوشتنت هێناوە.. هەر ڕۆژێکە جورئەت دەنێمە بەرخۆم و لەبەرچاومت لا دەبەم.. جا دوای مردنت یان بۆ هەتا هەتایە لە بیرم دەچییتەوە، یانیش تاماوم بەدیار پەیکەرەکەت سوژدە دەبەم و لێت دەپاڕێمەوە تا بەگەورەیی خۆت لە گوناهەکانم خۆش بیت.. تازە کوشتنت بوو بە خولیای شەوو ڕۆژم، مەحاڵە بتوانم لە خەیاڵی خۆمی دەرکەم.. ئەگەرچی ئەمە ئەو ئیشەبوو، کە دەبوایە باوکم لە پێش منەوە

بیکردایه، بەڵام وا ئەو بۆ منی جێهێشت.. من کوشتنی خۆمم زۆر بەلاوە ئاسانترە لە کوشتنی تۆ، بەڵام نامەوێت خۆم بکوژم.. ئاخر من هەموو تەمەنم بووە بە پرسیار، تا وەڵام بۆ ئەو پرسیارانە نەدۆزمەوە، بیر لە کوشتنی خۆم ناکەمەوە.. هەر خۆم پرسیارێکم و لە وەڵام دەگەڕێم.. زۆر پەشیمانم لەوەی ئەو جارە ویستم خۆم بکوژم.. بڵێم خۆم دایە دەست خەڵک تا بمکوژن.... خۆ باشیش بوو وامکرد.. هەر هیچ نەبێت بۆم دەرکەوت من بەڕاستی کونەپەپووم.. کوا تەواویش بۆم دەرکەوت..؟! ئەوەندەی تر گومانم لە بوونی خۆم کرد.. ئەوەندەی تر ژیانم تێکەڵ بە ئەفسانە بوو.. ئەرێ ئەوە ئاقڵی بوو من کردم، ئاوا بەڕووتی چوومە بەردەستیان..؟! باش نەبوو لەتوکوتیان نەکردم..!! کە بیرم دەکەوێتەوە، مووچڕکە بە هەموو گیانمدا دێت.. گەرماوگەرم بوو، ئەگینا با ئێستا بوێرم.. خۆ نەیانکوشتم، بەڵام مردنم بە چاوی خۆمدی.. ئەو شارەم بەتەواوی ورووژاند.. هەمووی دەستی لە ئیش و کار هەڵگرت.. دەرگای قوتابخانە و کارگە و تیاترۆخانە و سەدان دەرگای تر داخران و هی مزگەوت و کەنیسەکان خرانە سەرپشت.. سەدان مەلا و کۆلکەمەلا بەجارێ، لە خوای گەورە دەپاڕانەوە لەو بەڵایەیان بە دوورخات.. زەنگی کەنیسەکان وەستانیان نەبوو.. خەڵکی ئەو لادێیانە هەرچی مەڕومالاتیان هەبوو، دایانە پێش خۆیان و بۆ شاریان هێنان.. ئەوەندەیان لێ سەربڕین، ئەو ناوە سوور دەچووەوە.. سەرمایەدار سی و پێنج سەعات کار لە حەفتەدا و دوو ڕۆژ پشووی لە سەر یەکیان خێر لە خۆ دەگرت و کرێکاریش هێزی کاریان.. مامۆستاکان بەڵێنیان بە خوا دەدا تا ماون هیچ قوتابییەک لە پۆلەکەی خۆیدا نەهێڵنەوە.. بەڕێوەبەری ئاسایش لەسەر قسەی وەزیری ئاوقاف مەفرەزەیەکی لە چاکترین پیاوەکانی خۆی ئامادە کرد، بۆئەوەی پارێزگاریم لێ بکەن، نەوەکا نەفامێ بمکوژێت.. لەوە دەترسان خوێنەکەم لەسەر خاکی ئەو شارە پیرۆزە برژێت.. ئەو خاکەی دەیان پێغەمبەری گەورە گەورەی وەکو «یونس» و «جەرجیس» و «شیت»ی لێ نێژراوە.. بەپێی فتوای وەزیری ئاوقاف دڵۆپێ خوێنم ئەگەر برژابوایەتە سەر ئەو خاکە، ئیتر ببڕای ببڕای پنجەگیایەکی لەسەر نەدەڕوا و نوێژی هیچ کەسێکیشی لەسەر قەبووڵ

نەدەبوو.. هەر هەموویان بەجارێ لە خوا و پێغەمبەرەکان دەپاڕانەوە، تا لەو بەڵایە بە دووریان خات.. گەورە و بچووک تێکڕا تف و نەفرەتیان لە خۆیان ئەکرد و دەیانوت: «دەبێ ئێمە چەند پیس و گڵاو بین، دەبێ چ گوناهێکی گەورەمان کردبێ، خوا ئەو کونەپەپوو زەبەلاحەی پیشانداوین..؟!» .. ناهەقیان نەبوو بترسن.. ئەوان لەوەتەی هەن لە کونەپەپوو دەترسن.. ئەگەر زۆر ناچار نەبوونایە، ناویان نەئەهێنا، ئێستا وا کونەپەپووێکی سەد ئەوەندەی کونەپەپووی ئاسایی ڕووی کردۆتە شارەکەیان، چۆن زەندەقیان ناچێت..؟! تا ئەو کاتەی چەند پیاوچاکێکیش نەیانوت: «ئەوەی ئێوە دەیبینن، کونەپەپوو نییە، بەڵکو کچێکی عازەبی ڕووتە..!!» ئێجگار وا نەدەترسان... هەر ئەوانیش وتوبویان: «تەنها ئەوانەی داوێنپیسن وا دەزانن ئەمە کونەپەپووە..!!».. ئەوە چ هەواڵێکی ناخۆش و جەرگبڕبوو بەرگوێی ئەو خەڵکە کەوت، ئاوا شپرزەی کردن و ئارامی لێ برین..؟! کتومت ڕۆژی حەشربوو.. حەیران و سەراسیمە ڕێم دەکرد، بەبێ ئەوەی خۆشم بزانم بۆ کوێ دەچم.. لە خۆم دەپرسی: «ئاخۆ کامە لایان ڕاست بکەن.. من چییم..؟! کونەپەپووم، یان بنیادەم..؟!».. زمانم لە گۆکەوتبوو، ئەگینا هەموو شتێکم تێدەگەیاندن.. بەڵام بەچی..؟! من خۆشم نەمدەزانی چییم.. ئێستاش نازانم.. ئاخ خوایە گیان من چ مەخلووقێکی سەیرو سەمەرەم..!! سەربەگۆبەندی وەکو من لەم دنیایەدا نییە.. بزانە چۆن بووم بە دەجال و سەرتاپای ئەو شارەم ورووژاند.. بووم بە سەنگی مەحەک.. هەرکەسێ بیوتایە :«ئەمە کونەبەبۆیە» بێ چەندوچوون بە داوێنپیس دەبژێردرا.. لەو شارە تەنها چەند کەسێ نەبێت، ئەوانیش هەموو ژیانیان بە خواپەرستی بردبووە سەر، لە هەموو ژیانیاندا شوێنی مەحرەمی هیچ مێینەیەکیان نەدیبوو، تەنانەت ژنەکانی خۆشیان بەتەواوی نەدیبوو، ئەوانی تر هەر هەمووی ڕیسوابوون.. لەو هەموو ژنی ئەو شارە تاقە پاکیزەیەکیان تیا دەرنەچوو.. هەر هەمووی دەستی لەرزۆکی بۆ ئاسمان هەڵدەبڕی و هەرچی ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەرەکانی لەبەربوو دەیخوێند و دەکرووزایەوە.. پیاوان تا ئەو کاتە نەیانزانی بوو، ژنەکانیان ئەوەندە پیس و گڵاون.. نەیاندەزانی لەودیو چاوی ئەوان چ ناپاکییەکیان کردووە.. هەر یەکە و لە

ئاستی خۆیەوە بە تیتک ژنەکەی، کچەکانی، خوشکەکانی خۆی ڕادەکێشا و پاشـقـۆڵی لێ دەگـرت.. لەسـەر زەوی پاڵی دەخـست و چەقۆی دەخـسـتـە ناو لینگی.. تا تەواو ئەمـلا و ئەولای لە یەکـتـر جـیـا نەکـردایەتەوە، دەسـتی هەڵنەدەگـرت.. ئینجـا دەست و چەقـۆی خـوێناویی بـۆ ئاسـمـان هـەڵدەبڕی و دەکەوتە دووعـا و نزا و پاڕانەوە.. ئەو هەمـوو لەتەژنە چی بوون لـەسـەر یەکـتـر کەڵەکە دەکران..!! ئەو هەمـوو خوێنە چی بوو لە بەریان دەڕۆیی..!! ساڵەهـای سـاڵ «فێمـینیسـتـەکان» لە هەوڵی ئەوەدابوون جیاوازی لە نێوان ژن و پیاودا نەهێڵن، هەر سەری نەگرت، کەچی ئەوەتا پیاوی ئەو شارە توانیـان نیوەی ژن لەگەڵ نیوەکەی تریدا تەواو یەکسان بکەن.. دەتوت لە هەموو ژیانیاندا ئیشیان لە دوولەتکردنی ئافرەتدا کردووە.. هەر نیوەیەکت لەگەڵ نیـوەکەی تریدا بەیەک بگرتایە، بەمـوو جیاوازییت تیادا نەدەدین.. بە تەرازوو بتکێشـانایە، گەردێک ئەمـلایان لەولایان قـورسـتـر نەبوو، مـەگـەر ئافـرەتەکـە هەر خـۆی لە ئەزەلا پەنجەیەکی، دەستێکی، لاگورچیلەیەکی نەبوو‌بێت.. ئێ ئەمەش گوناهـی پیاوی تیـا نییـە.. نەخێر، گوناهـی پیاوی تیا نییـە.. کونەپەپووێکی شوومـی وەکو من بوو ئەو قـیامـەتەی بۆ ئەو شـارە هێنا.. وەرن سـەری من بتـاشن.. بەردبارانم بکەن.. بەڵام نا.. هـەر ئەوەندە لـەسـەرم بـوەسـتن تـا منیـش هەقـی خـۆم لـەو کـونەپەپووەی تر دەکـەمـەوە، ئـەوسـا چیم لـێ دەکەن بیکـەن. بەڵێنتـان دەدەمێ ئەمـجـارە ناهێڵـم لە دەستم دەربـچێت.. هەر ئێسـتـا بە بەرچاوتانەوە پەلامـاری دەدەم.. دەست لە بینـەقـاقـای گـیـر دەکـەم.. ئەمـجـارەیان پەنا بۆ چەقۆ نابەم.. ناهێڵـم خـوێنەکەی بڕژێتە سـەر ئەم خـاکە.. بەبێدەنگی لە ناوی دەبەم.. دوای ئەوە با نۆرە بێتـە سـەر من.. چۆنتـان پێخـۆشـە، ئاوا هەقـم لێ بکەنەوە... ئای ئای..!! ئەوە من چـی دەڵێم..؟! دەسـتـمـدامـێنتـان من کـردم، ئێـوە نـەیکەن.. بە قــوربانتـــان بم من نـەکــوژن، لـەبەرئەوە نا دڵـم بە ژیـان خــۆشـــە، لەبـەر ئەو پرسـیـارانەی لەوەتەی هـەم لە خـۆمـیـان دەکەم.. ئەوا بیسـتـوهەشت سـاڵە بۆ پرسـیـار دەژیم، هـیـچ نەبێت بیسـتـوهەشـتی تریشـم مـۆڵەت بدەن بۆ وەڵام.. هـەر هـیـچ نـەبێت ئەوەندەم لـەسـەر بوەسـتن تا ئـەو هـەتیـوە لە دەرگـا دەدا.. لەوەتەی هـەم لە خـۆم دەپرسـم: من کـونەپەپووم، یان مـرۆڤ..؟! لەوەش گـرنـگتـر من هـەم

یان نیم..؟! ئەو هەتیوە لێی تێکدام، ئەگینا هەموو شتێ برابووەوە.. وانەبوایە ئێستا بەبێ چەندوچوون دەموت فەرموون ئەوە ملی من و ئەوە چەقۆی ئێوە.. ئەو وای لێ کردم جارێکی تر گومان لە خۆم بکەم، ئەگینا هەر لە ڕۆژی قیامەتەکەوە دڵنیا بووم، کە من نیم، ئەگەر هەشبم کونەپەپووێکی شوومم.. هەر کەمێکی ترە هەموو شتێ دەردەکەوێت.. دەی لەگەڵمدا گوێ هەڵخەن.. ئێستا نا ساتێکی تر لە دەرگا دەدا.. بەڵام چاوتان داخەن.. ئەو وەکو من نییە، شەرم دەکات.. وا چاکە خۆتان بشارنەوە، نەوەکا بتانبینێت و لە شەرما تەریقبێتەوە.. دە خێرا چۆنم پێ وتن ئاوا بکەن.. ئێوە پەلەی کوشتنی منتانە، منیش هی هاتنی ئەو.. ئەو وەڵامی پرسیاری منی پێیە.. من کاتێ دەزانم هەم، کە بزانم خۆشیان دەوێم.. ڕاستتر کە بزانم ئەم خۆشی دەوێم.. ئێستا نا ساتێکی تر هەموو شتێ بۆ من و بۆ ئێوەش دەردەکەوێت.. بەڕاست زۆری پێچوو، ئەوە بۆ نەهات..؟! جاری پێشوو زۆر زوو هات.. جاری ئەولاتر زووتریش هات.. وەی..!! ئەوە دڵم کەوتە خورپە.. گیانم هەمووی دەلەرزێت.. دەستم بگرن با هەستمە سەرپێ.. با بچم دەرگای حەوشە بکەمەوە و سەرێ لە کۆڵان بکێشم.. بزانم چی ڕوویداوە.. سەیرێکی پەنجەرەی ژوورەکەی بکەم، نەوەکا چرای ماڵێکی تری هێنابێت..!! دەدەی خێراکەن.. ها ئەوە دەستم.. سووک.. سووک، ئاوا ڕامەکێشن.. هەنگاوم بۆ ناهاویشترێت، هەڵمگرن.. وریابن نەمخەن.. حەوشەکە تاریکە یەکێکتان چراکە بێنێت و لە پێشەوە بڕوات.. خێرا بمگەیەننە دەرەوە، دڵم تێکهەڵدێت.. خەریکە دەڕشێمەوە.. بۆچی ئاوا لەسەرخۆ دەڕۆن..؟! دەی بەگورجی هەنگاو هەڵێنن.. ئەمە دەرگاکەیە، خێرا بیکەنەوە.. بەرچاوم بەردەن، با ئەو پەنجەرەیە ببینم.. ئای لە منی بەدبەخت و ماڵوێران..!! ئەوە چرای دەستی کام کچی گەڕەکە ئاوا ئەو ژوورەی پێ ڕووناک کردۆتەوە..؟! ئای لە منی داماو و ڕەنجبەباد..!!

ئەوە دەستی کامتانە قوڕقوڕاگەی گرتووم، ئاوا هەناسەی تەنگ کردووم..؟! چەقۆی کامتانە لە دڵمەوە وا بەرەو خوار ملدەنێت، ئەو ئازارەم پێ دەچێژێت..؟! تفی کێ و کێتانە پێڵووی چاوەکانی قورس کردووم..؟! بۆ فێڵتان لێکردم..؟! بۆ نەتانهێشت منیش هەقی خۆم بەدەستی خۆم بستێنم..؟!.....

ئەوە من لە کوێم..!! ئەی ئەوان چییان لێهات..!! بەکوێدا ڕۆیشتن..!! کەواتە من ماوم، نەمردووم.. لام ڕوون نییە.. ئەوە منم سەرم لە سەر ڕانی دایکم داناوە و پاڵکەوتووم..؟! تۆ بڵێی..؟! ئەوەتا بە بۆیەی نینۆک وا ئەو نینۆکانەم بۆیە دەکات، کە من لە بەر تاریکی بۆم نەکران.. پەح لەو ڕەنگە ناشیرین و ترسناکە..!! لە خوێن دەچێت.. ئەوە خوێنی کونەپەپووە، یان هی دامێنی کچێکی ئەفسانەیی بە نینۆکەکانمەوە دەبریسکێتەوە..؟! ئەوەندە دەزانم هی پەڕەسێلکە نییە.

کانوونی دووەمی ١٩٩٥

# ئەسپیدیلۆن

سـەیری دەسـتم بکەن چۆن لەسـەر پەلەپیتکەی ئەم تفەنگە دەلەرزێت.. هەر دەستم نا، هەموو گیانم.. هەموو گیانم دەلەرزێت و مووچڕکی پیادا دێت.. ناهەقیشم نییە.. ئەوە یەکەمجارە لە ژیانمدا پیاو بکوژم.. ئەوەی دەشیکوژم کەسێکی ئاسایی نییە.. هی ئەوە نییە بە منێکی دەستەپاچە و بێئەزموون بکوژرێت.. هەر کەسێکی ترە، دەگات و دەبینن ملم لە بەر ملی چ «ئەسپیدیلۆن»ێ ناوە.. تاوێکی تر ئوتۆمبێلە سپییە جامتەڵخەکە دەگات و بەچاوی خۆتان دەیبینن.. کەتەیەکی زل.. دوو چاوی زەق.. قژلوولێکی ڕەشتاڵە.. پاڵتۆ خاکییەکەی دەخاتە سەر شان و بەکەشوفشێکەوە لێی دادەبەزێت.. دەگاتە بەردەرگای ماڵی پوورم و ناگات، تەقەی لێ دەکەم... بەوەش باشە شوێنەکەم زۆر لەبارە.. نهۆمی دووەمی ئەم خانووە مکۆمە.. چاکم دۆزیوەتەوە.. ڕێک بەرامبەر بەماڵی پوورمە... هەر ئەوەندە بتوانم جورئەت بنێمە بەرخۆم و بەسەر ئەو ترسەی گیانمدا زاڵبم، ئەوا هەموو شتێ بەدڵی خۆم تەواو دەبێت... هەر ئەوەندەش بەس نییە.. دەبێت هەرچی سۆز و بەزەیی هەیەو چەند ساڵە لە ناخمدا قەتیسم کردوون، دەرگایان لەسەر بخەمە سەرپشت و بەڕەڵلایان بکەم.. چاکترین ژەهریش بۆ کوشتنی بەزەیی، دەرگاداخستنە بەسەر ڕابردوودا.. دەی چاکە.. من ئێستا کەسێکم بێ ڕابردوو.. بێ بەزەیی.. بێ حەز و خۆشەویستی.. تفەنگێکم بەدەستەوەیە و هەرچی بێتە بەردەمم دەیکوژم...

خۆ ئەگەر ڕاستیشتان دەوێت کاتی ئەوەم نییە بیر لە ڕابردوو بکەمەوە.. من کە دەبێت تەواو خۆم ئامادە کردبێت، نەوەکا لەپڕ بگات و لە چاوترووکانێکدا خۆی بگەیەنێتە ژوورە.. خۆی بگەیەنێتە ژوورەوە و لە دەستم دەربازبێت، چ پێویست دەکات خەیاڵم بۆ دوور بفڕێت.. تەواو.. ئیتر بیر لە

هیچ شتێ ناکەمەوە.. پەنجەم لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگ و چاوم لەسەر ئەو دەرگا سێتاکیەی ماڵی پوورم نابزوێت... ئاخر نابێت ئەوەشم بیر بچێت، کە زۆر لە شتێ ڕابمێنم، چاوم دەکەوێتە ڕەشکەوپێشکە و سەرم گێژدەخوات.. ئەوەی دەیبینم و هەستی پێ دەکەم، ئەوە نییە کەسانی تریش دەیبینن و هەستی پێ دەکەن... ئەوەتا وا وردە وردە ئەو دەرگا خاکییەم لێ دەبێتە دەشتێکی کاکی بەکاکی.. وشکوبرینگ.. چۆڵوهۆڵ.. هەرچەند دوور و نزیک نیگام ڕەوانە دەکەم، شتێ نابینم.. ئیستا هیچ متمانەیەکم لەسەر چاوم نەماوە و دەبێت گوێ هەڵخەم.. هەر دەنگێ.. هاوارێ.. خشپەیەک.. چرپەیەک ببیستم، بەبێ چەندوچوون دەستڕێژی لێ دەکەم.. دەستڕێژ..؟! گوێتان لێیە چەند سووک و ئاسان بەسەر زمانمدا تێدەپەڕێت..؟! چەند زوو ترسم شکا..!! تازە تەواو فێڵەکەم دۆزیەوە و زانییم منێکی ترسنۆک و دەستەپاچە چی بکەم، بۆئەوەی یەکێ بکوژم، بەبێ ئەوەی بیر لە مردنی خۆم بکەمەوە.. پێنج ساڵ شیعرم نووسی و چوار دیوانم بە چاپ گەیاند، جارێ نەمویرا دەست بۆ وشەیەک بەرم بۆنی بارووتی لێ بێت.. زەندەقم لە وشەکانی وەکو گوللە و قرمژنی گوللە و فیشەک و خەنجەر و دەمانچە و تفەنگ چووبوو.. ئێوارەیەکی زستان لەو شەقامەی بەردەم قەڵا، تەنیا و خەمناک پیاسەم دەکرد.. سەرما زۆری بۆ هێنام و حەزم لە چایەکی گەرم کرد.. خۆم گەیاندە گازینۆی نووسەران.. بۆ نەگبەتیی من، گفتوگۆ لەسەر پەیوەندیی نێوان چەک و قەڵەم گەرم بوو.. من دوا کەس بووم ڕای خۆم وت.. کاتێکم زانی وا «حەمە عەلی شاسواری» وەکو ورچ بەسەر سەرمەوە وەستاوە و چەمۆڵەم لێ دەنێت:

ـــ تۆ بێدەنگ بە بووکەشووشەی ناسک.. ئەگەر باسی مایۆ و ستیانی دایکە قەحپەکەتمان بۆ دەکەیت بیکە، ئەگینا خۆت لە کارێ هەڵمەقورتێنە، کە پەیوەندی بەتۆوە نییە.. ئێمە باسی پەیوەندیی نێوان چەک و قەڵەم دەکەین، نەک هی دایکت و تیاترۆخانە.

وا دیاربوو زۆر لێم پڕبوو، ئەگینا خۆ من هیچ وەڵامێکم نەدایەوە.. لە ترسا زمانم وا لە گۆکەوتبوو، هیچم بۆ نەدەوترا، کەچی ئەم تا تینی تیابوو زللەیەکی سرەواندە پەنا گوێچکەم:

ــ ناپیاو.. هەر بیچمت لە بیچمی قەحپە دەچێت.

«سەردار»ی چیرۆکنووس، ماڵی ئاوابێت قۆڵی گرت و دووری خستەوە، بەڵام هێشتا هەر جنێوی خۆی دەدا:

ــ دایکە قەحپەکەت چاکی ناسیویت، بۆیە ناوی پیاوانەی لێ نەناویت.

هەر ئەویش «دادە هیڤان»ی دواخستم.

باشە من وەکو سیما و ڕوخسارم لە هی پیاو ناچێت، ئەو ناوە چییە هەمە..!! دەیان جار لەگەڵ دایکم کردم بە شەڕ.. لە هاوڕێکانم دەپاڕامەوە، کە هەر ناوێکم لێ دەنێن بینێن، بەڵام بە «هیڤان» بانگم نەکەن، کەچی ئەوان دەیانوت:

ــ چۆن دڵت دێت وا بڵێیت..؟! لە هیڤان خۆشتر هەیە...!! لەگەڵ شێوەت تەواو گونجاوە.

ئاخر ئەوان نەیاندەزانی من بەقەدەر ناوەکەشم ڕقم لە شێوە و ڕوخساری خۆمە.. نەیاندەزانی هەر لەبەرئەوەشە دەمەوێت ناوم بگۆڕم.. سەرەتا کە کەمێ هەراش بووم و بیچمی خۆمم لە ئاوێنەکاندا دەدی، قێزم لێی دەکردەوە.. هاوکات دڵی خۆم بەوە دەدایەوە، کاتێ گەورە دەبم، سمێڵ و ڕیشم دێت و شێوەم دەگۆڕێت.. ئەوسا با ناوەکەشم نێرانە نەبێت، خۆ ڕیش و سمێڵێکم پێوەیە، هەقی هەموو شتێکی کردۆتەوە.. هەر زوو زوو خۆم دەگەیاندە ژوورەکەی باپیرم.. بەدزییەوە مەکینەی ڕیشتاشینەکەیم لە تاقمی تەراشەکە دەردەهێنا و بەرامبەر بە ئاوێنە باڵانوماکەی قەد دیوارەکە دەوەستام.. سەرەتا دەستم دەلەرزی.. زۆریش دەلەرزی.. دوایی وردە وردە ڕادەهات.. ئەگەرچی تاڵە موویێکم لە هیچ شوێنێکی دەموچاومدا بەدی نەدەکرد، کەچی سەرەوخوار و سەرەوراز.. بەملا و بەولادا دەمهێنا و دەمبرد... ئاوێنەیەکی بچکۆلەم پێبوو، هەر زوو زوو سەیری دەموچاوی خۆمم تیادا دەکرد.. لە ماڵ.. لە قوتابخانە.. لە پەنادیوار و سەر شەقامەکاندا دەرمدەهێنا و لێی ڕادەمام، بەشکو تاڵەموویێکم بەرچاو بکەوێت.. بەرچاوم نەکەوت و نەکەوت.. هەر زوو زوو دەستم پیادا دەهێنا، بەشکو شتێکی لێ ڕوابێت، بەڵام لووس لووس.. ساف ساف.. بێ گرێ و گۆڵ، دەتوت سمارتە کراوە.. جوتیارێکی کڵۆڵ و

داماو بووم و ڕوو لە ئاسمانی پانوپۆڕی خوای میهرەبان، بەدیار زەویی ڕەقەڵان و بێپیت دۆشم دابردبۆوە و چاوەڕێی بارانم دەکرد.. نەباری و نەباری.. تەمەنم وا لە بیستی تێپەڕکرد و هەر ئەوەندەی ئافرەتێک گەندەموو بە دەموچاومەوەیە.

من دایکیشم ئێجگار وای لێ کردم لە ئافرەت بچم.. لەبیرمە کە مناڵ بووم جلی کچانەی لەبەردەکردم.. بە بۆیەی نینۆک نینۆکەکانی بۆیە دەکردم.. لەجیاتی تۆپ و هەڵمات، بووکەشووشەی بۆ دەکڕیم.. لە هەمووی سەیرتر ئەو تاک گوارەیە بوو، کە کردبوویە گوێچکەم، گوایە تاقانە و نازداری دایەم.. قژە درێژ و خاوەکەشم ئەوەندەی تر سیمای کچانەی پێ بەخشی بووم.. ئێستاش نەمزانی دایکم بۆچی دەیویست لە کوڕەوە بمکات بە کچ..!! هەر دەتوت بەم کارەی دەیەوێت دڵخۆشی «فرۆید» بکات و بەدرۆی بخاتەوە، کە پێی وایە دوژمنایەتیی نیشتوو، دوای ئەوەی لە بنکی هەموو سۆزەکان و ئەو خۆشەویستیەی کەسەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە، ڕۆدەچێت، تەنها یەک شت دەهێڵێتەوە، ئەویش سۆزی دایکە لە ئاستی کوڕی نێریدا...

کاتێ لە تەلەفزیۆن دەردەکەوتم و بەو سەروسیما و بە دەنگە باریک و تیژەکەمەوە گۆرانییم دەوت، خەڵک نەیاندەزانی کوڕم، یان کچ..!! کە لەسەر شەقامەکان و لە بازاڕدا دەیانبینم، بەگومانەوە لێم ورددەبوونەوە.. سەدان چاو، سەدان چاوی ئەبڵەق و سەراسیمە بەجارێ لێیان دەڕوانیم:

ــ ئا ئەمە ئەو کچەیە، کە گۆرانیی بەجێم مەهێڵە دەڵێت.

ــ کچی چی هەتیو..؟! کوڕە.. کوڕ..!!

ــ خەڵەفاوی یان چاوت قورقوشمی تێکراوە، ئاوا کچت لێ بووە بە کوڕ..؟! هەر بەناوەکەیدا بزانە کچە.

ــ کوڕی ست پەخشانی فیزیایە و بەڕەچەڵەکەوە دەیانناسم.

هیچ شتێ بەقەدەر تەلەڤزیۆن ڕیسوای نەکردم.. تەلەڤزیۆن بوو بە سەرتاسەری وڵاتی ناساندم.. ئەو بوو کردمی بە میوانی هەموو ماڵێ.. ماڵی سەرۆک.. ماڵی وەزیر.. ماڵی پارێزگار.. هی پۆلیس و سەرباز.. هی دەیووت و گەواد و قەحپە و نازانم کێ و کێ... من خۆم دەنگی خۆمم پێ خۆش نییە،

چەندیش بلّێی پێم ناخۆشە و ڕقم لێیەتی، جا نازانم ئەو خەڵکە بۆ دەبێت ئەوەندەیان پێ خۆشبێت..!! بەدیار گۆرانیەکانمەوە بخۆنەوە.. مەست بن.. بگرین.. بکرووزێنەوە.. هەڵپەڕن.. سەمابکەن..؟! تەنانەت ئەوانەش حەزیان لە دەنگمە، کە کوردی نازانن و لێم تێناگەن.. من تاکە گۆرانیبێژم گۆرانیەکانم لەودیو شاخی «حەمرین»ـەوە گوێیان لێ دەگیرێت.. لەلایەن خەڵکی بیابان و زۆنگاوەکانەوە داوا دەکرێن.. ئێستا لە هەموو شتێ زیاتر ڕقم لە تەلەڤزیۆنە و بەدەستەمبێت، هەرچی تەلەڤزیۆن لەم وڵاتە هەیە بە لەقە لەتوکوتیانکەم.. ساڵێکیش زیاترە چارەی هیچ تەلەڤزیۆنێکم نەدیوە.. بەکوژاوەیش سەیریان ناکەم.. ڕادیۆ، ئەوە هەر دەمێکە وازم لە گوێگرتنی هێناوە.. ڕادیۆیەکم هەبوو، چەند بلّێی جوان.. چەند بلّێی بەنرخ.. پوورم لە فەڕەنساوە بەدیاری بۆی ناردبووم.. چووم لە سەر قەلا فڕێمدایە خوارەوە، بۆ ناو ئاپۆرەی ئەو خەڵکە.. نازانم سەری چەند کەسم لەوانە پێ شکاند، کە حەزیان لە دەنگمە و وێنەکەمیان لە ماڵ و لە دووکان و لەناو ئوتۆمبێل و بە ستێرنی پایسکیل و ماتۆڕەوە هەڵواسیوە..!! زەندەقی چەندێکم لەوانە پێ برد، کە بە بیستنی گۆرانیەکانم، هەست بە شادی و ئارامی و دڵنیایی دەکەن..!! فریشتی چەند منداڵم لەو منداڵە شیرەخۆرانە پێ خست، کە شەوان لەجیاتی لایلایە، بە گۆرانیەکانم دەیانلاوێنن..!! خۆ دووریش نییە هەتیوێکی لۆتیی دەست و قاچ کوتراو، لێزانانە هەر لە هەوادا قۆزتبێتیەوە.. دەستی بە دوگمەکەیەوە نابێت و گۆرانیەکی منی لێ بەرز بووبێتەوە.. گەورە و بچووک تا دەنگیان تیایە لەگەڵیان وتبێتەوە.. خۆشم نازانم چۆن ئاوا زوو بووم بە خۆشەویستی ئەم هەموو خەڵکە، لە کاتێکدا پڕبەدڵ حەزدەکەم ڕقیان لێمبێت.. تەنها گۆرانیبێژەکان ڕقیان لێمە، بۆیە منیش هەر ئەوانم خۆشدەوێت.. «مام گەردۆ»ی بەندوبالۆرەبێژ، ئەوەندە بێزار بووە، لای یەک دوانێ لە قۆشمەچیەکانی شار وتوویەتی:

ــ لەبەر حییزی لووسکە، کەس گوێ لە من ناگرێت.. بەجارێ نانبڕاوبووم.

من و «سامە ترسنۆک»ی پاڵەوانی چیرۆکی «خێو» زۆر لە یەکتر دەچین.. هەر دووکمان وەکو یەک ترسنۆکین، بەڵام لەوەدا جیاوازین، ئەم بۆئەوەی

ترسنۆکی و هەستکردن بەکەمییەکەی لە کەسانی تر بشارێتەوە، بەدوای ناوبانگدا دەگەڕێت، بەڵام من ناوبانگێکی زۆرم هەیە و دەمەوێت لە خۆمی دامالم.. من وا چاکترە بلێم بەدوای ئابڕوودا دەگەڕێم.. دەمەوێت چیتر بە گۆرانیبێژ نەناسرێم.. کارێ بکەم گۆرانیەکانم لە بیری ئەو هەزارەها هەزار خەڵکە بەرمەوە...

دەیان نامەم نارد و سەدان تەلەفۆنم بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئێستگە و تەلەڤزیۆن کرد، کە من چیتر حەزناکەم گۆرانییەکانم لێبدرێن، هەر وەڵامیان نەدامەوە.. هەستام خۆم چوومە لای «سەلام بازیانی»ی بەڕێوەبەری ئێستگە و تەلەڤزیۆن.. داوام لێی کرد و زۆر زۆریش لێی پاڕامەوە، کە هەرچی گۆرانییم هەیە بیسڕنەوە، کەچی ئەم نەک هەر ڕازیی نەبوو، بەڵکو پێشی وتم:

ــ بەداخەوە بۆ تۆ، کە ئاوا بیردەکەیتەوە..!! لەجیاتی لەسەر خزمەتی ئەم گەلە ڕەشوڕووتە بەردەوامبیت، وازدەهێنیت..؟!

ــ ئاخر دەزانی چی..؟!...

ــ نەخێر، نازانم.. هیچم پێمەڵێ.. تۆ هێشتا هەر منداڵەکەی جارانی و بەرژەوەندیی خۆت نازانیت، ئەوەی بۆ تۆ ڕێککەوتووە بۆ کەس ڕێک ناکەوێت.. لەمسەر و ئەوسەری وڵات کەس نەماوە نەتناسێت و دەنگتی بەلاوە خۆش نەبێت.. ڕۆژی دەیان نامەمان لەملا و لەولاوە پێ دەگات.. هەمووی هەر دەپرسێت: ئەوە بۆچی هیڤان بەرهەمی تازەی نییە..؟! چووزانن هیڤان تاقەتی لە خزمەتکردنی ئەو خەڵکە ڕەشوڕووتە نەماوە.

خواخوام بوو دەرفەتێکم بدات و بەڕاشکاوی و بەبێ پێچ و پەنا هەموو شتێکێ بۆ باسکەم، بەڵام نەیدەدا و نەیدەدا... نازانم کێ بوو تەلەفۆنی بۆ کرد و قسەی پێ بڕی.. هەرکە تەواو بوو، من پڕکێشیم کرد و پێیم وت:

ــ دەباشە مامۆستا لە ڕادیۆ چەند لێیدەدەن لێیدەن، بەڵام حەزناکەم لە تەلەڤزێۆن پیشان بدرێم.

خۆزگە هەر وامنەوتایە.. ئەوەندەی تر شێت و هاربوو:

ــ ئەم مەکرەیان خۆشە..!! نە کوێری، نە شەلی، تا شەرمت بەوە بێت خەڵک

بتبینن.. کوڕێکی جوان و ڕێکوپێک، خەڵک هەر حەز دەکەن سەیرتکەن... تۆ گوێچکەت بێنە با شتێکت پێبڵێم.

ــ فەرموو.

ــ سەرۆکی گەورەش دەنگی تۆی پێ خۆشە.. نامەیم لایە بە دەستوخەتی خۆی، داوای دوو فلیمی ڤیدیۆی لە گۆرانیەکانی تۆ کردووە.. ئەمە لە نێوان خۆم و خۆت دەرنەچێت.. من خۆشم لێت ناشارمەوە، شێتی «جوانی» و «چاوە شینەکانت» و «بالآبەرز»ـەکەتم.. حەزی دنیام لە «ماچی لێوت»ـە.. خۆ ئەو «لەنجەو لار»ـەت گڕی تێبەرداوم.. «وەرە تاوێ لام دانیشە» و «ڕێم بدە با ئەو سەر پەنجانەت بگوشم» و «تێر لە باوەشت بگرم» و «با تینویەتی چەند ساڵەم لێت بشکێ»کەتم ئەوەندە گوێلێگرتووە، هەر تەواو لەبەرم کردوون، بەلآم من دەتوانم وەکو تۆیان بڵێم..؟! نەخێر، نە من و نە هیچ کەسێکی تر ناتوانین وەکو تۆیان بڵێین.

ئەرێ من بە دەمی خۆم نەڵێم شاعیرێکی بەتوانام.. هەر هیچ نەبێت شیعرەکانم لە گۆرانیەکانم چاکترن، کەچی تا ئێستا لای دراوسێکانیشمان بە شاعیر نەناسراوم.. دایکی خۆم بە شاعیرم نازانێت.. ژمارەی ئەو خوێنەرانەی دەمناسن و شیعرەکانم پەسەند دەکەن، کورسیەکانی گازینۆیەکی لاپەڕ پڕناکەنەوە، چجای هۆڵێکی گەورە.. چەند هەوڵم لەگەڵ «تابان»ی پوورزام دا، تا تێی بگەیەنم، کە من شاعیرم و دیوانم هەیە.. شیعرەکانی خۆمم یەکە بە یەکە بۆ خوێندەوە.. کەچی سەری بادەدا و دەیوت:

ــ باوەڕم وایە تۆ گۆرانیبێژێکی بەتوانایت، ئەویش خۆم بەڕاستی پێت بڵێم حەزم لە دەنگت نییە و ئەو توانایەم تیا نەدیوی، خەڵک وا دەڵێن، بەلآم دەزانم کە شاعیر نییت. ئەگەر شاعیریش بیت، شاعیرێکی خراپیت.

ڕۆژێکیان کە تازە پشتم لە گۆرانی و ڕووم لە شیعر کردبوو، دەفتەرێکی سی لاپەڕەییم پڕکردبۆوە و بەشەرمەوە پیشانی «ئامانجی ئامە ئامان»م دا.. ئەم دەیخوێندەوە و پێدەکەنی.. منیش وردە وردە شەرم دایدەگرتم و تەریق دەبوومەوە.. بەقێزێکەوە دەفتەرەکەی داخستەوە و پێی وتم:

ــ ئەوانەی تۆ نووسیوتن، نەک شیعر نین، ڕیپۆقی چاوی شیعریش نین..

شیعر هێشتا وا بێ کەس نەبووە، تا بوودەڵەیەکی وەکو تۆ پەلاماری بدات.

چاوم پڕبوو لە فرمێسک و هیچم بۆ نەوترا.. ئەویش کە هەستی کرد بریندداربووم، کەوتە دڵنەواییکردنم:

ـ دەنگێکت پێوەیە بە دنیای ناساندوویت.. پێم ناڵێیت چییت دەوێت لەوە زیاتر..؟!

من دوایی زانییم بۆچی کەس باوەڕ ناکات من شاعیرم.. دوایی نهێنییەکەم دۆزییەوە، بەلام کەی..؟! کە هەموو شتێ بەسەرچوو بوو.. دوای پێنج ساڵ و بلاوکردنەوەی چوار دیوان.. من دەبوایە زوو دەستی خۆم بوەشێنم، بەلام ئەو ترسنۆکییەم نەیهێشت.. هەر ترسنۆکییش نەبوو بەتەنها، دوورفڕین و خۆبەزلزانینیش بوو.. من لەو هەموو شاعیرەی کۆلان و گەڕەک و شارەکەم.. لەو هەموو «قارەمانی قالە قالی» و «ئامانجی ئامە ئامان» و «حەسۆی حەسەن حەسحەس» و «جاسمی جابر جامباز» و نازانم کێ و کێ، چووم چاوم لە «ئیلیۆت» و «پاوەند» و «فرۆست» و «ڕیلکە» و «ڕۆتکە» کرد.. من وەکو بە ترسنۆک و دەستەپاچە ناسرابووم، نەدەبووایە بهێلم رووخساری شیعرەکانیشم لە هی خۆم بچن.. ڕاستە ئەمەش سەریەشەی بۆ دەخوڵقاندم و گاڵتەیان پێدەکردم، گوایە شاعیرێکی لووسکە باس لە چەک و تەقەمەنی دەکات، بەلام ئەگەر من هەر سووربوومایە لەسەر کارەکەم، ئەوا ڕۆژێک دەهات: منی لووسکە و شیعری گرگرتووم.. منی لووسکە و شیعری جۆشدراوم.. منی لووسکە و شیعری خوێناویم.. منی لووسکە و شیعری ئازام.. ئەنجام: منی ترسنۆک و دیوانی شۆڕشگێڕم.. کەسمان لە کەس.. پاکمان لە پاک.. من وام نەکرد.. ئاخر بۆیە ڕۆژم بەم ڕۆژە گەیشت... واشم بکردایە هەر سوودی نەبوو.. تازە من هەر ئەوەم، کە ناسیویانم.. ئەگەر هەرچی وشەی ئازا و گڕگرتووی فەرهەنگەکان هەیە بیانهێنم.. بیانکەم بە قوڕ و بیانشێلم.. خشتیان لێ ببڕم و بیانکەم بە خانووی شیعرم.. هێشتا هەر ئەو ترسنۆکەم، کە خۆیان دەمناسن.. هەر ئەو هەرزەکارە پێست سوور و سپییەم.. هەر ئەو کوڕە ناسک و قژتاسەرشان و گوارەلەگوێیەم، کە هەموو ڕۆژێ لە تەلەڤزیۆن دەمبینن.. ئەوا بیرم کەوتەوە، خۆ ئەو جارە «قاسم قۆچەقانی»

بەئاشکرا پێی وتم:

ــ لووسکەی وەکو تۆ هەر بۆ ئەوە باشە گۆرانی بڵێت، شاعیر کوڕی جوامێری گەرەکە.

«ڕەشادی ڕەشید ڕەشاش»یش پێی وتم:

ــ بەم دەنگەتەوە دەتەوێت شیعر بخوێنیتەوە، دەڵێی دەنگی ژنی زەیستانە..؟!

من ئێستاش نازانم بۆچی لە وشەی گوللە و فیشەک و نارنجۆک و نازانم چی و چی دەترسام..!! لەوە دەترسام ماڵی خۆم، یان هی شیعرم وێران بکەن..؟! ئا ئەمە ئەو پرسیارەیە، کە دەبوایە زووتر لە خۆمم بکردایە...

وێنەیەکی گەورەی «ئیلیۆت»م لە ژووری کتێبخانەکەمدا هەڵواسیوە.. زوو زوو لەبەرامبەری دەوەستم و لە ڕووخساری ورد دەبمەوە.. ئەویش لووسکەیەکە وەکو من.. هەندێ جار وا هەست دەکەم تەواو لەو دەچم.. ئەم بە «خاکی وێران»ی خاک و خۆڵی جیهانی هەژاند، کەچی من هەرچەند دەکەم پەردە و کوللەی تەنکی دڵی هیچ خوێنەرێکم پێ نالەرێتەوە.. بەتایبەتییش هی ئەو «تابان»ـەی پوورزام.. ئاخ..!! چەند بە ئاواتی ئەوەم شیعرێکم پەسەند بکات و نایکات...

من چەند چاوم قایمە.. ئەوە بۆچی واز لە «ئیلیۆت» ناهێنم..؟! ئیتر با بەسبێت لاساییکردنەوەی شاعیرێکی حەوت وڵات لە منەوە دوور.. ئیتر بەسە تاکەی بە شیعری ئەو سەرسام بم.. تاکەی بمەوێت وەکو ئەو بنووسم.. باش نەبوو ئەو جارە، کە لەو کۆڕە باسی شیعرەکانیم کرد، هەر بە هووها و جرت و فیکە دایاننەگرتم..!! تا ئەو ڕۆژەش من نەمدەزانی ئەوەندە شەرمن و ترسنۆکم.. هەموو گیانم دەلەرزی و زمانم تەتەڵەی دەکرد.. هیچ دوور نییە لێم تێنەگەیشتبن، ئەگینا ئەوەی من وتم هی ئەوە نەبوو چاوی لێ بپۆشرێت.. ئێستا خۆشم نازانم چییم وتووە.. هەر ئەوەندە دەزانم «دیوانی پشیلەکان»یم بەنموونە هێنایەوە.. دەمویست بڵێم: «ئیلیۆت» لە ڕێگەی پیرەجرجێکەوە، کە باس لە هەڵسوکەوت و سایکۆلۆژیای پشیلە و جۆرەکانی دەکات، ئەم شاکارەی نووسیوە.. دەمویست باسی «گراول تایگەر» و «ڕەم تەم تایگەر» و

«دیترۆنمی» و «مینگۆگیری» و «ماکاڤیتی»یان بۆ بکەم..(١). هیچ دوورنییە لە ترسـا باسی شـتی ترم کـردبێت.. لەوانەشـە گـۆڕانیم وتبـێت و بەخـۆمم نەزانیبێت.. چۆن ڕیسوابووم.. چییم بە خۆمکرد..!! ئیتر تەواو نە «ئیلیۆت» دەناسم و نە کەسی تر.. جارێکی تر سەرلەنوێ دەست پێدەکەمەوە.. هەرچی شیعری شاعیرانی کۆڵان و گەڕەگ و شارەکەم و شارەکانی دەوروپشتی شارەکەم هەن، دەیانخوێنمە و لەبەریاندەکەم.. تا کاتێک دەبینم بەبێ ئەوەی ئاگام لێبێت و بەخۆم بزانم، کەوتوومەتە ژێر کاریگەری ئەوان.. دیوانەکانم پڕبوون لە وشەی ئاگراوی و بوون بە گڕکان.. من بۆچی خۆشم لە ڕاستی گێل بکەم، ئەوەی بەوان دەکرێت، مەحاڵە بە من بکرێت.. هەمـوو نووسـەر و زانا سـایکۆلۆژییـەکـان لەسـەر ئەوە ڕێکدەکـەون، کـە ژیانی منداڵیی نووسـەر لە بەرهەمە ئەدەبییەکانیدا ڕەنگدەداتەوە.. ئەوە «چیخۆف» و «دۆیستۆفیسکی».. ئەوە «جۆیس» و «پرۆست» و «هەمەنگوای».. کەواتە دەبێت دانی پیادابنێم منی خاوەن منداڵییەکی ئاوا، مەحاڵە وەکو ئەوانم پێ بکرێت.. من کە لە منداڵیی لە دارلاسـتیک و قـۆچەقـانی دەترسـام و نەمـدەزانی بەردیان پێ بهـاوم، تازە زەحمەتە لەگەڵ چەکی سووک و قورس ڕابێم و ترسم لێیان بشکێت.. لەبیرمە برای یەکێ لەو کچانەی دایکم فیزیای پێ دەوتن، دەیویست ڕازییم بکات، پرسـیـارەکـانی سـەری سـاڵی بۆ لە دایکم بدزم.. بەشکو بە فریای خـوشکە تەمەڵەکەی بکەوێت و لە لێدان و کوتانی باوکە دڵڕەقەکەی بیپارێزێت.. داماوە لە دارلاستیکێک زیاتری نەبوو بمداتێ.. لەگەڵ یەکەم بەرد پەنجەرە گەورەکەی ژووری میوانم پێی شکاند.. ئەوە لای خـۆی دەمگرتە پۆلە چۆلەکەیەکی سـەر دارچنارەکە.. باپیرم کە ئەوکاتە چیمەنەکەی ئاو دەدا، سەرێکی ناڕەزایی بادا و وتی:

ــ نەزانیت دارلاستیک بهاوی، سبەی ڕۆژ چۆنم چەک بۆ دەتەقێنیت..!!

لەجیاتی ئەوەی خەمی شکانی پەنجەرەکەی بێت، جارێ خەمی ئەوەی بوو کچـەزاکـەی فـێری چەکتـەقـاندن نابێت.. ئەرێ بەڕاست من ئەو تفـەنگەم بەدەستەوەگرتووە، نابێت بزانم چۆنی بتەقێنم..؟! چۆن نیشانی لێ بگرم و لە تەختـی ناوچەوانی، یان لەسـەر گـۆی دڵی بدەم..؟! وەی..!! ئەوە دڵم کـەوتە

خورپە و گیانم دەستی بەلەرزین کردەوە.. ئێستا من بەتەنیا لەم دەشتە چۆڵوهۆڵە چی بکەم و پەنا بۆ کێ بەرم..؟! ئەوە چی بوو لەپڕ بە خەیاڵمدا هات..؟! باشە من نەموت نابێت بیر لە ڕابردوو بکەمەوە، ئەی ئەوە چی بوو ئەو هەموو ڕووداوە ترسناکە بە خەیاڵمدا گوزەریان کرد..؟! خۆ بەسەرێ باشیش بوو.. وانەبوایە سەرم تیا دەچوو.. دە تۆ بێنە بەرچاوت وا گەیشتووە، من چەکم ئاڕاستەی کردووە و ناشزانم بیتەقێنم.. ئەوسا ئەو.. ئەوی شارەزاو لێزان، خێرا دەست بۆ دەمانچەکەی بەر پشتی دەبات و لە چاوترووکانێکدا بە سەر دنیاوەم ناهێڵێت.. من دەبوایە زووتر بیرم لەو شتانە بکردایەتەوە و مشووری خۆمم بخواردایە.. تازە بەم دەمودەستە هیچم پێ ناکرێت.. ئەی هاوار خەڵکینە من چییم بە خۆم کرد..!! ئێستا چی بکەم و ڕوو لە کوێ بکەم..!! نە چاوم دەبینێت و نە قاچم هێزی تیاماوە.. نە گۆچانێکم دەست دەکەوێت و نە دارشەقێ، تا لەشی خاو و داهێزراومیان پێ ڕاگیرکەم.. نە منداڵێ، تا دەستی لەرزۆکم بگرێت و لەو مەرگەساتەم دووربخاتەوە.. من چەند دەبەنگم.. ئاخر شیعر ئەوە دەهێنێت، تا ئاوا گیانی خۆمی لەپێناو بخەمە مەترسییەوە..؟! ئێستا ساویلکە و کاڵفامیی خۆمم بۆ دەرکەوت.. ئێستا ددانی پیادا دەنێم، کە منی لووسکە و دەستەپاچە هەر بۆ گۆرانیوتن باشم.. چەندیان پێ وتم و گوێم لێ نەگرتن.. ئێستا ڕاستی و درووستیی قسەکانی ئەوانم بۆ دەرکەوت.. جا دوای چی..؟! دوای ئەوەی ئیفلیج و نابینا خۆم تووڕهەڵدایە ئەم دەشتە چۆڵوهۆڵ و وشکوبرینگەوە..؟! دوور لە چۆڕێ ئاو.. دوور لە لەتێ نان.. هەرچەند دەڕوانم پنجەگیایەکم بەرچاو ناکەوێت.. هەر چەند سەرنج دەدەم، شوانێ، گاوانێ بەدی ناکەم، تا داوای «کووپ»ێ شیریان لێ بکەم.. تازە تەواو.. دەمرم و کەسیش پێم نازانێت.. دوور لە زریکە و واوەیلای دایکم.. دوور لە سنگکوتانی پوور و پوورزا .. دوور لە خۆڕنینەوەی کچانی گەڕەک.. دەمرم و تاقە شیعرێکی تووڕە و یاخی لە دوای خۆمدا بەجێناهێڵم.. دەمرم و «تابان» بە شاعیرم نازانێت.. من دەمرم و خەڵکیش بێئاگا لەوەی چ پڕۆژەیەکی گەورەی شیعرنووسینم خستبووە مێشکمەوە.. دەمرم و لاشەکەم لەم ئاقارەدا بۆگەندەکات.. مەگەر تیپی سەگکوژانی سەر بە

شارەوانی ڕێگایان بکەوێتە ئەم ناوە و لەگەڵ لاشەگەلی سەگ و تانجی بۆ ناو شارم بەرنەوە.. دەمرم و «ڕۆژی ناشتنم لە سەر تاسەری شار گوڵفرۆشتن قەدەغە دەکرێت.. نەوەکا خەڵک چەپک چەپک بیهێنن بۆ سەر تەرمەکەم.. لە گۆرستانێکی دوورەدەستیش دەمنێژن» (٢)

ئەوە من بۆچی واز لە خۆشباوەڕی ناهێنم..؟! کێ مردنی منی بە خەیاڵدا دێت..؟! کێ بۆ من گونی لە خوم دەگرێت..!! تەواو.. دەمرم و ئەوانەش بە خەیاڵیاندا نایەت، کە گۆرانیەکانمیان لە دایک و باوکیان خۆشتر دەوێت.. چا من کوا ئەوەم پێ ناخۆشە..؟! من کە بە شاعیر نەناسرێم، هەرگیز ئاواتی ئەوەش ناخوازم بە گۆرانیبێژی بمرم و یادم بکرێتەوە.. لە دوای مەرگیشم وازم لێ نەهێنن....

ئەوە من بۆچی وا لە خۆم دەکەم..؟! لەجیاتی ئەوەی جورئەت بنێمە بەرخۆم، بیر لە مردن دەکەمەوە..!! ئەوە هەمووی خەتای باپیرم بوو.. خەتای ئەو قسەیەی بوو، کە چیمەنەکەی ئاودەدا و پێی وتم.. با بۆ خۆی هەر بڵێت.. خۆ بەقسەی ئەو نابێت.. دەسا خەتای خۆشمی تیایە.. من کە فێڵەکەم دۆزیوەتەوە، ئیتر بۆ سەر لە خۆم بشێوێنم..؟! تەواو.. تەواو.. ئیتر ئەمە دوا جارە بیر لە ڕابردوو دەکەمەوە.. ئەگەر تەنگوچەڵەمەکەم هەر فیشەکتەقاندنە، ئەوە ناهێنێت دڵی خۆمی پێ تەنگ بکەم.. بۆ ئەوەی بەچاکی و بەشێنەیی بیربکەمەوە، دەبێت خۆم هێور و ئارام کەمەوە.. ئێستا من باوەڕم بەبوونی پەیوەندیی نێوان چەک و قەڵەم هێناوە، یان نا..؟ هێناومە.. زۆر چاکە.. کەواتە سەری گرفتەکەم دۆزیەوە.. ئێستا ئەگەر بیر لە ڕابردووش بکەمەوە، باکم نییە و ناترسم.. با ئەو ڕۆژگارە بیر خۆم بخەمەوە، کە لە قەڵەم دەترسام.. ئەو ڕۆژانەی کە لە تەباشیری سپی و تەختەڕەشەکانی قوتابخانە دەترسام و زەندەقم لێیان دەچوو.. ساڵ تەواو بوو و من نەمویرا دەست بۆ قەڵەم و تەباشیر بەرم.. نەمدەوێرا سەیری تەختەڕەش بکەم.. ساڵێکی تریش تەواو بوو هەر نەمویرا.. بە دار ناولەپیان داڕزاندم.. بە جنێو ڕیسوایان کردم:

ــ بنووسە «دار».. هەی ئەم دارەدرێژە بە دایکت.

نەمنووسی و نەمنووسی.. من هەر ئەوە نەبوو لە قەڵەم و تەباشیر دەترسام، بەڵکو قێزم لە پیت و وشەکانیش دەکردەوە.. تا ئێستاش نازانم نهێنی لەوەدا چی بوو، کە سەیرم دەکردن، لەبەرچاوم دەبوون بە زیندەوەری ناشیرین و پیس پیس.. دەبوون بە سیسرک و قالۆنچە و مارمێلکە و شتی تر.. هەستم دەکرد بە خوێندنەوە و نووسینیان دەچنە دەممەوە.. دەیانجووم و لەناو دەممدا دەفلیقێنەوە.. سەری مارمێلکە، قاچی سیسرک، باڵی قالۆنچە، ڕیخۆڵەی مشک لە ناو دەممدا کرتەکرتیانە.. کاتێکم دەزانی وا دڵم تێکهەڵدێت و دەڕشێمەوە:

ـ بۆ لای تەنەکەی خۆڵەکە.. بۆ لای تەنەکەی خۆڵەکە.. ئەوە بۆ لەبار ئەو دایکە حییزەت نەچوویت..؟!

هەموو ئەو شتانەم لەبیرە، ئەوە نەبێت کەی ترسم شکا و یەکەم پیتم نووسی..؟! کەی فێری ناوی خۆم و باوک و باپیرم بووم..؟! هەرچەند بیری لێ دەکەمەوە ئەو سەرەتا و سەراوردەم بۆ نادۆزرێتەوە.. کەی یەکەم کۆپڵەشیعرم نووسی..؟! ئەویش نازانم.. هەر ئەوەندە دەزانم «تەریان» (٣) ڕاست بۆی چووە، مرۆڤ لەگەڵ پیسی ڕادێت و هەستی قێزکردنەوەی نامێنێت.. هەر ئەوەندە دەزانم ئەو قەڵەمەی لێی دەترسام.. ئەو پیت و وشانەی قێزم لێیاندەکردەوە، جوانترین و چاکترین شیعرم پێیان نووسی... ئەوە چییە..!! جارێکی تریش دەستم بە فشە و خۆهەڵکێشان کردەوە..؟! ئەی نەموت تەواو.. هەرچی نووسیومە بەکەڵکی هیچ نایەن..؟! دەی چاکە وا ناڵێم، بەڵام خۆ دەتوانم بڵێم ترسم لە نووسین شکا..!! خۆ توانیم بەبێ ترس قەڵەم و تەباشیر بە دەستەوە بگرم و پێیان بنووسم..!! ئێستا تەواو لەوە دڵنیا بووم، کە ترسم لە چەکیش دەشکێت.. ئەی قوربانی ئەو دەستە پیرۆزەت بم «حەمە عەلی شاسواری»، کە ئێوارەی ئەو زستانە سەختە وێنەکەیت لەسەر ڕوومەتم نەخشاند.. بەفیدای ئەو جنێوە نوقڵیانەت بم، کە لە بەر چاوی ئەو هەموو شاعیر و چیرۆکنووس و ڕەخنەگرە پێت دام.. کە ئاوا وانەی «چەک و قەڵەم»ت دادام.. من دەبووایە زووتر هۆشم بهاتایەتەوە بەر، بەڵام داخەکەم بەدەست خۆم نییە درەنگ تێدەگەم.. خۆ بمزانیایە ئاوا ئەنجامی خێر دەبێت، هەر خێرا

«مەسیح»ئاسا لاکەی تریشم بۆ زللەیەکی تری ڕادەگرت.. ڕەنگە یەکێکی تری لێدامایە، ئانوسات تێبگەیشتمایە و هەر ئەو کاتە شیعری وەکو هی ئەوم بنووسیایە.. ئێستا خاوەنی کۆمەڵێ دیوانی وەکو ئەوانەی خۆی دەبووم... ئەو «نیوتن»ـەی کە هەموومان دەیناسین.. وەکو من لە ئەنجامی زللەیەکەوە بوو بەو زانا مەزنە.. ئەو لە منداڵی بەپێچەوانەی من زۆر هاروهاچ بوو.. باوکی کە زانی بەکەڵکی ئیشکردنی کێڵگە نایەت، ناردیە قوتابخانە.. ڕۆژێ شەڕ بە کوڕێکی گەورە دەفرۆشێت و ئەمیش زللەیەکی پیادا دەکێشێت.. ئەوەندە بیری لەو زللەیە و تۆڵەکردنەوە کردەوە، تا چەک و تەقەمەنییەکی زۆری داهێنا.. هەر لەمەشەوە یاسای کێشکردنی داهێنا و شۆڕشێکی گەورەشی لە بیرکاری و فیزیادا بەرپاکرد.. من نە بیر لە تۆڵە دەکەمەوە و نە دەشمەوێت چەک و تەقەمەنیی تازە دابهێنم.. هەر ئەوەندەم دەوێت بزانم ئەو چەکەی دەستم بەکاربێنم و چەند شیعرێکی پیاوانە بنووسم.. بزانن من ژیانێکی چەند سەیر و سەمەرەم هەیە..!! ئێوە سەرنج بدەن ژیانم چەند لە ژیانی زانا و نووسەرە گەورەکان دەچێت.. «داروین» و «ئەدیسۆن» و «ئەنیشتاین»یش وەکو من لە قوتابخانە تەمەڵ بوون و دواییش بوون بە سێ ناودارترین کەسی ئەم سەر زەوییە.. «هاینریش هاینیە» زمانی دەگرت و قسەی بۆ نەدەکرا.. باوکی پێی دەوت:

ــ دڵی چییم بە پاشەڕۆژی تۆ خۆش بێت، نە دەتوانیت قسە بکەیت و نە دەزانیت وەکو کەر بزەڕیت..؟!

دواتریش بوو بە گەورەترین شاعیری ئەڵمانی.. ئیتر لە چی بترسم..؟! ئەوەندە هەیە بێئەمەک نەبم و ئەو ڕاستییە نەشارمەوە، کە لە زللەیەکی «شاسواری»یەوە لە شاعیرێکی لووسکەی ترسنۆکەوە بووم بەم شاعیرە شۆڕشگێڕە.. ئەوە بۆ «حەمە عەلی» دراوسێمان نەبوو..؟! بۆ کوڕی یەک گەڕەک نەبووین..؟! بۆ براگەورەم نەبوو..؟! چی دەبوو وابووایە و هەموو ڕۆژێ چینێکی لێ بدابوومایە..؟! ئێستا من بە گەورەترین شاعیری ئەم چەرخە ناسرابووم.. هەر لە منداڵییەوە هەستێکی زۆر سەیر و تایبەتم لە ئاستی لێداندا هەیە.. هەرچی منداڵ هەیە ڕقی لێیەتی، من حەزم لێی دەکرد.. من

حەزم نەدەکرد بۆ ئەوە باوکێکم هەبێت تا ئێواران، کە لە ئیش هاتەوە، وەکو منداڵانی تری گەڕەک، هەر لە دوورەوە بەپیریەوە بچم.. خۆم هەڵدەمە ناو باوەشی و ماچم بکات.. بمنووسێنێت بە سنگییەوە و بۆنم بکات.. بمبات بۆ بازاڕ و شتم بۆ بکڕێت.. شەوانیش هەلوور مەلوورم لەگەڵدا بکات و چیرۆکم بۆ بخوێنێتەوە.. نا.. نا.. من بۆ ئەوانە باوکم نەدەویست، بەڵکو هەر بۆ ئەوە دەمویست تا دارکارییم بکات.. خۆزگە و سەد خۆزگە ئەو «جەبار نانەوا» یەی باوکی «جیهانگیر»، باوکی من بوایە و لەسەر هەموو هەڵسوکەوتێکم چینێکی تێهەڵدامایە.. من وەکو باوکێکی ئاوام نەبوو، دایکیشم کەسێکی دڵڕەق نەبوو.. باپیریشم دڵی نەدەهات دەستم لێ بەرزکاتەوە.. ئەوە دایکم بۆ دوای مردنی باوکم شووی نەکردەوە..؟! ئەی ئێستا بۆ نایکات..؟! پڕبەدڵ حەز دەکەم شوو بە «حەمە عەلی شاسواری» بکات.. خۆزگە وایدەکرد و دەمڕاستی شاعیرە شۆڕشگێڕەکان دەبوو بە باوکم.. من دڵنیام ئەگەر دایکم بزانێت بەو شووکردنەی تاقەکوڕەکەی ئاسوودە دەبێت و سوود بە شیعری دەگەیەنێت، چەندیش بەدڵی نەبێت هەر دەیکات، بەڵام لە «حەمە عەلی» دەترسم.. دەترسم ئەو ڕازیی نەبێت.. ڕەنگە بە ژنێ ڕازیی نەبێت، کە دایکی کوڕێکی لووسکە و ترسنۆکی وەکو منە.. ئەگەر چاو لەوەش بپۆشێت، ناتوانێت چاو لە تەمەنی بپۆشێت، کە هەشت ساڵ لەو گەورەترە.. ئەم لە هەڕەتی لاویدایە.. ژیاننامەکەیم خوێندۆتەوە، کە پار لە سەر بەرگی دیوانی «قرقێنەی زۆرداری»یەکەیدا بڵاوی کردۆتەوە.. وتوویەتی سی و یەک ساڵە.. کەواتە ئێستا سی و دوو ساڵی تەواوە.. ئەوەندە هەیە دایکم تا ئێستاش گەنج و تەڕ و پاراوە.. ئەگەر لەگەڵ ئەمدا بەراوردی بکەیت دەڵێی چەند ساڵێ مناڵترە.. ئەمە سەرەڕای ئەوەی دایکم دەست بە خۆیدا دەهێنێت و کەشخەیە، بەڵام «حەمە عەلی» ئەوەندە سەری قاڵە، ناپەرژێت لە ئاوێنەشدا سەیری خۆی بکات.. دەموچاوی ترشاو.. قژی بژ و ئاڵۆزکاو.. چاوی پیس و ڕیپۆقاوی.. دانەکانی زەرد و کلساوی.. جل پەڕپووت و چرچ و بواردوو.. پێڵاو دڕاو و گۆرەوی بۆگەن و مشکخواردوو... من دەتوانم بیدەم بە گوێچکەی دایکمدا و دەشزانم دەست بەڕوومەوە نانێت، بەڵام بەڕاستی زاتی ئەوە ناکەم بەو بڵێم.. ئەگەر

پێی بڵـێم و بەدڵی نەبێت، ئەوا ئەوەندەی تر ڕیســوام دەکـات.. خـۆ ئەگـەر ڕازییش بێت ئەوا دڵی بەرامبـەرم نەرم دەبێت و دەبێتە باوکێکی میـهرەبان.. ئەوساش بەکەڵکی من نایەت.. وا چاکە بۆ ڕێککەوتی بەجێیبهێڵم، بەشکو ئەوە دنیایە وەکو دوو پاڵەوانی چیرۆکی چیرۆکنووسە ناشی و دەستەپاچەکان، لە کۆتاییدا بە یەک بگەن.. بەڵام من ئۆقرە ناگرم و ناتوانم چاوەڕێکەم.. وا چاکە بە ناوێکی خـوازراوەوە نامـەیەکی بۆ بنووسم و سـەرنجی بۆ لای ڕابکێشم.. بەڵام دەبێت زۆر وریابم و هەست نەکات من نووسیوومە.. بۆی بنووسم: «هۆ حەمە عەلی شاسواری: سڵاوی وەفاداری.. ژنێ هەیە لە ئیسکان.. چەند بڵێی جوان و خان و مان.. جوانکیلە و باڵابەرزە.. ڕەنگی جوانترە لە تەرزە.. قژی زەرد، چاوی شینە.. دەوڵەمەند و سەنگینە.. خاوەن خانووی دوونهۆم.. دەرگا و پەنجەرەی مکۆم.. درووستکراو لە ئەلەمنیـۆم.. بۆیەکراو لە ڕەنگی مـۆم.. ئوتۆمـبـیل مـۆدێل تازە.. گـەراجی بەر دەروازە.. باخی گـەورە و پانوپۆڕ.. درەختی بەرزی گەڵاشـۆڕ.. هەمووی لەمـسـەر تا ئەوسـەر.. پێشکەش بە تۆی قوڕبەسەر.. ئەو ماڵە بە تانوپۆ.. لەسەر تۆ دەکرێت تاپۆ»...

ئێستا بەقەستی «حەمە عەلی» تۆ بووی بە باوکم و هەر سێکمان بەیەکەوە لە چوار دیواری ماڵێکدا دەژین.. با ژوورەکان دابەش بکەین.. ئەمەیان ژووری نووستنەکەی تۆ و دایکم.. ئەمەشیان ژوورەکەی خـۆم.. ژووری میـوان هی هەرسـێکمانە.. دەرگـای ژووری کـتـێـبـخـانەکـەشـم هەمـوو کـاتێ بـۆ تۆ لەسـەرپشتە.. بۆشت هەیە هەر کتێبێ، کە بەدڵت نییە، بەشەق دەریبهێنیت.. بیدڕێنیت.. بیسووتێنیت.. پۆلیسئاسا دارکارییکەیت.. بەئارەزووی خۆت چی لێ دەکەیت لێی بکەیت.. وێنەکان بدڕێنێت و جام و چوارچێوەکانیان یەکە بـەیەکـــە بشکێنیت.. بۆت هـەیە ئەو وێنـە گـــەورەیەی «ئیلیـــۆت» بـە لەقـــە لەتوکوتکەیت.. هی «جـیـمس جـۆیس» بـە کـەللە ورد و خـاشکەیت.. ئەوەی «دۆیسـتـۆفـسکی» بە مـیـز بشـۆیت.. هـی «مـارسـیل پرۆست» بخـەیتـە تەنەکـەخـۆڵەکـەی بەردەرگـا.. کـتـێبی «زەردەشت ئاوا دەدوا»ی «نیـتـشـە» و «مێژووی سێکس»ی «مێشێل فۆکۆ» و «جیاوازی و دووبارە»ی «ژیل دۆلۆز» و «خولگە خـەمناکەکان»ی «لیـفی شـتـراوس» هەر بە ددان ونجڕونجـر بکەیت..

وەکو بنێشت بیانجوویت.. کتێبەکانی «فرۆید» و «جان بیاجیە» بدەیت بە منداڵە دەستفرۆشەکان.. ئەوانیش بیکەن بە لوولەی گوڵەبەڕۆژە و پاقلە.. ئەوانەی «کیرگارد» و «سارتەر» و «کامۆ» بدەی بە کچە تازەباڵقبووەکان و بۆخۆیان بیکەن بە سانتی.. ئەوانەی «هیگل» و «مارکس» بەسەر ماڵە هەژارەکانی شاردا دابەشکەیت و بۆ منداڵی ڕەشوڕووتیان بیکەن بە دایبی.. ڕۆمانەکانی «کازانتزاکی» و «مارکیز» لەجیاتی دەسڕی کلینس، لە ئاودەستیان دابنێیت و قنگیان پێبسڕیت.. شیعرەکانی «ئەدۆنیس» بکەیت بە کۆلارە.. دیوانی «خانی» و «نالی» بکەیت بە فڕفڕۆکە.. چیرۆکەکانی «شێرزاد حەسەن» بکەیت بە سفرەی نانخواردن.. بەکورتی ماڵ ماڵی خۆتە.. خۆت باوک و خۆت خاوەنماڵ.. هەموو شتێ تۆ بڕیاری لەسەر دەدەیت.. بەڵام بە مەرجێ باوکێکی دڵڕەق بیت.. لەسەر هەموو شتێ دژایەتیم بکەیت.. منیش دژایەتی تۆ دەکەم.. ئەنجام دەبێت بە شەڕمان.. بیگومان تۆ ڕازی نابیت کوڕەکەت لە فەرمانت یاخی بێت، بۆیە ناچاری دەست بوەشێنیت.. پەنا بۆ سزا بەریت.. بەڵام منیش ئیتر ئەوە نیم، کە ئەو جارە لە گازینۆ، لە بەر چاوی خەڵک زللەکەت پیادا کێشام و نقەم نەکرد.. بەرگری لە خۆم دەکەم.. لێرەدا شتێ هەیە ئاگات لێبێت، من کە دەستم کردەوە تۆ نەکەی کۆڵبدەیت.. نا نا، زیاتر تووڕە و هەڵەشە بە.. دار، بەرد، تاکەپێڵاو، دۆلکە و پەرداخ، هەرچی بەر دەستت کەوت بیوەشێنە.. شتێکی لەوە گرنگتر هەیە دەبێت بیزانیت، من کە ئازارم پێگەیشت و هاوارم کرد.. ناڵاندم و پاڕامەوە.. تۆ نەکەیت بەزەییت پیامدا بێتەوە و دەست هەڵبگریت.. من پێستێکی ناسکم هەیە، هەر بە زللەیەک سوور هەڵدەگەڕێت و ئازاری پێدەگات.. خۆ ئەو جارە دیت چۆن جێی پەنجەکانت لە سەر ڕوومەتم دەرکەوتن..؟! بەڵام بەوە باشە ڕق لە لێدان هەڵناگرم.. دەزانم تۆ ئەمەت بەلاوە سەیرە و ڕەنگە باوەڕنەکەیت.. دە ئاخر هەر ئەم شتە سەیرەش بوو تۆی کرد بە باوکم.. تۆی لە هیچی نەبووەوە کرد بەخاوەنی هەموو شتێ.. هی ژن.. هی کوڕ.. هی خانوو.. هی ئوتۆمبیل.. هی دەستەڵات.. خۆ تۆ نووسەریت و نابێت ئەو شتانەت بەلاوە سەیر بێت.. تۆ «برایانی کارامازۆف»ی «دۆیستۆفیسکی»ت خوێندۆتەوە.. کەواتە «فیۆدۆر»

چاک دەناسیت.. ئەویش کەسێکی سەیر و سەمەرەیە.. ئەم هەر بۆئەوە درۆی دەکرد، تا ڕیسوایکەن.. ئیتر لەزەتی لەوە وەردەگرت.. منیش لەزەت لە لێدانی باوک دەبینم.. ئێستا «حەمە عەلی» لە کورتی بیبڕینەوە چاکە.. لەسەر هەموو شتێ دژایەتیم بکە و لەسەر هەر هەموو شتێ دژایەتیت دەکەم.. خۆشەویستی و دۆستایەتی دەمانگەیەننە دەرگا داخراو و ڕەشەکان.. ئێمە بۆ ئەوەی هەمیشە دەرگاکانمان لەبەردەم کراوەبێت، دەبێت شیر و تیر لە یەکتر بسووین.. بۆئەوەی پرۆسەی نووسین بەردەوامبێت، دەبێت دژایەتیی یەکتر بکەین.. هەمیشە لەگەڵ یەکتر بکەوینە بێنەوبەرە.. هەر شیعرێکت نووسی پیشانمدە و بۆمی بخوێنەرەوە.. منیش هەرچیم نووسی پێش ئەوەی بۆ هەر ڕۆژنامەو گۆڤارێکی بنێرم، دەیخەمە بەرچاوی تۆ.. هی تۆ چاک بن یان خراپ دەڵێم خراپن.. هی من چاک بن یان خراپ بڵێ خراپن.. ئەو ماڵەی لەوەتەی هەیە دەنگی تیادا بەرز نەکراوەتەوە.. کەس هاواری تیادا نەکردووە.. دەمەقاڵی و حەوتوهەشتی تیا نەکراوە، دەیکەین بە شەڕگە.. بە دۆزەخ.. لەپێناوی شیعردا قوربانی بە ماڵ و سامان دەدەین.. تۆ چەند توندوتیژ بیت.. هەرچەند تووڕە و هەڵەشە بیت، ئەوەندە چاکتر زەمینە بۆ داهێنان خۆشدەکەیت.. تۆ بڕیار بدە چی بکرێت و چی نەکرێت.. جڵەوی ماڵ تۆ بیگرە دەست.. هەموو بەیانییەک داوای ڕۆژانەت لێ دەکەم، بەڵام نەکەی خێرا دەست بە گیرفانتدا بکەیت و بمدەیتێ.. چەند دەکرێت دەستقوچاوبە.. پیسکە و ڕژدبە وەک «لاداس»(٤).. وەکو باوکی ئەو منداڵانەی کە لە قوتابخانە لەگەڵم بوون و بۆیان باسدەکردم.. داماوانە وایاندەزانی کە بۆم باسدەکەن، من بەزەییم پیایاندا دێتەوە.. نەیاندەزانی خۆزگەیان پێ دەبەم.. وەکو پێم وتی نەرم و شل نەبیت.. هیچ کاتێ ئەوەت بیر نەچێت، کە باوکی.. ڕەنگە دایکم وەکو من نەبێت و تێنەگات.. هەر زوو زوو تووڕە بێت و ناڕەزایی دەربڕێت.. تف لە بەخت و ناوچەوانی خۆی بکات.. جنێو بۆ دار و بەرد ڕەوانەکات.. بەوە باشە نازانێت من تۆم بۆی دۆزیوەتەوە.. تۆ خۆشت نایزانیت.. ناشبێت بیزانیت.. ئەم ڕازیی نابێت مێردەکەی ئاوا هەڵسوکەوت لەگەڵ تاقە کوڕە نازدارەکەیدا بکات.. ئەم نازانێت «هیڤان» خۆی ئاوای دەوێت و هەر ئاواش ئاسوودەیە.. دەبێت تۆ

لێرەشدا زۆر وریابیت.. نەکەی لەگەڵ ئەویش نەرم و نیان بیت.. کە پشتی منی گـرت و هـی تـۆی بەردا، سـەری دنیـات لـێ نەیەتەوە یەک.. بەجـارێ لـە هـەردووکـمـان توورە بە.. بەجـارێ شـالاو بۆ هـەردووکـمـان بێنە.. ئێـمـەش هەردووکمان بەجووتە بەرپەرچت دەدەینەوە.. نە تۆ کۆڵبدە و نە ئێمەش خۆمان بە دەسـتـەوە دەدەین.. وا باشـتـرە ئـەو کـتـێـبـانـەم، کـە بڕیارە هـەر یـەکـەیان پەرتەوازەی لایەک بکەیت، دەستیـان لێ نەدەیت.. بەتایبەتی ئەوانەی باس لەم شـەڕەی نێـوان مـن و تۆ دەکـەن.. وا چاکـتـرە چ من و چ تـۆش زوو زوو بیانخوێنینەوە و بەسەریانکەینەوە...

ئێستـا «حـەمـە عـەلی» بەقـەسـتی دایکم منداڵێکی بووە.. کـوڕە یان کچ..؟! ئەوە تۆ بڕیاری لەسـەر بـدە.. با بڵـێین کـوڕە، چونکە تۆ حـەزت لە کـوڕە.. با بڵـێین ناویشی «ئـاگـرین»ـە.. بەناوی یەکـەم دیوانی چاپکراوت نـاوی دەنێین.. ئێـسـتـا مـن برایەکم هەیە و چیـتـر تاقـانە نیـیم.. هـەر خـۆم دەزانم چـەندم خۆشدەوێت.. هـەر خـۆم دەزانم چۆن بەبینینی شـاگەشکە دەبم، بەڵام نابێت تۆ هەستی پێ بکەیت.. نابێت دایکیشم بزانێت، کە من ئاسـوودەم.. تۆ ئاگـات لە خـۆتبـێت واز لـە توندوتیـژی نـەهێنیت.. چونکـە مـرۆڤ کـاتێ دەبێـتـە هـۆی خـولـقـاندنی نموونەیەکی تـری وەکـو خـۆی، هـەست بە تاوان دەکات.. هەست بە شـەرمـەزاری و ڕوورەشـی دەکـات.. ئەنجـام خـۆی دەخـواتەوە و خـەفـەت دایدەگـرێت.. تاکـە شـتێ، کـە دەستـی پێ بگات و ئازاری دڵـی پێ کەمکاتەوە بەزەییـە.. ئـاگاداربە وتـم بەزەیی و نـەموت خـۆشـەویستی.. مـن نـە بەزەیی و نـە خۆشـەویستیم لە تۆ ناوێت.. ئەوەی لێتی داوا دەکەم هـەر شـیعرە.. لەپێناوی شیعردا تۆی دوژمنم کرد بە باوکم.. لە پێناوی شـیعردا دایکم و ماڵ و سامانم خستە نـاو دەستت.. ئەو دەستەی یەکەمین جار لەو گـازینۆیە گڕی لە چاوەکانم بەرزکـردەوە.. دەترسم «حـەمـە عـەلی» من ئـەو هـەمـوو قـوربـانیـەم دا و هـەرچییم هەبوو لـە دایک، لە خـانوو، لە مـاڵ خـسـتـمـە سـەر ناوی تۆ، تـۆش ئەو باوکـە نەبیت، کە من دەمەوێت.. دەترسم نەتوانیت بەم ئەرکە هەستیت... دەزانـی هـەر لە خـۆمەوە دڵم لێت کـرمێ بوو.. وا هـەست دەکـەم هەڵەم کرد.. پەلەم کـرد.. من دەبووایە چاک لێم بکۆڵیتایەتەوە و بچوومایە بنجوبنەوانت، نەک ئاوا سووک و

ئاســان بە زللەیەک هەڵبـخـەڵەتێم.. ڕاسـتــە لەمــەوپێش دەمـزانی هـەمــوو نووسـەرەکـان لێتـدەترسن.. کە شـیـعرێ بڵاودەکەیتـەوە، بۆ ڕۆژی دوای ئەوە حـەوت و هەشت بـەجـارێ لەسـەرت دەنووسن و بە شـان و باڵتـدا هەڵدەدەن.. دەزانم من یەکەم کەس نییم بەدەستـی تۆ لێدانم خـواردبێت.. زۆرت داوەتە بەر شــەق و کــەللە.. لە قـوتابـخــانەش شــەقـاوەیەکی ناقـۆڵابوویت و قـوتـابی و مامۆستاکان لێتدەترسـان، بەڵام ئەوەندە بەس نییـە... بەڕاستی «حەمـە عەلی» پەشیمانم، کە ئەو بڕیارە ناکاوەم دا، بەڵام تازە کار لە کار ترازا و دەستم لە بنی هەمانەکە دەرچوو.. بزانە «حەمـە عەلی» چۆن دەستت بڕیم و لە خـشتـەت بردم..!! خـەتای خۆشـمی تیا بوو.. پەلەمکرد پەلە.. بزانە چۆن هـەمـوو سـەر و سامانی خـۆمم لەسـەر شـیعر دانا.. هەر وەکو جـاران گۆرانیم بوتایـە، باشتـر نەبوو..؟! چەندیان پێ وتم و گوێم لێنەگرتن..!!

*  *  *  *

وا بۆ دوو سـاڵ دەچێت «حەمـە عـەلی» باوکمـە، تـا ئێستـا جـارێ لێم تووڕە نەبووە.. چـاوێکی لێ سـوور نەکـردوومـەتـەوە.. زللەیەکی لێ نـەداوم.. باوکی وا هێمن و ئارام نەبووە و نابێتـەوە.. چەند بڵـێـیت دایکمی خـۆشـدەوێت و بۆی باشـە.. ڕۆحـیـان بەسـەر سـەری یەکـتـرەوە دەردەچێت.. من هـەرگـیـز باوەڕم نـەدەکــرد دایکم دوای مــردنی بـاوکم هـیـچ پیـــاوێکی تری خـــۆش بوێت.. دراوسێکانمان شتی سـەیر سەیریان لەسـەر خۆشـەویستیی ئەوان دەوت.. من خۆشم. کاتێ سەیری وێنەکانیـان دەکەم، هەستی پێ دەکەم.. سـاڵی یەکەمی زانکۆ یـەکـتـریان خـۆشـویسـتـووە و بۆ هاوینـەکـەی دەسـتـیـان بە قـوتووی هەنگوینەکەدا کردووە.. چەند مـانگێ دوای ئەوە گوم بووە.. دواتر لاشـەکەیان لە مـزگـەوتی ناو شـار فـڕێداوە.. باوکم چـەند بڵـێـیت دەوڵەمـەند بووە، بەڵام دڵودەروونێکی زۆر پاکی هەبووە.. تـەنها تاقە دایکێکی هەبووە.. ئەویش سـاڵێ پێش مردنی خۆی مردووە و موڵک و سامانەکەی بۆ بەجێهێشتووە.

*  *  *  *

شـــووكـــردنـی دایکم لـه شـــار دەنگی دایـەوە.. هـەر دوو دوو و سـێ سـێ بگەیشـتنایەتە یـەک، ئەو باسـەیان دەکـردەوە و پێـدەکـەنـین.. دەتریقـانەوە و بەپشـتدا دەکەوتن.. ئـاخ و داخـیـان هـەڵدەکێشـا.. تف و نەفرەتیـان دەنارد.. زلوونگەیان لەسەر دەدا و شتیان بۆ زیاد دەکرد:

ــ ست پەخشانیش شووی کردەوە.

ــ کام ست پەخشانە..؟

ــ ست پەخشانی فیزیا.. کۆنەژنەکەی فەرهاد جەلال.

ــ جا خۆ بەخێرێ کوڕەکەی پیاوێکە.

ــ تووخوا ئەوەش دەکەی بە پیاو..؟!ئەو لووسکەیە هەر بۆ گۆرانیوتن باشە.

ــ ئێستا وازی لە گۆرانییش هێناوە.. نازانم خەریکی چییە..!!

ــ با لەمەودوا هەر بۆ دایکی و باوەپیارەکەی بڵێت.. ئەی داوەشێی بۆ خۆت و غیرەتی هەتە..!!

ــ ئەی پێت نەوتم شووی کردووە بە کێ..؟

ــ شووی کردووە بە حەمە عەلی شاسواری.. شاعیرێکی زۆر ناسراوە.

ــ سـەیری شـانسکە.. گـەزۆیە و دەباریت..!! باشـە ئەوە چۆنـی دۆزیوەتەوە..؟!

ــ بڵێم چی.. کەس لەو خـەڵکە تێناگـات، هەمـووی سـەرێکی هـەیەو هەزار سەودا. ئەوە بیست ساڵە بێوەژنکۆشی دەکات، تازە هەوەسی مێردی بزواوە.

نووسـەران و ئەدەبدۆسـتـان یەکە بە یەکە پیـرۆزبایـی خـۆیان بـۆ گـۆڤـار و ڕۆژنامـەکـان دەنارد.. بەڕادەیەک چەند ژمـارەی تایبـەتی لـە سـەر پیـرۆزبایی دەرکران و بەرگیان بە وێنەی بووک و زاوا ڕازایەوە.. وا بـۆ دوو سـاڵ دەچێت و هـەر نەبڕاوەتەوەئەوە.. بینەران و گوێگرانی گۆرانیـەکانی منیش لە ڕادیۆ و لە تەلەڤزیۆن.. بە نـامـە و بە تەلەفۆن پیرۆزبایی لە چاکترین گۆرانیبێژی وڵات دەکەن، بەبۆنەی شـووکردنی دایکیـەوە.. نازانم لە چ ڕێگایەکیشـەوە زانیـویانە «ئاگرین»ی برام چاوی هەڵێناوە و بەبۆنەی لە دایکبوونی ئەویشەوە خۆشحاڵی

و پیرۆزبایی خۆیان دەردەبڕن و هیوای تەمەندرێژیی بۆ دەخوازن.. ڕووداوێکی ئەوەندە سەیر و سەمەرە و بەتامە، تا ئێستا هیچ ڕووداوێکی تر نەیتوانیوە جێی پێ چۆڵکات و بەلاوەی بنێت.. بزانە چییم بە خۆم کرد و چۆن ئەوەندەی تر خۆم ڕیسوا کرد.. ئەوەندەی تر ئابڕووی خۆم و هی دایکمم برد.. باشە ئەوە من نەفام بووم و بەرچاوی خۆمم نەدەدی، ئەی دایکم بۆ هەڵخەڵەتا..؟!

وەکو من بزانم دوای مردنی باوکم دەیان کوڕ، کوڕی زۆر قۆزیش پێیان وتووە.. دایک و خوشکیان ناردووە بۆ تکا و پاڕانەوە، کەچی ئەم دەستی بەڕووی هەموویانەوە ناوە.. تەنانەت لێشیان تووڕە بووە و پێی وتوون:

ــ باسی هەر چییم لەگەڵدا دەکەن بیکەن، هی شووکردن نەبێت.. پێویست ناکات خۆتان ماندووکەن، نەمکردووە و نایکەم.

کەچی ئەو ڕۆژەی دایکی «حەمە عەلی» بۆ کوڕەکەی داوای کردووە، هەر بەبێ ئەوەی بزانێت من ڕازیم یان نا، پێی وتووە:

ــ بۆ نا..؟! من لە حەمە عەلی چاکترم دەستناکەوێت.. شاعیرێکی بەتوانا و ناسراو.. کوڕێکی ڕێکوپێک.

ئەوە دایکم لە کوێ شیعری «حەمە عەلی»ی خوێندۆتەوە و پێی سەرسام بووە..؟! ئەی بۆ جارێ، هەر تاقە جارێ شیعرێکی منیشی نەخوێندەوە..؟! پێی دەوتم:

ــ شیعر بەکەڵکی تۆ نایەت و پێویست ناکات کاتی خۆتی پێ بکوژیت.. گۆرانیەکانت هەموو دیوانی دنیا دەهێنن.. تۆ نازانیت من چۆن گەز گەز بالا دەکەم، کاتێ خەڵک دەڵێن: ئەمە دایکی هیڤانی گۆرانیبێژە..!!

من ئێستا تەواو گومان لە پەیوەندیی نێوان دایکم و «حەمە عەلی» دەکەم.. هەرچەند دەکەم ناتوانم باوەڕبکەم لەمەوپێش یەکتریان نەناسیبێت.. ناچێتە ئەقڵی هیچ کەسێ ئەو خۆشەویستیە بەتینە لە نامەیەکی کورتی منەوە پەیدابووبێت.. ئەو ڕۆژە بەجووتە لەسەر جۆلانەی ناوەڕاستی چیمەنەکەدا خۆیان ڕادەهەژاند.. «ئاگرین»ی براشم بەباوەشی دایکمەوە بوو.. گڕوگاڵی دەکرد و ئەوان لە خۆشیا دەتریقانەوە.. منیان نەدیبوو.. خۆشم نەمدەویست بمبینن.. ئەم دەستی کردە ملی دایکمەوە و ماچێکی کرد.. دواییش قژە خاو و

پرەکەی لە پەنجەکانی ئالاند و پێی وت :

ــ دەزانی پەخشە باوەڕم نەدەکرد ئاوا ڕۆژێ لە ڕۆژان چوار دیواری ماڵێ کۆمانکاتەوە و ئاوا منداڵی خۆمان ببینین..؟!

ــ ئاواتەکانی مرۆڤ کەم و زۆر بەدیدێن حەمەکەم، بەڵام لەسەر حیسابی تەمەن.. کوا ئەم دانیشتنەمان چەند ساڵ لەمەوبەر بوایە..!!

کــەواتە دەمــێکە ئاواتی ئەو ڕۆژەیان خــواســتــووە.. بەڵام چی ڕێگەی بەیەکگەیشــتنی لێ گــرتبــوون..؟! ئەوەیان نازانم.. ئایا من بووم..؟! باوەڕ ناکەم.. بۆیە باوەڕناکەم، چونکە دایکم ئەگەر بیویستایە بزانێت من ڕازیم یان نا، پرسی پێ دەکردم.. ئەو هیچ شتێکم لێ ناشارێتەوە.. زووش کە منداڵ بووم بەبێ ئەوەی هیچ حیسابێکم بۆ بکات، دەیتوانی سووک و ئاسان شووی پێ بکات.. بەتایبەتی کە ناسیویەتی و زانیویەتی ئەوەندە پیاوێکی هێمن و دڵودەروون چاکە و جێگای باوکی ڕاستەقینە بۆ کوڕەکەی دەگرێتەوە.. ئەی باشە ئەو جارە «حەمە عەلی» کە زللەکەی لێ دام، چۆن ئەو هەموو جنێوەی بۆ ڕەوانە کرد..؟! تۆ بڵێی ئەو کاتە ناخۆشییان بووبێت و لە داخا ئەو هەموو جنێوەی بە من و بەو دا..؟! هیچ دوورنییە، ئەگینا من شتێکی ئەوتۆم نەوتبوو، تا ئەم دڵگرانکات.. باشە ئەمانە هەموو بخەرە لاوە.. بۆ هەر دوای نامەکەی من، هەموو شتێ بڕایەوە و کۆتایی پێ هات..؟! تۆ بڵێی دەستوخەتەکەی منیان ناسیبێتەوە..؟! بەڵام من بە شێوەیەکی وام نووسی، کە ئەگەر بۆ خۆمی بهێننەوە، نەزانم من نووسیومە... چی بکەم و چۆن ئەو مەتەڵە سەیر و سەمەرەیە شیکەمەوە..؟!

* * * *

مــاوەیەکــە من وازم لە هەمــوو شــتێ هێناوە و بەدوای ئەوەوەم بزانم چۆن دایکم و «حەمە عەلی» بەیەکتر گەیشتن.. هەندێ جار بیرم بۆ ئەوە دەچێت باوکم بێت.. هەر ئەو «فەرهاد جەلال»ـە بێت، کە ناوی بەسەر پسوولەی من و دایکمەوەیە و گوایە بیست ساڵ لەمەوبەر مردووە و لاشەکەی لە مزگەوت

دۆزراوەتەوە.. کەچی ئەوەندەی پێ ناچێت خەیاڵێکی ترم بۆ دێت و ماوەیەکی چاکیش ئەو خەریکم دەکات.. من چەند بەو چیرۆکانە پەست دەبووم، کە لە کۆتاییدا دوو پاڵەوانەکە، یاخود با بڵێین دوو دڵدارەکە بە ڕێکەوتێکی سەیر و سەمەرە و چاوەڕواننەکراو بەیەکتر دەگەیشتن.. نووسەرەکانیانم چەند بە دەستەپاچە و کەمبەهرە دەهاتە بەرچاو، کەچی نەمدەزانی هەر بەڕاستی و لە ژیانی ڕۆژانەی خۆمدا ڕێکەوتی زۆر لەوانە سەیرترم تووشدێت.. من هەر چەند ئەو سۆز و خۆشەویستییەی «حەمە عەلی» بەرامبەر بە خۆم و بە دایکم هەست پێ دەکەم، سەراسیمە دەبم.. ئیتر دەستەوستان دەبم بەرامبەر بە بیرکردنەوە و بڕیاردان.. ناشمەوێت لە خۆیان بپرسم، چونکە دەزانم ئەوەندەی تر سەرم لێ تێکدەچێت و ناگەمە هیچ سەرەنجامێک.. ئەوەندە هەیە سەرنجی ورد لە هەموو هەڵسوکەوتێکیان دەدەم.. گوێ لە قسەکانیان دەگرم و یەکە بەیەکەیان شی دەکەمەوە.. ئێستا «حەمە عەلی» ئەوەی جاران نییە.. ئەو تووڕە و توندوتیژە نییە.. ئەو پیسوپۆخڵ و جلپەڕپووت و چڵکنە نییە.. چەند بڵێیت هێمن.. چەندیش بڵێیت پاک و کۆکە.. لەشسووک.. گورجوگۆڵ.. ئیشی ئەم ماڵە هەر خۆی دەیکات.. بەیانیان کە هەڵدەستین، سەیردەکەین وا ماڵی پاککردۆتەوە و بەرچایی ئامادەکردووە.. سەر مێزەکەی ڕازاندۆتەوە و چاوەڕێی ئێمەیە.. چ قوورەتە دایکم دەست بۆ ئیشێ بەرێت.. سووک بێت، یان قورس، ئەم تووڕە دەبێت و دەیکات بە هات و هاوار.. ئەمە تاکە شتە وا لەو بکات لە دایکم تووڕە بێت.. شەوان کە «ئاگرین» هەڵدەستێت، بەسووکی و بەبێ ئەوەی بهێڵێت دایکم بە ئاگابێت، هەڵیدەگرێت و دەیباتە ژووری میوان.. هەر خۆی مەمکەشووشەی بۆ پڕدەکات لە شیر و ژیری دەکاتەوە.. بەگۆرانیەکی هێمن دەینوێنێتەوە.. هەر من دەزانم «حەمە عەلی» چ دەنگێکی خۆشی هەیە.. پڕبەدڵ حەز دەکەم هەموو شەوێ «ئاگرین» بەدەم گریانەوە خەبەری بێتەوە.. هەر بۆئەوەی گوێم لەو گۆرانیانەی «حەمە عەلی» بێت.. ئەم بەنهێنییەوە گۆرانی دەڵێت و نازانێت من وا گوێم بۆی شلکردووە.. بەخۆم دەڵێم: ئەوە بۆ نابێت بە گۆرانیبێژ..؟! خۆزگە دەبوو بە گۆرانیبێژ و سەرنجی هەموو خەڵکی ڕادەکێشا و سەرسامی دەکردن.. وای لێ دەکردن منیان

بیربچێتەوە.. هەندێ جار، کە بەتەنیا لە ژوورەکەی، یان لەناو باخەکەدا دادەنیشێت، دەست بە گۆرانیوتن دەکات.. سەرەتا سووک سووک و لەسەرەخۆ.. دوایی وردە وردە دەنگی دەنگی لێ هەڵدەبڕێت.. جار جار ئاوازی هێمن.. جار جاریش هی خێرا.. هەندێ جار مەقام و هەندێ جاریش بەستە.. من نە ئەو ئاوازانە و نە شیعری گۆرانیەکانم لەمەوپێش نەبیستووە.. دەنگی لەرەیەکی بەسۆزی تیایە.. لەرەیەک لە قوڵپی گریان دەچێت.. هەندێ جار هەر بەڕاستی دەگریت.. بەدەنگ.. بەکوڵ.. دەگری و دەگری.. دەگری و سەردادەخات.. دەگری و بێ دەنگیش نابێت، نەخێر ئینجا گەرم دەبێت.. دەچێت لەناو فلینی سەهۆڵاوەکەدا یەک دوو «شەهرەیار» و «شەهرەزاد» دێنێت و هەڵیاندەقووڕێنێت.. ئا لێرەوە گۆرانیە ئێجگار ناسکەکان.. نەغمە زۆر بەسۆزەکان دەست پێدەکەن.. ئێستا ئەگەر بشمبینێت بێ دەنگ نابێت.. ئیتر پێی ناخۆش نییە گوێی لێ بگرم.. بەڵام من نامەوێت لێی نزیک بکەومەوە.. نامەوێت وابزانێت دەنگیم پێ خۆشە.. ئەگەرچی پڕبەدڵ حەزدەکەم پێی بڵێم: تۆ گۆرانیبێژێکی مەزنی.. تۆ عاشقێکی پاکی.. بەڵام بۆ پێی بڵێم..؟! کێ دەڵێت وایە..؟! ئەگەر واش بێت هەر پێی ناڵێم.. ئێمە بڕیارمان چی بوو..؟! ئەو پەشیمان بووەوە، من نابم.. بەداخەوە بۆ ئەو، کە ئاوا فێڵی لێ کردم و دەستی بڕیم.. ئەم ئەو کەسە نییە، کە من ئاواتم دەخواست ببێت بە باوکم.. ئەو کەسە نییە، کە ئەو جارە لە گازینۆ زڵلەکەی لێ دام.. وازی لە شیعرنووسینیش هێناوە.. ئەوە ساڵێکیش زیاترە نە شیعرێکی نووسیوە و نە لاپەڕەیەکی خوێندۆتەوە.. ئەو هەموو کتێبە وا لە ناو ئەو کتێبخانەی ژوورەکەمن، کەچی هەر سەیریشیان ناکات.. مەگەر بۆ ڕێکخستنەوەی کتێبەکان بچێتە ئەو ژوورە، ئەگینا ئەوەی ڕێی تێناکەوێت ئەوێیە.. بزانە من چۆن پێشبینیەکانم کورتیان هێنا.. ئەو بەستەزمانەم کردبووە گای شاخوەشێن و وامدەزانی کتێبخانەکەم لە ناو دەبات، کەچی وا لە من چاکتر دەیانپارێزێت.. هەر بەوەدا دیارە من شاعیر نییم، کە پێشبینیەکانم ڕاست دەرناچن.. ئەو ڕۆژە کە دیم بە پەڕۆیەکی سپی، وێنە گەورەکەی «ئیلیۆت»ی پاکدەکردەوە و تۆزی سەر جام و چوارچێوەکەی دەتەکاند، پێکەنینم بەئەقڵی

خۆمدا هات.. ئێستا ناشچێت بۆ گازینۆی نووسەران.. هامشۆی ماڵی نووسەرانیش ناکات.. سەرەتا هاوڕێکانی دەهاتن بۆ ماڵ.. بەڵام کە ئەم خولْقی نەکردن و نەچوو بۆ لایان، ئەوانیش ورده ورده هاتووچۆی خۆیان کەمکردەوە.. دواتریش بەئێجگاری بڕیان.. زۆربەی کاتی ژیانی لەگەڵ دایکمدا بەسەر دەبات.. ئێواران «ئاگرین» دەبەن و بە ئوتۆمبێل دەچن بۆ پیاسە.. سەرەتا بە منیشیان دەوت بچم لەگەڵیان، بەڵام کە نەدەچووم و بەرِەقی وەڵامم دەدانەوە.. ئیتر پێیان نەوتمەوە.. خۆ من لەگەڵیشیان بچم چاکترە، بۆئەوەی بزانم بۆ کوێ دەچن.. بەشکو بچن بۆ ئەو شوێنانەی، کە جاران جێژوانیان بووە..!! ئاخۆ بچن بۆ چ پەنا و پەسارێ و یادی ئەو ڕۆژانە بکەنەوە، کە بەدزییەوە یەکتریان کردۆتەوە باوەش و خۆیان تێر ماچکردووە..!! دوورنییە بچن بۆ «باخی گڵکەند» و «باخی کووران».. کێ چووزانێت دەچن بۆ کوێ..!! ئای «حەمە عەلی» چۆن دەستت بڕیم..!! چۆن سەرت لێ شێواندم..!! نە بەهاری و نە بەداماوی پێت ناوێرم.. ئێستا تۆ دەستەڵاتی منداڵێکی وەکو «ئاگرین»ت نییە، کەچی هەر پێت ناوێرم.. دەتوانم هەر کاتێ بمەوێت بە شەق و زللە تێتکەوم.. بە لەقە ناو سکت بدرِم.. بە تف دەموچاوت بشۆم.. بەبێ ئەوەی نقە بکەیت و ئەلفوبێ هەڵێنیتەوە.. هەروەکو چۆن ئەو جارە لە گازینۆ، منیش لە ئاستی تۆدا دەلەرزیم و دەمم چووبووە کلیلەوە.. ئەوا نۆرەی من هاتووە شەق و زللە بوەشێنم، کەچی هەر تۆ براوەی و من دۆڕاوم.. ئاخر چ قوورەتە بەرِەقی قسەت لەگەڵدا دەکەم، یان دەنگت لە سەر بەرز دەکەمەوە، دایکم خێرا پەلامارم دەدا.. ئەو دایکەی لە هەموو ژیانیدا هەر دڵی ڕاگرتووم.. تا حەوت ساڵانیش دەیکردمە قەڵاندۆشکان.. ڕۆژێ لە ڕۆژان نە جنێوێکی پێ داوم و نە زللەیەکی لێ داوم، بزانە ئێستا چۆن جنێوی پیس پیسم پێ دەدا.. چۆن بە تاکەنەعل و پێلاو و مێشکوژ تێمدەکەوێت.. ئەو ڕۆژە خۆ بەچاوی خۆت دیت، کە بەو ماندوێتیە لە دەرەوە هاتمەوە و پێیم وت:

ـ دایکە برسییمە.

ئەم چۆن پیامدا هەڵشاخا و وتی:

ـ برسییتە چاوت دەرێ.. ئەوە چێشتە لە مووبەقەکە و برِۆ قوزەڵقورتیکە.

تۆ هەستایت تا لەجیاتی ئەو چێشتم بۆ تێکەیت، بەڵام من حەزم لە چێشتی دەســـتی دایکم بوو.. حــەزم دەکـــرد ئەو بۆم تێکات.. تۆ بۆچی خـــۆت تێ هەڵقورتاند..؟ نەتدەزانی ئاوا لێت تووڕە دەبم..؟! خۆ لەبیرتە پاڵێکم پێوەنایت و لەولا خۆت بە دیواری هەیوانەکە گرتەوە.. پێم وتی:

ــ ئێستا پێم ناڵێیت تۆ چییت و کێ تۆی هێناوەتە ئەم ماڵە..؟!

تۆ دەنگت نەکرد و هەر بەســەر خـۆشت نەهـێنا، بەڵام خـۆ دیت، ئەم چۆن خێرا لـە سەر کورسییەکە هەستـا و تا تینی تیابوو زللەیەکی سرەواندە پەنا گوێچکەم:

ــ ئەمـە باوکتـە و دەتکەم بـە قـوربانی هەناســەیەکی.. مـاڵ مـاڵی خـۆیەتی.. ئەگەر زۆر ناڕازییشیت، فەرموو بچۆرە دەرەوە.

باشــە «حــەمــە عــەلی» من ئاوا بە برسـێـتی ســەر بنێـمــەوە و بە زللـە لێم بدرێت..؟! هەڕەشەی دەرکردنم لێ بکرێت..؟! وا خۆت دەردەخەیت کە گوناهـ و داماوی و خەتای تۆی تیانییە..؟! خۆ ڕاستیش دەکەیت خەتای تۆی تیانییە.. خەتای خۆم بوو.. بە دەسـتی خـۆم مـاڵی خـۆمم وێران کرد.. مـن تۆم بۆ ئەوە هێنا ببـیت بە باوکم و دژایەتیم بکەیت، یان دایکمم لێ هانبـدەیت و خـۆتی لێ بێ دەنگ کەیت..؟! بۆ ئەوەم هێنایت لە سۆزی دایکایەتیم بێ بەشکەیت..؟! تۆ نازانیت من وەکو «مارسیل پرۆست» لە هەموو شتێ زیاتر پێویستم بە سۆزی دایکمە..؟! بۆ نازانیت..؟! دەیزانیت و خۆتی لێ گێلدەکەیت.. من وا ئاوات پێ دەڵێم، بەڵام خۆ لام ڕوون نییە تۆ لە چ ڕێگایەکەوە هاتی..!! بۆ ڕوون نییە..؟! وەکو ڕۆژی ڕووناک دیارە.. بەڕاستی «حەمە عەلی» کەس لە تۆ تێناگات.. هەر جارێ بەشێوەیەک دەردەکەویت.. جاران دەمڕاستی هەموو نووسەرانی وڵات بوویت بەگوشار و هێز.. ئێستاش خاوەنی ئەم ماڵەیت بەداماوی.. ئەوە تۆی بەئاشکرا شــەڕت پێ دەفــرۆشم و بەتوندی یەخــەت دەگــرم، کـەچی خـــۆت لادەدەیت و لامســەرلایی لە گێچەڵ دەکەیت..؟! ئەگەر بەڕاستیت بێت و درۆ نەکـەیت.. ئەگـەر فـێـڵێ نەبێت و بتــەوێت ڕێویانە ئەنجـامی بدەیت، ئەوا تۆ کەسێکی سەیر و ســەمــەرەیت.. زۆر لە منیش سەیرتریت.. هەندێ جار من باوەڕت پێ دەکەم.. باوەڕی تەواو دەهێنم، کە تۆ دڵودەروونێکی پاکت هەیە..

بەتایبەتی، کاتێ بەدەم گۆرانیەوە دەگریت و دەکڕووزێیتەوە.. ئاخر هیچ شتێ وەکو گۆرانی ناخی مرۆڤ دەرناخات.. خۆزگە هەر هەمووومان گۆرانیبێژ دەبووین «حەمە عەلی».. ئەوسا کەس نەیدەتوانی پیسی و پۆخڵی بخاتە دڵییەوە، چونکە کاتێ گۆرانیی دەوت، پۆخڵەواتەکانی ناوەوەی دەردەکەوت.. ئیتر زۆر بەئاسانی چاکمان لە خراپ جیا دەکردەوە.. ئێستا تۆ گۆرانیبێژێشی، بەڵام ناتوانم حوکمی تەواو و درووستت لەسەر بدەم، چونکە خۆم گۆرانیبێژ نییم.. من گۆرانیبێژ نییم «حەمە عەلی»، هیچ نەبێت تۆ باوەڕم پێ بکە.. ڕای تۆ لە هی هەموو ئەو کەسانە بەڕاستتر دەزانم، کە شێتی گۆرانیەکانمن.. تۆ گۆرانیبێژیت و تێمبگەیەنە ئەوانە بەڕاستی حەزیان لە دەنگمە، یان درۆ دەکەن، یان چی..؟! چەند سەیرە «حەمە عەلی» من خۆم دەنگی خۆمم بەلاوە ناخۆشە.. من خۆم خۆم بە گۆرانیبێژ نازانم، کەچی ئەوان بەچاکترین دەنگخۆش و گۆرانیبێژم دەزانن.. «حەمە عەلی» من دەمێکە دەمەوێت ڕای خۆم لە سەر گوێگرەکانم بدەم و ناوێرم.. دەترسم زوڵمیان لێ بکەم.. ئێستا لەوە دەرفەتتر نابێت، کە تۆی گۆرانیبێژ بوویت بە باوکم، تا لێت بپرسم: ئاخۆ ئەگەر بڵێم ئەوەی پیس نەبێت، ئەوەی ناخی بۆگەنی نەکردبێت و نەبووبێت بە زەلکاو، گۆرانییەکانی منی پێ خۆش نابێت.. چاکم وتووە، یان خراپ..؟! چۆنە وا بڵێم ئەی باوکی گۆرانیبێژم..؟! ئەوە بۆ وەڵامم نادەیتەوە..؟! ئەوە لەگەڵ تۆم نییە «حەمە عەلی»..؟!

ئەرێ ئەوە من چ «حەمە عەلی» «حەمە عەلی»یمە..؟! بۆچی ئەو پرسیارانە لەو دەکەم..؟! خۆ هەر دەڵێی بەڕاستی لە بەرامبەرم وەستاوە و گوێم لێ دەگرێت.. بیری ئەوەم نییە دوو سەعاتیش دەبێت لەگەڵ دایکم «ئاگرین»یان بردووە بۆ ئەو باخە.. تا لەوێ «تاتی تاتی»ی پێ بکەن.. «ئاگرین» وا خەریکە پێ دەگرێت.. ئەوانیش لە خۆشیا باڵدەگرن.. وەک بڵێی هەر ئەویان هەبێت.. دایکم ماوەیەکی زۆرە هەر سەیریشم ناکات.. جارێ لێم ناپرسێتەوە.. وەکو جاران سەرم ناخاتە سەر ڕانی و دەست بە قژمدا ناهێنێت.. ئێستا هەر خۆشم خۆم دەشۆم.. جاران ڕازیی نەدەبوو.. دەیوت:

ـ ژنیش بهێنیت هەر خۆم دەتشۆم.. گەورە و بچووک، بە شتنی دایک

نەبێت پاکنابێتەوە.

کەچی ئەو ڕۆژە داوام لێ کرد پشتم بشوات.. پێی وتم:

ــ خۆت بۆ نایشۆیت..؟! نابینیت وا دەستم بە «ئاگرین» گیراوە..؟!

چییت لە دایکم کردووە «حەمە عەلی» ئاوا لەگەڵم گۆڕاوە..؟! پێم بڵێ چۆنت توانی ئاوا لێزانانە هەڵیگێڕیتەوە..؟! دیسان سەرت داخستەوە، گوایە داماویت و ئاگات لە مەحموودی بێزەوال نییە..؟! خەیاڵت خاوە «حەمە عەلی» ئیتر بمخەڵەتێنیت.. لەژێرەوە دایکمم لێ هانبدەیت و لە سەرەوەش وا خۆتم پیشاندەیت، کە پشت و پەنامی.. هەر کاتێکیش زانیت من هەستم بە پۆخڵەواتەکانی ناوەوەت کردووە، دەنگی لێ هەڵبڕیت و گۆرانییم بۆ بڵێیت.. دەتەوێت بە گۆرانییەکانت سەرم لێ بشێوێنیت، چونکە دەزانیت من گۆرانیبێژ نییم و لە گۆرانی تێناگەم..؟! گەرەکتە بەو فرمێسکانەت لە خشتەم بەریت..؟! تەواو ئیتر ئەم فێڵەشت ئاشکرابوو.. تازە تەواو دەستەکەت کەوتە ڕوو.. ئیتر تۆ بەکەڵکی ماڵی من نایەیت و دەبێت بڕۆیت.. لە بەیانییەوە نامەوێت لەم ماڵە بتبینم.. چۆن هاتیت ئاواش بڕۆ.. بەدەستێ جلی کۆنی پەڕپووت و جووتێ پێڵاوی دڕاو و جووتێ گۆرەویی بۆگەنەوە هاتیت و بوویت بە خاوەنی ماڵ.. تەواو ناخۆشت کرد و لە سنوورت بردە دەرەوە.. هەر ڕۆژێ قاتێ لەبەردەکەیت و هەر جارێ بۆینباخێ دەبەستیت.. من داوات لێ دەکەم هەر بەم جلە کەشخانەوە ئەم ماڵە بەجێبهێڵیت، ئەگینا کارێ دەکەم بە جلێکی سپیی ئاودامان بەدەرتنێن.. تێمبگە مەبەستم چییە «حەمە عەلی».. لە بەیانییەوە تۆ بەزیندوویی لەم ماڵە نامێنیت.. تۆ کەسێکی سەیریت.. زۆر زۆریش سەیریت.. لە کەس ناچیت.. زۆرم هەوڵدا لێت تێبگەم و نەمتوانی.. لەوە زیاتر وزەم تیانەماوە.. خۆت دەزانی شتە سەیرەکان زوو لەناو دەچن.. سەرەتا دەبن بە جێی قسەو باس.. هەر کەسە و شتێکیان لەسەر دەڵێت.. وای لێ دێت هەزاران شتی جیاوازیان لەسەر دەوترێت.. لەسەریان دەبێت بە مشتومڕ.. بە کێشمە کێش.. بە چەندوچوون و مرخێش مرخێش.. دەبێت بە شەڕ و پێکدادان.. ئەنجام لە ناویاندەبەن.. چونکە لەناوبردنیان تاکە چارەسەری گونجاوە و هەر هەموویان لە سەری ڕێکدەکەون.. بۆئەوەی کێشەکان نەمێنن،

دەبێت شتە سەیرەکان لە ناوبچن.. ئەوە من تا بەیانی مۆڵەتم دایت.. ئەگەر ناخی خۆتت بۆ ئاوەڵا کردمەوە و هەرچی تیاتدا شاردۆتەوە دەرتخست، ئەوا چاکە.. ئەگینا گوناهی خۆت لە ئەستۆی خۆت.. تۆ لەوە مەترسە ئەگەر هەر پیلانێکت بۆ لەناوبردنم دانابێت.. لەوە مەترسە ئەگەر هەر فێڵێکی سەیر و سەمەرەت لێ کردووم.. ئەوەی گرنگە بەلامەوە و دەمەوێت بیزانم، هەر ئەوەیە تۆ کێیت..؟! چۆن گەیشتیتە ئەمماڵە و دەستت بەسەر هەموو شتێکی داگرت..؟! ئیتر من و تۆ و بەیانی...

*   *   *   *

ئەمڕۆ حەوت ساڵی ڕەبەقە «حەمە عەلی» مردووە.. بەڵام ئەو ڕۆژەی ئەو مرد، هیچ لەمڕۆ نەدەچوو.. تەنانەت سرووشتیش سیمایەکی جیای هەبوو.. سەرەتا هەورەکان کچی جوان جوان و تازە پێگەیشتوو بوون.. خۆری دامێنی ئاسمان، نینۆکەکانیانی بۆیەو دەم و لێوی سوور دەکردن.. دواییش بایەکی هێواش.. زۆر زۆریش هێواش لەودیوی قەڵاوە بۆ ناوەڕاستی ئاسمان، ڕێک بۆ سەر ماڵی خۆمانی دەهێنان.. دەستە دەستە دەیهێنان.. لەوێ دەستیان دەگرت و هەڵدەپەڕین.. سێپێیی و چۆپی هەڵدەپەڕین.. چەند نەرم و شل قاچیان دادەنا..!! چەند بەناز و عیشوەوە شانیان دەبزواند..!! چەندیش عەیارانە بە جووڵەی سەر، جووڵەیەکی لێزانانە، کە هەر لە خۆیان دەهات، بەبێ ئەوەی ڕێتمی هەڵپەرکێکەش تێکدەن، پەرچەمی خاو و لوولیان.. هی ڕەش ڕەشی وەک قەتران و هی زەرد زەردی وەک گەڵای وەریوی پایزیان لەسەر چاویان لادەدا..!! لەگەڵیا وردە دڵۆپی ئارەقە.. دڵۆپی ئارەقەی ورد وردیان دەوەراند.. سنگ و مەمکی قوتیان دەلەریەوە و لەژێر کراسی زۆر زۆر تەنکیان سەمایان دەکرد.. من ئاوام دی.. دەشێ واشنەبووبێت.. دوورنییە شین و شەپۆڕبووبێت و من چاوم ڕەشکەوپێشکەی کردبێت.. دوورنییە دەموچاویان ڕنیبێتەوە و سنگیان کوتابێت.. دەسا هەر واش بوو.. وردەچاوی بەقەدەر زەنگیانە و دەنکەنۆک و دەنکەمووروو و هەڵمات.. هی شین.. هی

ڕەش.. هی سەوز و قاوەیی دەبارینە سەر سەربان و حەوشە و باخەکەمان.. قژی زەردی وەکو هی دایکم و ڕەشی کاڵی وەکو هی «تابان»ی پوورزام، چەپک چەپک، زۆر بەسووکی، پەڕی چۆلەکە و کۆترئاسا دەکەوتنە سەر گەڵا و لقی درەختەکان.. سەر کەپری مێوەکەمان تاکو ئێستاش بەقەدەر قژی چوار ئافرەت، قژی باریوی ئەو ڕۆژەی بەسەرەوە ماوە.. هەندێ جار وا دەزانم قژی دایکمە، بەڵام هەر خێرا ئەوەم بیر دەکەوێتەوە، کە دایکم ئەو ڕۆژە نە قژی ڕنییەوە و نە وردەفرمێسکێکیشی داباراند.. ئەو لە ژووری میوان «ئاگرین»ی گرتبووە باوەش و لە تاکێکی پەنجەرەکەوە سەیری ناو حەوشەکەی دەکرد.. سەیری ئەو پیاوانەی دەکرد، کە نە من و نە ئەویش نەماندەناسین و تەرمەکەیان دەبردە دەرەوە.. بەڕاست ئەوانە کێ بوون..؟! پیاوی گەڕەک نەبوون.. شاعیر نەبوون.. چیرۆکنووس نەبوون.. هونەرمەند نەبوون.. لە کوێ ئێمەیان دەناسی..؟! من لەمەوپێش کەسێکیشم نەدیبوو لەوان بچێت.. دوای ئەوەش هەر شێوەی وەکو هی ئەوانم نەدیەوە.. باشە دایکم دەیناسین..؟! ئەی ئەگەر دەیناسین، بۆچی قسەی لەگەڵدا نەدەکردن..؟! جا کوا ئەوان قسەیان دەکرد..!! بەڕاست من زۆر گوێم هەڵخست، تا بزانم بە چ زمانێ دەدوێن، گوێم لە هیچ قسەیەکیان نەبوو.. چەند بەخێرایی شتیان و لە خامی سپییان پێچا.. چەندیش بەسووکی و بەبێ دەنگ و بەبێ چرپە بردیانە دەرەوە.. باشە بردیان بۆ کوێ..؟! ئایا دایکم گۆڕەکەی پێ دەزانێت..؟! ئەی ئەگەر پێی دەزانێت، بۆ جارێ ناچێت بۆ لای..؟! لەو ڕۆژەوە هەر جارێ باسیشی نەکردەوە.. جارێ ناویشی نەهێنایەوە.. تەنانەت ناوی لەسەر پسوولەی خۆی و هی «ئاگرین»یش نەهێشت.. «ئاگرین»یش وەکو من ناوی چووە سەر ناوی ئەو «فەرهاد جەلال»ەی گوایە باوکی منە... خۆ منیش ناوێرم لێی بپرسم.. لێشی بپرسم وەڵامم ناداتەوە.. من وا ناوێرم قسەی ئاسایی لەگەڵدا بکەم، ئینجا قسەیەکی ئاوا..!! ماوەیەکی زۆرە هیچ قسەیەکمان بەیەکەوە نەکردووە.. ئەو لەگەڵم ناکات، ئەگینا من چۆن نایکەم.. ئێستا من وەکو کرێچییەکی ڕەزاگران لەم ماڵەم.. پیاوێکی بێگانەم و هیچی تر.. لەگەڵ «ئاگرین» وانییە.. زۆری خۆشدەوێت.. هەمیشە دەیدوێنێت و گاڵتە و یاریی لەگەڵدا دەکات.. چەند دڵی

بەوە خۆشە، کە بەیانیان بۆ قوتابخانە بەڕێی دەکات.. لای ئەم و ئەو باسی زیرەکی و لێهاتوویی دەکات.. ئەو ڕۆژە بە ست «ئاواز»ی دەستەخوشکی دەوت:

ــ من لە ئێستاوە دواڕۆژی «ئاگرین»م لەبەرچاوە.. هەر لە خۆمەوە هەستێکی زۆر سەیرم هەیە، کە دەبێت بە شاعیر.

ئەم پێکەنی و وتی:

ــ لەم ڕۆژانەدا لە گۆڤارێکدا خوێندمەوە، گوایە شاعیرییش وەکو زۆر شتی تر بۆماوەیە.

دایکم وەک بڵێی قسەکەی ئەوی بەدڵ نەبێت، سەری داخست و هیچی نەوت، کەچی ست «ئاواز» هەر دەتوت مەبەستێکی هەیە، پێی وت:

ــ من بەتەواوی لەگەڵ ئەم پێشبینیەی تۆ دام.. منداڵێ شاعیرێکی گەورەی وەکو «حەمە عەلی شاسواری» باوکی بێت، هیچ دوورنییە ئەویش ببێتە شاعیرێکی ناسراو.

باشە بۆچی بەلای هیچ قسە و باسێکدا ناچێت، کە پەیوەندی بە «حەمە عەلی»یەوە هەبێت..؟! ئەمەش مەتەڵێکی تر.. ئینجا وەرە دەبێت ماوەیەکی تریش لەگەڵ ئەمە خەریک بم و هەموو شتێ بەلاوەنێم.. تۆ بزانە ئەوە بۆ نۆ ساڵ دەچێت من خەریکی هەڵهێنانی ئەم مەتەڵ و ئەو مەتەڵم.. ئەوە نۆ ساڵە نە دێڕێکم خوێندۆتەوە و نە کۆپلەشیعرێکیشم نووسیوە.. ئەوەی ئیشم پێی نەماوە کتێبە.. تاکە شوێنێ لەم ماڵە ڕێم تێیناکەوێت ژووری کتێبخانەکەمە.. ئەو ڕۆژە نازانم بۆچی ئەو دەرگایەم کردەوە.. لەبەر تۆز و خۆڵ خەریک بوو بخنکێم.. دەستم کرد بە کۆکەکۆک و تەنگەنەفەس بووم.. هەر خێرا پەنجەرەکەم کردەوە و خۆڵی ئەو هەموو ساڵەم لەسەر قەراغەکەی تەکاند.. وێنەکان پیسوپۆخڵ.. چوارچێوەکان داڕزاو.. تەونی جاڵجاڵۆکە لەم چوارچێوەی وێنەیەوە بۆ یەکێکی تر.. لەم دیوار بۆ ئەو دیوار ڕایەڵکرابوون.. کە بەر دەموچاوم دەکەوتن، ختووکەیان دەدام.. دەموچاوی «ئیلیۆت» لەبەر گوومێش تەواو گۆڕاوە.. خەریک بوو نەیناسمە.. خەریک بوو بڵێم ئەم پیاوە دەموچاو خاڵخاڵاویە کێیە، وێنەی لە ژوورەکەم هەڵواسراوە..؟! باش بوو خێرا

بیرمکەوتەوە، کە شاعیرە خۆشەویستەکەی جارانمە.. ئەو شاعیرەی، کە جاران لەو دەچووم و دەمویست وەکو ئەو بنووسم.. ئەو شاعیرەی ماڵی وێران کردم.. حەیران و سەراسیمە و ئەبڵەقی کردم.. هەر بۆ بێتاقەتی دەستم بۆ «دیوانی پشیلەکان»ی برد، تا بێزەوقانە یەک دوو لاپەڕەی لێ بخوێنمەوە، کەچی مەتەڵێکی تری سەیرم هات بەتووشەوە.. هەر خەریک بوو تا دەنگم تیایە هاوار بکەم.. تۆ وەرە سەیرکە هەرچی کتێبم هەیە مۆرانە لێی داوە، بەتەنها ئەم نەبێت مشک خواردوویەتی.. لە هەر چوار لاوە پەلاماری داوە.. هەر پشیلە و لە کونجێ تۆپی بوو.. بۆنبۆگەنی لاشەیان کاسی کردم.. هێڵنجم هاتێ و خەریک بوو بڕشێمەوە.. کلکی «دیترۆنۆمی» قرتابوو.. گوێچکەی «ڕەم تەم تایگەر» بڕابوو.. چاوی «گراوڵ تایگەر» دەرهاتبوو.. ڕیخۆڵەو هەناوی «ماکاڤیتی» بەم ناوەدا بڵاوبووبۆوە.. هەر چەند بیرم لەم شتە سەیر و عاجباتیە کردەوە، نەگەیشتمە هیچ سەرەنجامێک.. تۆ بڵێی هەروا شتێکی ڕێککەوتبێت مشک لەو هەموو کتێبی وا زۆر تەنها ئەم کتێبە بخوات..؟! چەند شتێکی سەیر و سەمەرەیە، مشکێ بەتەنیا پەلاماری ئەو هەموو پشیلەیە بدات و قڕیان تێخات.. ڕووداوی وا مەگەر هەر لەم ماڵەی ئێمەدا ڕووبدات.. لەوەتەی «حەمە عەلی» هاتووە بۆ ئەم ماڵە، هەموو شتێ دەبێت بە مەتەڵ.. هەموو قسە و پێکەنینێ.. هەموو چرپە و خشپەیێ.. هەموو جوڵانەوە و هەڵسوکەوتێ.. بەمردنیشی هەر کۆتایی نەهات.. مردنەکەی هەر خۆی سەرداری هەموو مەتەڵەکانە.. من تا ئێستاش نازانم چۆن مرد.. ڕاستە ڕۆژی پێش مردنی هەڕەشەم لێی کرد، ئەگەر ماڵ بەجێنەهێڵێت، لەناوی دەبەم، بەڵام خۆ من نەمکوشت.. کە چوومە سەری و لێفەکەم لەسەر چاوی لادا، وامزانی نووستووە.. تەنانەت لەپێشدا بانگم کرد.. چەند جارێ بەسەر یەکەوە بانگم کرد، چونکە نەمدەویست ترسنۆکانە لە خەودا بیکوژم.. دەمویست دەستەویەخە شەڕی لەگەڵدا بکەم.. دەشمزانی ئەم جورئەتی دەستکردنەوەی نییە و لە سەرکەوتنی خۆم تەواو دڵنیا بووم.. کە هەر وەڵامی نەدامەوە، ڕامتەکاند.. هەردوو شانیم گرت و بەرزمکردەوە.. دەستم لێی بەرداو سەری مردووانە و بەبێ جووڵە کەوتەوە سەر سەرینەکەی.. هەر خێرا ڕووتمکردەوە و

سەرنجم لە هەموو گیانی دا.. تاقە شوێنێکی شین و مۆر هەڵنەگەڕابوو.. ئەوەشم بیرە بەیانییەکەی، کاتێ دایکم چوو بۆ قوتابخانە لە دەرگای ژوورەکەی خۆیانەوە قسەی لەگەڵدا دەکرد.. باشە کێ کوشتی..؟! دایکم بوو..؟! بەڵام ئەو بۆ دەیکوژێت، لە کاتێکدا ڕۆحی بەسەر سەریەوە دەردەچوو.. شەو و ڕۆژ وەکو جووتەکەناری سەریان نابوو بە سەری یەکەوە و دڵدارییان دەکرد.. بەبێ یەکتر بستێ نەدەڕۆیشتن و هەنگاویکیان نەدەنا.. ئەی ئەگەر ئەوەندەی خۆشدەویست، چۆن ئاوا زوو بیری چووەوە..؟! خۆ ناچێتە ئەقڵیشەوە لەترسی هەڕەشەی من ئەترەشی چووبێت و دڵی لە لێدان کەوتبێت.. ئەمەیان هەر هیچ.. من لە دڵی خۆمدا هەڕەشەم لێ کرد.. خۆ ئەوەش مەسەلەی نامەکە نییە.. ئەویش بەهەر حاڵ و بابڵێین دەستوخەتمی ناسیوەتەوە، بەڵام قسەیەک لە دڵی خۆمدا کردوومە، چ کاری بەسەر مردنی ئەمەوە هەیە..!! ئەوەی ئێجگار بەلامەوە سەیرە و هەرچەند دەکەم سەری لێ دەرناکەم ئەوەیە، «حەمە عەلی» سەیرترە یان دایکم..؟! من وا چاکە سەر لە خۆم تێگنەدەم و بەدوای وەڵامی ئەم پرسیارەدا بگەڕێم.. جا بۆ نەگەڕاوم..؟! کەم مێشکی خۆم بۆی گوشی و لە خەیاڵمدا هێنام و بردم..؟! ئەنجامەکەی هیچ دەرچوو.. باشە با واز لە «حەمە عەلی» بێنین و بیخەینە ئەولاوە.. بێین هەموو بیر و هۆشمان تەرخانکەین بۆ دایکم.. با لە ڕۆژی مردنەکەی «حەمە عەلی»یەوە دەست پێکەین، کە لە پەنجەرەکەوە سەیری ناو حەوشە و پیاوەکانی دەکرد.. چاکتریش وایە لە نەخۆشیەکەی منەوە دەست پێ بکەین.. چونکە هەر هەمان ڕۆژ نەخۆشکەوتم و چەند ڕۆژ لەناو جێدا کەوتم.. زۆر سەیر بوو خۆ لاشەکەی «حەمە عەلی» زۆر پاک بوو.. تاقە شوێنێکی شین و مۆر هەڵنەگەڕابوو.. هیچ بۆنێکی ناخۆشیشی لێ نەدەهات.. ئەی بۆچی ئاوا قێزم لێی کردەوە و دڵم تێکهەڵات..؟! سەر تەختی نووستنەکەی ئەم و دایکمم بە ڕشانەوە نەهێشت.. لە بیرمە دایکم هەر دوای ئەوەی تەرمەکەیان بردە دەرەوە، تەختەکەی بە دۆشەگ و سەرین و لێفەوە دایە خۆڵڕێژەکان.. ئینجا سەر و چەند دیناری لە دەست نان و پێی وتن:

ــ لە شوێنێکی دوور لە ئاوەدانی بیانسووتێنن.. بەڵام بیانسووتێنن ها..!!

چاوتان لێیان نەبێت، بەکەڵکی کەس نایەن.

کە وای پێ دەوتن من لە بەر بەلووعەی ژێر کەپری مێوەکەدا دەرشامەوە و گوێم لێی گرتبوو.. بەرچاوم وا تاریک و لێڵ بووبوو، بەحاڵ دەمدین و وەکو تارمایی دەکەوتنە بەر چاوم.. چەند دەترسام، کە وای پێ دەوتن و لەگەڵیشیا پەنجەی شایەتمانی ڕادەشەقاند.. باشە بۆ دەیسووتاندن خۆ بە ئاوێ پاکدەبوونەوە..؟! نەخۆشیەکەی من ترسناک بوو، لە بڵاوبوونەوەی دەترسا، یان مردنەکەی «حەمە عەلی»..؟! ئەگەر نەخۆشیەکەی من ئەوەندە ترسناک بوو، ئەی بۆ نەدەهات بەلامەوە..؟! ئەی بۆ نەهات دەست بخاتە سەر ناوچەوانم، یان تەرمۆمەترەکە بخاتە ژێر زمانمەوە، تا بزانێت تاکەم سووکە، یان قورس..؟! بەڵام قورس بوو.. بەوەدا دەمزانی کە بنی پێم بەر جامی پەنجەرەکە دەکەوت، فێنکی دەبووەوە.. پەنجەکانیشم خاو دەبوونەوە.. چەند هاوارم کرد و گوێی نەدامێ.. خۆ دەیزانی من بەچی چاکدەبمەوە.. چەند جاریش داوام لێی کرد تا چەند شیشێ گۆشتم بۆ لەسەر خەڵووز ببرژێنێت، هەر وەڵامیشی نەدامەوە.. هەر دەتوت لەگەڵ ئەویشم نییە.. باشە من ئاوا داوای گۆشتم دەکرد، خۆ دڵیشم نەیدەبرد.. بشمخواردایە دەمهێنایەوە.. ئەو لاشەیە لە بەر چاوم دەهات و دەچوو، دڵم بە شێوەیەکی زۆر سەیر تێکهەڵدەهات.. زۆر جیابوو لەو جارانەی کە قێزم لە پیت و وشەکان دەکردەوە.. یان ئەو جارەی قێزم لە «تابان»ی پوورزام دەکردەوە.. ئاخر ئەو کاتە دایکیشم جیاواز بوو.. هەموو ئێش و کارێکی بەلاوەنا و خۆی بۆ من تەرخانکرد.. هەر ئەویش چاکیکردمەوە.. دە ئاخر هەر ئەویش تووشی کردم.. هەر ئەویش نەخۆشی خستم.. بەڵام نەیدەزانی خەتای ئەوە.. چەندیش خۆی ماندوو بکردایە، هەر نەیدەزانی.. خۆ هەوڵی زۆری دا تا بزانێت، بەڵام هەر نەیزانی.. ئێستاش نەیزانیوە.. دەبوایە بشزانێت، چونکە یەکەمجار لە حەمامەکەی خۆمان دڵم هەڵچوو.. هەر لەوێش ڕشامەوە.. ئێستاش دەڵێم خەتای ئەو بوو.. ئەو هەردووکمانی بەیەکەوە ڕووتکردەوە و ویستی بەجووتە بمانشوات.. ئەوە بۆچی چاوەکانم ئەوەندە بزێو بوون و هەر ئەوێیان دی..؟! ئایا لەبەر ئەوەبوو یەکەمجار بوو بیبینن..؟! باشە بۆچی وەکو مشکی تۆپیو

هاتە بەرچاوم..؟! خۆ من دەساڵ بووم و دەبووایە زۆر شتم بزانیایە.. ئەوە بۆچی ئاوا تێکچووم..؟! دایکم وایدەزانی هی هالاوی حەمامەکەیە.. هەر خێرا پەنجەرەکەی کردەوە.. بیری نەبوو ئێمە ڕووت بووین و سەرمامان دەبوو.. بردمی بۆ لای دکتۆر.. بۆ لای یەکێکی تر و دوان و سێیانی تریش، هەر سوودی نەبوو.. هەرچییم دەخوارد، دەمهێنایەوە.. جا کوا چیشم بۆ دەخورا..!! ڕۆژ بەڕۆژ لاواز و سیس دەبووم.. باشە ئەوە چۆن هەستیان پێ نەدەکردم..؟! خۆ من هەرچەند «تابان»م دەدی، زیاتر دڵم تێکهەڵدەچوو.. زیاتر قێزم دەکردەوە.. سەیری ئەوم نەدەکرد.. حەزم نەدەکرد بە هیچ شێوەیەک چارەی ببینم، کەچی ئەویش هەر لە بەر چاوم بوو.. دەبوایە دایکم بزانێت من قێز لە چی دەکەمەوە.. دووریش نییە زانیبێتی و دەنگی نەکردبێت.. شتێکی ئەوەندە سەیر بوو، بشیزانیایە نەیدەوت.. بەڕێگایەکی زۆر سەیریش چاکبوومەوە.. کۆنە دەستەخوشکێکی دایکم چارەسەرەکەی دۆزیەوە.. پێی وتبوو بمبەن بۆ لادێ و لە هەوای پاکی ئەوێ، چەند ڕۆژێ بەسەریەکەوە ماسیی و گۆشتی برژاوی سەر دار و خەڵوزم بدەنێ.. دەبێت هەر لای ئاگرەکەش بیخۆم.. سەرەتا بەقێزەوە دەممخستە دەممەوە.. هەستم دەکرد پارچە گۆشتی حەمامەکەیە و دەیجووم، بەڵام قووتیشم دەدا.. دوایی وردە وردە لەگەڵی ڕاهاتم.. ئیتر کە هاتینەوە ماڵیش، تا ماوەیەکی زۆر هەر ئەوە دەرمانم بوو.. جار جاریش خواردنی تر لەگەڵیدا.. لەمەوە قێزم لە «تابان»یش نەدەکردەوە.. بە «تابان» گۆشتی برژاو و بە گۆشتی برژاو «تابان»م بیر دەکەوتەوە.. وابزانم هەر ئەمەش وای لێ کردم ئەوەندە هۆگری ئەو بم.. حەزم دەکرد هەر لەگەڵ ئەو یاری بکەم.. هەر لەگەڵ ئەو سەعی بکەم.. نازانم بۆچی هەر لە خۆمەوە دەمویست بەدڵی ئەو بم.. دڵم لە ئاستیدا وا ناسک بووبوو.. ئەوەندە بەس بوو شتێکی منی بەدڵ نەبوایە، تا دەست بە گریان بکەم و ژیرنەبمەوە.. ئەویش چەند مەکرباز و عەیار بوو.. چۆن خۆی لێ کردبووم بە سەرەژن و هیچی منی بەدڵ نەبوو.. کاتێ گەورە بووم و شیعرم دەنووسی، لەپێش هەموو کەسێکەوە بۆ ئەوم دەخوێندەوە.. لەجیاتی هانم بدا، دەستی بە دەمیەوە دەگرت و پێدەکەنی.. چەند شیعرم لە داخا دڕاند و چەندیانم خستە

توونی حـەمـام و کـونی ئـاودەسـتـەوە.. دوایی ڕێگایەکی چاکم دۆزیەوە، بەڵام ئەویش هەر سەری نەگرت.. دەمنووسی و بۆ گۆڤارەکانم دەنارد، بەشکو لەوێ بڵاوکرێتەوە، ئیتر قسەی نامێنێت.. بەڵام هەموو جارێ لە گۆشەی «نامەی خـوێنـەران»دا وەڵامـیـان دەدامـەوە و هەر خـواخـوام بوو نەیانبـینێت.. ئەو سـەردەمـە دواڵاپەڕەی هەر گـۆڤـارێکت بکردایەتەوە، ناوی منت دەدی.. ڕێگایەکی ترم بەکارهێنا.. چووم بە کتێب بڵاومکردنەوە.. پارەی خۆم دەدا و چاپم دەکـردن.. جـارێکیـان چەند بە شـیـعـری «قـێـز لـە گـۆشـتـی برژاو دەکەمەوە»کەم پێکەنی.. دەیخوێندەوە و قاقای لێ دەدا.. دەیوت:

ــ تووخـوا ئەمـەشت کرد بە شـیـعـر..!! ئاخـر هەتیو کـەست دیوە قـێـز لە گۆشتی برژاو بکاتەوە..؟! گۆشتی کاڵت بوتایە هەر باشتر بوو.

ــ قێز لەویش دەکەمەوە.. تۆ تەواویکە بزانە ئەویشم وتووە، یان نا..؟!

بە گاڵتەپێکردنێکەوە وتی:

ــ ئاوا..!! قێز لە گۆشتی کاڵیش دەکەیتەوە..؟! کورە تۆ چییت..؟! شاعیری وەکو تۆ بلیمەتم نەدیوە.

ــ لە شیعردا قێزیان لێدەکەمەوە، ئەگینا وەکوتر بە برژاوی و بەکاڵییش دەست و پەنجەی خۆمیان لەگەڵدا دەخۆم.

ــ ئێستا زانییم، شاعیرە گەورەکان ئەوانەن، کە قێز لە گۆشتی کاڵ و برژاو دەکەنەوە.

لە سـەر ئەم شـیـعـرە، شاعـیـرانی کـوڵان و گـەڕەکـیش زۆر گـاڵتـەیان پێ دەکردم.. «بارام باداوەیی» پێی وتم:

ــ من دڵنیام تۆ نازانیت ڕێبازی دادائیزم چییە، کەچی وەکو دادائیستێکی نەشـارەزاش ئـەم شـیـعـرەت نووسـیـوە.. هەر وشـەیە و بـە دوای یەکـتـردا ڕیزتکردوون.

یەکێکی تر، کە ئێستا ناوەکەیم لە بیر نەماوە پێی وتم:

ــ قێزم لە شیعرە قێزەونەکەت کردەوە.

هەر خۆیشی بەگاڵتەیەکی زۆر سەیر وتی:

ــ هەر شیعرە و بەشێوەیەک کاری خۆی دەکات.. هەیە دەمانگرییێنێت، هەیە

دەمانهێنێتە پێکەنین.. وا ئەوەی تۆش قێزمان دەکاتەوە.

ئەرێ ئەوە چییە من بیر لەو ڕۆژگارە بەسەرچووەی منداڵی و هەرزەکاری دەکەمەوە..؟! شت نەماوە بیری لێ بکەمەوە، شیعر نەبێت..؟! بەکەڵکی چییم هات.. چوار دیوانم بە چاپ گەیاند، کێ تاقە شیعرێکیانی خوێندەوە..؟! چەند پێیانەوە ماندووبووم.. چەندەها شەو تا بەیانی دانیشتم و دەمنووسین و دەمسڕینەوە.. بۆ دۆزینەوەی ناونیشانێک، حەفتەیەک بیرم دەکردەوە و مێشکی خۆمم دەگوشی.. کە خەیاڵێکی سەیرم بۆ دەهات، لەگەڵیدا تووشی حاڵەتی سەیر سەیر دەبووم.. لەپێشدا شاگەشکە دەبووم.. قەڵەم و دەفتەرەکەی بەردەستمم ماچ دەکرد.. لەخۆشیا لە بەر ئاوێنەکە دەکەوتمە سەما.. ئەوەندەی پێنەدەچوو ترس دایدەگرتم.. ترسێکی سەیر، کە لە هیچ حاڵەتێکی تردا هەستم پێی نەکردبوو.. لەوە دەترسام کەسێکی تریش هەمان بیری کردبێتەوە و لەپێش منەوە بینووسێت.. هەر بۆیە خواخوام بوو زوو تەواوی بکەم و بەچاپی بگەیەنم.. دەمویست زووتر دەستی خۆم بوەشێنم.. ئەوەش هیچ.. لەوە دەترسام ئەوانەی من وا نووسیومن و ئەوەندە دڵم پێیان خۆشە، هی شاعیرێکی تربن.. باوەڕم نەدەکرد من بتوانم شاکاری وا بنووسم.. دەچووم شیعری هەموو ئەو شاعیرانەم یەکە بە یەکە دەخوێندەوە و بەسەر دەکردەوە، کە پێیان سەرسام بووم.. بۆیە ئەو کاتانەی شیعرم دەنووسی، لە هەموو کاتێکی تر زیاترم دەخوێندەوە.. ئیتر تووشی دڵەڕاوکێیەکی بێمانا دەبووم.. لە هەموو ئەوانەش سەیرتر ئەوەبوو، کە شیعرێکی چاکم دەنووسی، لە نیوەیدا هەستم بە مردنی خۆم دەکرد.. ترسی مردن دایدەگرتم و ئارامی لەبەر دەبڕیم.. ئەو شەوانە خەوم لێ نەدەکەوت و هەر لەناو پێخەفەکەمدا تلاوتلم دەکرد و ڕووداوی ترسناک ترسناک بە خەیاڵمدا دەهاتن و دەچوون.. لەوە دەترسام بمرم و ئەو شیعرە مەزنە تەواو نەکەم.. وامدەزانی مردن تەنها ئەو کاتانە زەفەرم پێدەبات، کە شیعری چاک و مەزن دەنووسم.. بەیانی کە بێدار دەبوومەوە، وامدەزانی هەر بەڕاستی لە مردن زیندووبوومەتەوە.. هەر خێرا بەبێ ئەوەی بیر لە نانی بەیانییش بکەمەوە، دەستم بەنوسینی دەکردەوە.. من کە هەمیشە یان شیعری مەزنم

دەنووسی، یان بیرم لە نووسینی شیعری مەزن دەکردەوە، ئیتر هەموو کاتێ وەکو مردوو وابووم.. تەواو باوەڕم بە «ڕۆلان بارت» هێنابوو، کە پێی وایە نووسەر مردووە.

چەند نەفام بووم.. هەموو ڕێگایەکم بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی ببم بە شاعیر و «تابان» ئافەرینم لێ بکات و بە شاعیرم بزانێت.. جارێکیان ویستم پیاوێکی کەتە و چوارشانەی ئەو خوارووەی لەسەر بکوژم.. گوایە هاتوچۆی ماڵیان دەکات و ئیتر ئەو و شیعرم لێ زەوتدەکات.. تۆ سەیری ئەو ئەقڵەکە وامدەزانی ئەو پیاوە ڕەزاگرانە کانیاوی شیعرم لێڵ دەکات.. بڵێ من هەقی ئەوم چی بوو..؟! باش نەبوو نەشمکوشت..!! ئێستا وا بیرمدەکەوێتەوە، کە چۆن لە پەنجەرەی خانووەکەی بەرامبەر ماڵیان خۆم مەلاس دابوو، تا بگاتە بەر دەرگا و بیکوژم.. سەیرە هەر لە خەون دەچێت.. باشە ئەو تفەنگەم لە کوێ هێنابوو..؟! ئەی دوایی بۆ نەمکوشت..؟! بیرمناکەوێتەوە.. باشتر.. بۆچی بیرم بکەوێتەوە.. نۆساڵیش دەبێت ئاگام لە ماڵی پوورم نییە.. بەڕاست ئەوە لە کوێن..؟! ئەوە من نامپەرژێت سەریان لێبدەم، ئەی ئەوان بۆ نایەن..؟! ئەی دایکم بۆچی نە باسیان دەکات و نە ناویان دەهێنێت..؟! ئێستا کەسانی سەیر سەیر هاتوچۆی ماڵەکەمان دەکەن، کە من لە هەموو ژیانمدا نەمدیون.. باشە ئەوە لە کوێ دێن..؟! سەروسیماشیان لە خەڵکی ئەم شارە ناچێت.. مەراقمە جارێ یەکێکیان لە بازاڕ، یان لە کۆلانێ ببینم و نایانبینم.. تەنها لەم ماڵەدا بەرچاوم دەکەون.. کەسیشیان سەیری من ناکەن.. بە بەر دەمدا دێن و دەڕۆن، بەبێ ئەوەی بزانن، یان بیانەوێت بزانن منیش هی ئەم ماڵەم و ڕۆژێ لە ڕۆژان خاوەنیشی بووم.. لەوەدەچێت دایکم ڕازیی نەبێت کەس قسەم لەگەڵدا بکات.. ئەو «ئاگرین»ـەی برام تا ئێستا قسەیەکی لەگەڵدا نەکردووم.. هەر سەیریشم ناکات.. ئەوەیان خەتای خۆم بوو.. من ئەوە هەشت ساڵە لەم ماڵەیە، جارێ ماچێکیم نەکرد و نەمکردە باوەش.. سەرەتا لەسەر بەڵێنەکەی خۆم، کە بە «حەمە عەلی»م دابوو، نەمدەویست دەریخەم، کە خۆشمدەوێت.. ئەگەرچی بۆ ماچێکی سوێم بووبۆوە.. پڕبەدڵ حەزم دەکرد بیکەمە باوەشم و بیبەمە دەرەوە.. لە ناو خەڵکدا خۆم بنوێنم، کە برام هەیە، بەلام نەمدەویست لە

بەڵێنی خۆشم پاشگەزببمەوە.. تازەش ناتوانم خۆشم بوێت.. منیش خۆشیم بوێت، ئەو خۆشی ناوێم.. سەیرە خۆ هەر لە خۆشم دەچێت.. هەردووکیشمان لە دایکم دەچین.. نە «ئاگرین» لە «حەمە عەلی» و نە من لەو وێنانەی «فەرهاد جەلال» دەچم.. جا بەچی دەچێت.. لە من بچێت، یان نەچێت چییە.. خۆ وا بەزەییشم پیایدا دێتەوە.. داماوە هەر پێی گرت و باوکی مرد.. ڕەنگە هەر نەشزانێت «حەمە عەلی» باوکیەتی.. یادی بەخێر چەندی خۆشدەویست.. چەند دڵی پێی خۆش بوو.. ئەو هەموو گۆرانیە خۆش خۆشەی بۆ وت.. مەخابن ئەو هەموو ڕەنجەی «حەمە عەلی» بەفیڕۆ چوو.. تەنانەت ناوەکەشی لەسەر پسوولەی کوڕەکەیدا سڕایەوە.. بەڕاست من بڕیار نەبوو بیر لە «حەمە عەلی» نەکەمەوە..؟! بڕیار نەبوو جارێ ئەو بخەمە لاوە و تا دایکم بەلایەکدا دەخەم، وازی لێبێنم..؟! ئەی ئەوە چییە ئەو هەموو ڕووداوە کۆن و بەسەرچووە بیری خۆم دەخەمەوە.. لە منداڵییەوە ئاوام.. کە دەمەوێت بیر لە شتێ بکەمەوە، کاتێ دەزانم ئەوەندە شتی لاوەکی و بێمانا بەخەیاڵمدا گوزەریان کردووە، هەر بەتەواوی شتە سەرەکیەکەیان بیربردوومەتەوە.. من بەڕاستی باشیش نییە ئەوەندە بیر لە دایکم بکەمەوە.. نەوەکا نەگەمە ئەنجامێک و لە داخا ڕۆژێ پەلاماری بدەم.. توند توند قوڕقوڕاگەی بگرم و بیخنکێنم.. یان هەردوو شانی بگرم و بەهەموو هێز و توانایەکمەوە، سەری بەو دیوارەی هەیوانەکەدا بکێشم.. جارێک و دوان و دە.. تا گیانی دەردەچێت و پەلەواژ دەبێتەوە.. من دەبێت زۆر ئاگام لەوە بێت و کارێکی وا نەکەم پەشیمانببمەوە.. دەبێت هەمیشە مردنیم لەبەرچاو بێت.. لەبەر ئەوەنا سوێم بۆی دەبێتەوە و ئاخ و ئۆفی بۆ هەڵدەکێشم، بەڵکو لەبەر لاشەکەی.. دەترسم جارێکی تریش حاڵەتەکەم بۆ بێتەوە.. حاڵەتی قێزکردنەوە و ڕشانەوە.. دەسا ناتوانم بیریشی لێ نەکەمەوە.. ئەو خۆی وام لێ دەکات هەموو شتێ بەلاوەنێم و تەنها و تەنها بیر لەو بکەمەوە.. بەو هەڵسوکەوتە سەیر سەیرانەی سەراسیمە و ئەبڵەقم دەکات.. با ئەو وازبهێنێت، بزانە چۆن منیش وازی لێ دەهێنم.. دەبا بێت و وەکو جاران سەرم بخاتە سەر ڕانی و بە پەنجەکانیشی قژم لوول بکات.. ئاوا تێیانبئاڵێنێت و بەسووکی ڕایبکێشێت.. منیش چاو دەبڕمە بنمیچەکەوە و

وەکــو ئـەوســای منداڵیی بیــر لـە شــتـی ســەیر ســەیر دەکــەمــەوە.. ئەوە بنمیچەکەمان بۆ وەکو ئاسمان ئەستێرەی تیا نییە..؟! بۆچی مانگ و ڕۆژی تیا نییە..؟! هەوری ڕەش و سپیی تیا نییە..؟! من بیری ئاوا دەکەمەوە و کاتژمێرەکەی قەد دیواریش «چک.. چک.. چک.. چۆن.. چۆن.. چۆن»م بۆ دەکات.. ئەمە تاکە دەنگە دێتە گوێچکەمەوە، چونکە دایکم کە یاری بە قژم دەکات، داڵغە لێدەدات و دەچێتە بیری قوولەوە.. هەندێک جار وا دەزانم نووستووە، بەڵام کاتێ سەیری چاوەکانی دەکەم، بزەیەکم بۆ دەکات.. وەک بیەوێت تێمبگەیەنێت، کە هەر خەیاڵی لای منە.. پێم دەڵێت:

ـ حەز دەکەی سبەی نیوەڕۆ چی بخۆین..؟!

ـ گۆشتی برژاو، یانییش ماسی.

ـ ئێستاش هەروەکو جاران حەزت لە ماسی و گۆشتی برژاوە..؟!

ـ زۆر.. دەزانی ماوەیەکی زۆرە خواردنی دەستی تۆم نەخواردووە..؟!

ـ خەتای خۆت بوو.

ـ خەتای خۆم بوو..؟! چۆن..؟!

ـ خۆت دەیزانی.

ـ من دەیزانم..؟!

ـ ئەی کێ..؟! ئێستا واز لەوە بێنە.. کامیانت بۆ بکەم، گۆشت یان ماسی..؟!

ـ جارێ پێم بڵێ چۆن خەتای خۆم بوو.. دوایی پێت دەڵێم کامیانم حەز لێیە.

ـ سبەی نیوەڕۆ لەسەر مێزی نانخواردنەکە پێت دەڵێم.

ـ نەء، ئێستا پێم بڵێ.

ـ خۆت ماندوو مەکە ئێستا ناتوانم پێت بڵێم و ببڕێتەوە.. دەی پێم بڵێ کامیان دەخۆیت.

ـ ماسیی سەر خەڵووز.

ـ تۆش شتێ بۆ دایکی خۆت دەکەیت..؟!

ـ شتی وەکو چی..؟!

ـ زۆر دەمێکە گوێم لە گۆرانیەکانت نەبووە.. حەزدەکەم چەند گۆرانییەکم بۆ بڵێیت.

ـ بەڵام من نە گۆرانیبێژم و نە دەنگیشم خۆشە.

ـ چۆن دڵتدێت وا بڵێیت..؟!... ئەوە بیر لەچی دەکەیتەوە..؟!

ـ لە سبەی نیوەڕۆ.. لە ماسیی سەر خەڵووز.

ـ تۆ لە ئەسپیدیلۆن دەچیت.

ـ ئەسپیدیلۆن کێیە..؟

ـ ئەسپیدیلۆن کەس نییە، گیاندارێکی ئەفسانەیی ئاوییە، زۆر زۆر لە نەهەنگیش گەورەترە.

ـ گاڵتەم پێ دەکەیت..؟

ـ نەء، تۆ وا دەزانیت گاڵتەت پێ دەکەم.. ئەسپیدیلۆن کە دەکەوێتە سەر ئاو، دەریاوانەکان وا دەزانن وشکاییە، بارگە و بارخانەی خۆیان لە سەر پشتی دەخەن، بەڵام هەر ئەوەندە ئاگریان کردەوە بۆ چێشتلێنان و خۆگەرمکردنەوە، ئیتر خۆی دەجووڵێنێت و هەر هەموویان هەڵدەگێڕێتەوە و نقوومی ناو ئاویان دەکات.. تۆ چۆن ئەوە نازانیت، خۆ من کاتی خۆی بەڕێککەوت کتێبێکم لە کتێبخانەکەی تۆدا دەرهێنا و ئەمەم تیادا خوێندەوە.

ـ من نۆ ساڵە لاپەڕەیەکم نەخوێندۆتەوە، بۆیە زۆر شتم بیرچۆتەوە.. بەڵام ئەمە گرنگ نییە.. تۆ بەخۆڕایی منێکی دەستەپاچە بەو گیاندارە ترسناکە دەچوێنیت.

ـ من بۆ ئەوەم نەوت تۆ سەغڵەت بیت.. من ڕەنگە زیاتر مەبەستم لە بەراوردی نێوانتان ئەوەبێت، ئەسپیدیلۆن بەڕێگایەکی زۆر سەیر خۆراکی دەستدەکەوێت.. بۆنی هەناسەکانی بەلای ماسییەوە زۆر خۆشن.. ئیتر ماسیی ورد و گەورە بەشوێن بۆنەکەدا دەڕۆن، تا کاتێ دەزانن وا لە قوڕگی ئەسپیدیلۆنەوە ئاودیو دەبن.

ـ ئێستا زانییم تۆ دەڵێی چی.. دەتەوێت وێرانبوونی ئەم ماڵە و تاوانی کوشتنی «حەمە عەلی»یش بخەیتە ئەستۆی منەوە.. مەبەستت ئەوەیە وا نییە..؟!

ـ هەستە دەی هەستە.. سەرت لەسەر ڕانم لابە.. خەتای من بوو لە گەڵت ئاشت بوومەوە.. ئیتر نایبینیت قسەت لەگەڵدا بکەم.

دەنگی شکانی پەرداخێ سەری پێ بەرز کردمەوە.. لە دەست «ئاگرین»ـەوە کەوتۆتە خوارەوە.. لەسەر کاشییەکانی ژێر مێزی نانخواردنەکەدا وردوخاش بووە.. ئەوە چییە..!! ئەوە چییە دەکەوێتە بەردیدەم..!! من چاوم ڕەشکەوپێشکە دەکات، یان بەڕاستی وا دایکم و «ئاگرین» و ئەو پیاوانەی تەرمەکەی «حەمە عەلی»یان بردە دەرەوە، لە دەوری ئەو مێزە کۆبوونەتەوە و ماسی دەخۆن..!! خۆ هەر جلە پیسوپۆخڵەکانی ئەو ڕۆژەشیان لەبەرە.. یائع..!! ئۆئع..!! چ دیمەنێکی قێزەونە.. دڵم تێکهەڵدێت.. سەرم گێژدەخوات.. بەوە باشە دوو ڕۆژە دەمم بەر هیچ نەکەوتووە، ئەگینا ئێستا دەڕشامەوە.. بشـڕشێمەوە، ئەوان گوێی نادەنێ و دەست لە خواردن هەڵناگرن.. تۆ سەیریانکە هەر یەکەیان بەروانکەیەکی چەرمینی سپییان بەستووە و هەردوو دەستیان تێناوە.. من دەڵێم سپی، ئەگینا لە بەر پەڵەی خوێن و چڵک.. لەبەر شوێنپەنجەی خوێناوی هیچت لێوە دیار نییە.. سەیری دایکم بکە چۆن بە چەقۆ پارچە پارچەی بچووکیان لێ دەبڕێت و لە بەردەمیان دادەنێت.. خۆ قسەش ناکەن.. ئەو ڕۆژەی تەرمەکەشیان بردە دەرەوە هیچیان نەدەوت.. ئیتر من چۆن دەتوانم واز لە دایکم بێنم و بیری لێ نەکەمەوە.. ڕۆژ بەڕۆژ لەبەرچاوم سەیرتر دەردەکەوێت...

* * * *

ئەمڕۆ دایکم تەختێکی نووستنی ساجی زۆر گەورەی کڕی.. من لە پەنجەرەی ژووری میوانەوە سەیری ناو حەوشەکەم دەکرد و بینیم.. چوار پیاوەکە هەر یەکەی لایەکیان گرتبوو، بۆ ژووری نووستنەکەیان دەهێنا.. ئەو چوار پیاوەی چواردە ساڵ لەمەوبەر تەرمەکەی «حەمە عەلی»یان بردە دەرەوە و حەوت ساڵ لەمەوبەر لە مووبەقەکەی ئێمەدا ماسییان دەخوارد.. چ ڕۆژێک بوو ئەو ڕۆژە، هەر بڕوا و نەیەتەوە.. لەو ڕۆژەوە وازم لە خواردنی ماسی هێناوە..

حەز ناکەم سەیریشیان بکەم.. ناوێرم بەلای بازاڕی ماسیفرۆشەکانیشدا بڕۆم، چونکە هەر بۆنەکەی بێت بەلووتمدا، دڵم تێکهەڵدێت و لەناو ئاپۆرەی ئەو خەڵکەدا دەکەوم و دەڕشێمەوە.. ناهەقیشم نییە زۆر بە پیسوپۆخڵی دەیانخوارد.. جلەکانیشیان زۆر پیس و چڵکن بوون.. سەیرە لەماوەی ئەو چواردە ساڵەدا ئەوە سێیەمین جارە دەیانبینم، هەر ئەو جلانەیان لەبەرە.. خۆشیان هەر ئەوانەی جارانن.. هیچ لە بەر چاوم ناگۆڕێن.. دایکیشم ناگۆڕێت.. دوێنێ، کە لەسەر جۆللانەی ناوەڕاستی چیمەنەکە دانیشتبوو، خۆی دابووە بەر هەتاوەکە.. زۆر بەجوانی لێی وردبوومەوە.. ساڵگارێک بوو ئاوا بەوردی و بەدیقەت سەرنجیم نەدابوو.. هەروەکو ئەو ڕۆژەم دەهاتە بەر چاو، کە لەگەڵ «حەمە عەلی» ئاوا بەجووتە دانیشتبوون.. ئەوەم بیر کەوتەوە، کە ماچی دەکرد و بەپەنجە ختووکەی قژی دەدا.. ڕەنگوڕووی هەروەکو جارانە.. قژی هەر زەردە.. چاوە شینەکانی هەروەکو جاران جوانن.. چەند سەرنجم لە دەموچاوی دا، چرچییم تیادا نەدی.. خۆ ئێستا تەمەنی لە پەنجاش زیاترە.. ئەوەتا «ئاگرین»یش پیاوێکە.. هەر دوێنێش بۆم دەرکەوت ئێمە لە تایەفەیەکی سەیرین.. لە بەر ئەو ئاوێنەیەدا بۆم دەرکەوت، کە تیایدا سەیری خۆمم دەکرد.. من چەند ساڵ بوو سەیری ئاوێنەکانم نەدەکرد.. حەزم نەدەکرد بیچمی خۆم ببینم.. وامدەزانی خەم و خەفەت دایانڕزاندووم، کەچی وانەبوو.. هەر ئەوەی جارانم.. لە دوێنێوە حەزدەکەم هەر لە بەر ئاوێنەدا بوەستم و سەرنج لە دەموچاو و بالای خۆم بدەم.. وا هەستدەکەم هێشتا تەمەنێکی زۆرم بەدەستەوە ماوە.. جاران دەترسام تەمەنم بەشی دۆزینەوەی وەلامی ئەو هەموو پرسیارە نەکات، کە لە خۆمیان دەکەم.. دەترسام من لە پێش دایکمەوە بمرم و لە نهێنیەکانی نەگەم.. ئەو ڕۆژانەم بیردەکەوتەوە، کە ڕقم لە لووسکەیی خۆم دەبووەوە.. ئێستا دەزانم جۆری پێست و ڕەنگوڕوومان زۆر لەبارە بۆ ئەم کێشمە کێشمە.. زۆر گونجاوە بۆ ئەم شەڕە درێژخایەنە.. بۆ هەڵهێنان و شیکارکردنی ئەم مەتەڵ و ئەو مەتەڵ.. هەر دوور نەڕۆین ئەم تەختی نووستنەی ئەمڕۆ دایکم کڕیویەتی، ساڵگارێکی دەوێت تا تێیبگەم بۆ چییەتی..؟! چی لێ دەکات..؟! جێگای چەند کەسی لەسەر دەبێتەوە..؟! بۆچی

ئەو چوار پیاوە هیێنایان..؟! هێنایان و وا لەناو چیمەنەکە دووانیان چوارمشقی دانیشتوون و دووانەکەی تریان پاڵکەوتوون.. ئەوە چاوەڕێی چین..؟! ئەگەر ئیشیان تەواوبووە، بۆ ناڕۆن..؟! من دەبوایە ئەو ڕۆژە هەستم بە شتێ بکردایە، کە دایکم بانگی خۆڵڕێژەکانی کرد، تا ژووری کتێبخانەکەم پاکبکەنەوە.. ئەوان بە عەرەبانەی دەست لەتەکتێبی زەردهەڵگەڕاو و مۆرانەخواردوو، وردەجامی شکاو و چوارچێوەی ژەنگگرتووی وێنە و شتی تر، کە نەمدەزانی چین، دەیانهێنان و دەیانکرندنە دواوەی لۆرییەکەی بەر دەرگا.. ئینجا سۆندەی ئاوەکەیان هێنا و شتیان.. دیوار و پەنجەرە و کاشییەکانیان هەر هەمووی شت.. ڕۆژی دوای ئەوە چوار کرێکار هاتن، دەستێکیان تێگێڕا و کونوکەلەبەرەکانیان پڕکردەوە.. دوانی تر هاتن بۆیەیان کردەوە.. تاکە تەختی نووستنەکەی «ئاگرین»یان لە تاکە تەختەکەی دایکم جیاکردەوە و هێنایان بۆ ئەوێ.. کردیان بە ژووری «ئاگرین».. ئەوەی دایکمیان برد و لەو بەردەمە سووتاندیان.. ئێستا چەند ڕۆژێکە «ئاگرین» لەو ژوورەی بەرامبەر ژووری من دەنوێت.. هەر لەوێش لەسەر ئەو تەختەی خۆی بەرامبەر بە من دادەنیشێت.. لەوەتەی هاتۆتە ئەوێ، سەیرم دەکات و لێم وردەبێتەوە.. هەر دەڵێیت تازە دەمبینێت.. چەند خێرا ئەو ژوورەی ڕێکخستەوە..!! لایەکی کرد بە کتێبخانە.. باوەش باوەش کتێبی هێنا و ڕێکیخستن.. باشە ئەو کتێبانە چین و بە چ زمانێ نووسراون..!! خۆ من جاران کتێبم دەخوێندەوە و ناوی زۆر کتێبم دەزانی.. جار جار شیعریشم دەنووسی.. ئەی بۆچی ئێستا سەر لەو کتێبانەی ئەو دەرناکەم..؟! ئەو وێنانەی هەڵیواسیون، هی کێن..؟! ناویان چییە و خەڵکی کوێن..؟! ئەوە زانییم ئەو مرادخانیلەبەر و پشتێنلەپشت و کڵاشلەپێ و جامانەبەسەرانە خۆمانەن.. بەڵام کێن و ناویان چییە..؟! ئەو چەکانەیان بۆ پێیە..؟! کێی پێ دەکوژن..؟! ئەی ئەو ڕیشدرێژ و سمێڵزلە کێیە لەو سووچە..؟! ئەو سەرکەچەڵە چەناگەباریکە ناوی چییە..؟! ئەو کورتەبنە سمێڵزلە بۆچی ئاوا تووڕەیە..؟! ئەو پیاوە کێیە کاسکێتی لەسەرکردووە..؟! ئەو لووسکە چاودەنکەنۆکە کوێندەرییە..؟! ئەو... ئەویتر.... ئەوانەی ئەولا.... ئەوانەی ئەولاتر... نازانم نا.. هەر زۆر زۆرن.. ئەوە ئەو شمشێرە دارە، یان

ڕاسـتـەقـینـەیە بەم دیوارەوە هـەڵواسـراوە..؟! ئەی ئەو خـەنجـەرە..؟! ئەی ئەو تفەنگە..؟! تۆ بڵێیت ئەگەر لێی بپرسم ئەم کتێبانەی بۆ چییە، ئەو وێنانەی بۆچی هەڵواسـیـوە، پێم نەڵێت..؟! جـا تووخـوا من بـە چ چاوڕوویێ قـسـەی لەگەڵدا بکەم.. ئەوە پانزدە ساڵە نەمدواندووە.. سەیریم نەکردووە.. ئێستا بچم پرسـیـاری لێ بکەم..؟! دوایی من بە چ هـەقێ پرسـیـاری لێ بکەم.. ژووری خۆیەتی حـەزبکات سـەگ و پشیلەی تیادا بەخێو دەکات.. ئارەزووی لێ بێت کەری تیا دەبەستێتەوە.. جاران کە ژووری من بوو، کەس دەیتوانی پێم بڵێ ئاوای لێ بکە و ئاوای لێ مـەکـە..؟! من هـەقی ئەوەم نییـە هیچ پرسـیـارێکی لێبکەم، بەڵام بەڕاستی ناشتوانم لە ئاست ئەو سەیرکردن و سەرنجدانەی.. لە ئاست ئەو مۆڕەکردن و چاوسوورکردنەوەیەی بێ دەنگ بم.. بێ دەنگیش نابم چی دەکـەم..!! چییـم لە دەسـتـدێت..!! ئەی ئەو چی لە دەسـتـدێت..!! من وا هەسـتـدەکـەم لەوەتەی هاتۆتە ئەم ژوورە، ئەو پەیوەندیەی جـارانی لەگـەڵ دایکمـدا نەماوە.. کـوا ئەوەندە نایانبینم بەیەکـەوە..!! پێرێ کـە چیمـەنـەکەم ئاودەدا، گوێم لێ بوو بەسەریدا هاوار دەکرد:

ــ ئیـتـر ئەوەندە بۆ هـەمـوو شـتێ بانگی من مـەکـە.. خـۆت وا گـەورە و تەواویت.. لەمەودوا خۆت ئیشی خۆت بکە.

یەکـەمـجـار بوو گـوێم لێی بێت لێی تووڕەبێت.. ئەوە دوو ڕۆژە نـەمـدیوە قسـەش بەیەکەوە بکەن.. دایکم ئەم بەیانییە بەتەنیا نانی دەخوارد.. دەیخوارد و خـەیاڵ دەیبردەوە.. بیری لە چی دەکردەوە..؟! دەزانم و چاک دەزانم بیری لە چی دەکردەوە.. هێشتا بەشی ئەوەم ئەقڵ تیاماوە لە شت بگەم.. هەر دەمزانی شتێکی بەدەستەوەیە.. کە لەکاتی نانخواردندا خـەیاڵی بڕوات، دەزانم شتێ لەم مـاڵەدا ڕوودەدات.. هـێـشـتـا سـەر مـێـزەکـەی پاکنەکـردبـۆوە، تەخـتی نووستنەکەیان هێنا.. هێنایان و بردیانە ژوورەوە.. باشە ئەوە خۆ هەروا لەناو ئەو چیمەنەن.. لەوە ناچێت بڕۆن.. چەند لەیەکتریش دەچن..!! جلیشـیان وەکو یەکە.. ئەوە ماڵیـان لە کوێیە..؟! ئایا بەیەکەوە دەژین..؟! هـاوڕێی یەکترن..؟! لە گازینۆ بەیەکـەوە چا دەخـۆنەوە و دۆمینە و تاوڵە دەکەن..؟! لەوە دەچێت تەنها ئەو کاتانە یەکتـر ببینن، کە دایکم ئیشی پێیان دەبێت.. من هەر لە خۆمەوە

وادەزانم هەریەکەیان لە شوێنێ دەژین.. وا هەست دەکەم لە زمانی یەکتریش تێناگەن، بەڵام هەر کاتێ دایکم بانگیان بکات، بەیەکەوە کۆدەبنەوە.. من نەمدیوە بەیەکەوە قسە بکەن، کەچی هەر دەڵێیت دەنگێ لە غەیبەوە پێیان دەڵێت: وا بکەن و وا بڕۆن.. تۆ ئێستا ئاوا سەیریان مەکە، دووانیان چوارمشقی دانیشتوون و دووانەکەی تریان پاڵکەوتوون.. ئەوە کاتی پشوویانە.. دە ئەو کاتە بیری خۆت بخەرەوە، کە تەرمەکەی «حەمە عەلی»یان بردە دەرەوە.. هەموو جووڵەیەکیان هاوکات و هاوئاهەنگ بوو.. بەیەکەوە و لەیەک کاتدا دانەوینەوە.. دەستیان بۆ برد.. هەڵیانگرت.. ئاودیویانکرد.. یان ئەم بەیانییە، کە تەختی نووستنەکەیان هێنا.. ئەوە چی لەم ماڵەی ئێمەدا ڕوودەدات و بەخۆشمان نازانین..!! ئەو برایەشم هەروا مۆڕەم لێ دەکات و شیر و تیرم لێ دەسوێت.. کێ دەڵێت براشمە.. ئێستاش نازانم چۆن لە دایک بوو..؟! چۆن گەورە بوو..؟! کوڕی کێیە..؟! ڕەنگە باسی «حەمە عەلی»ی بۆ بکەم، هەر باوەڕیشم پێ نەکات.. جا بۆچی باوەڕم پێ بکات..؟! ئەم بەڵگەی هەیە کوڕی «فەرهاد جەلال»ە، من کوا بەڵگەم..؟! ئەی من کوڕی کێم..؟! دە تۆ واز لەوانە بێنە و پێم بڵێ ئیتر ئەو چوار پیاوە لەم ماڵە دەمێننەوە..؟! لەگەڵ ئێمە دەژین..؟! لە ژوورەکەی دایکم دەنوون..؟! هەر بەو جلە پیسوپۆخڵانەوە دەنوون..؟! ژنێ بۆ چوار پیاو..؟! نەبووە و نابێت.. لەوەتەی هەم هەر چوار ژنم بۆ یەک پیاو بیستووە.. ئاینییش ڕێگای داوە.. لەم ماڵەی ئێمەدا هەموو شتێ ئاوەژووبۆتەوە.. خەتای دایکمە.. لە فەرمانی خودا و لە فەرموودەی پێغەمبەرەکان یاخییە و شووڵی لێ هەڵکێشاوە.. من بەزەییم بەو هەتیوەی براشمدا دێتەوە.. ئەو منداڵە و ئەقڵی بەم شتانەدا ناشکێت.. من ڕۆژگاری «حەمە عەلی»یم لە بیرە.. من گۆرانیەکانیم لە بیرە.. گورجوگۆڵی و لەشسووکییەکەیم لەبیرە.. ڕۆژی مردنەکەیم لەبیرە.. ئەم چووزانێت.. بزانە من چەند زوو هەستم بە گۆڕانی دایکم کرد.. چۆن سەرنجم لە هەموو هەڵسوکەوتێکیان دەدا.. هەرچییان دەوت، شیم دەکردەوە.. ئەو گەلحۆیە هیچ نازانێت.. کێ دەڵێت ناشیزانێت.. بەخۆڕایی نییە ئەم ماوەیە ئەوەندە بیر دەکاتەوە.. بیرکردنەوەی ژوورە چۆڵەکان ترسناکە و من لە هەموو شتێ زیاتر

لێی دەترسم.. من لەوە دەترسم بەدرووستی بیرنەکاتەوە.. دەترسم هەموو خەتاکە بخاتە ئەستۆی من.. دەترسم وابزانێت منم هۆی ئەو هەموو نەهامەتییەی ئەم ماڵە.. من لە دایکیم جیا کردەوە و لە سۆز و خۆشەویستییم بێ بەش کرد.. من دەبێت وریا بم، نەوەکا بەهەڵە لێم تێبگات.. دەبێت لەمەودوا ئاگاداری هەموو هەڵسوکەوتێکی بم.. نەوەکا لەناکاو دەستم لێ بوەشێنێت.. شەوان بیرم نەچێت دەرگای ئەم ژووره داخەم.. وا چاکە قوفڵێکی گەورەشی بۆ بکڕم.. ئاگام لە نان و چێشتم بێت، ژەهرم بۆ تێنەکات.. لەمەودوا ئاویش هەر لە بەلووعە دەخۆمەوە.. ئەمەش خەمێکی تر.. ترسێکی تر.. ئەوەی حیسابم بۆ نەکردبوو و بەهەندم هەڵنەگرتبوو ئەو فیرنەگولەیە بوو.. ئەوا ئەویشم لێ بوو بە شت.. بوو بە مەتەڵێکی تر و چووە پاڵ ئەوانی تر.. بەخۆڕایی نییە ئەو هەموو وێنە ترسناکەی هەڵواسیوە.. ئەو خەنجەر و شمشێر و تفەنگە بۆ جوانی بەم دیوارانەوە هەڵنەواسراون.. هاکە زانیت دەستی خۆی وەشاند.. کوره حەددی چییە زەفەرم پێ دەبات.. بیستویەک ساڵ لەو گەورەترم .. ڕێک دوو بەقەدەر ئەو دەزانم.. دوو ئەوەندەی ئەو دنیام دیوە.. چەکی هەیە، منیش چەک پەیدا دەکەم.. لە بەیانییەوە ئەم ژووره پڕ دەکەم لە چەک.. لە خەنجەرێکەوە بیگره تا نازانم چی و چی.... ئەوە چییە ئەو فشە فشە..؟! بزانە چۆن خۆم لەسەر ئەو برایەم کردووە بە پاڵەوان.. بەشکو ئەو هیچ مەبەستێکی نەبێت.. هەر خۆی حەز لە چەک و تەقەمەنی بکات..!! من نابێت هەر لە خۆمەوە ئەو بکەم بە دوژمنی خۆم و وابزانم خۆی بۆ کوشتنم مەڵاس داوە.. ئەوەندە هەیە دەبێت وریای خۆم بم.. هەرکاتێ زانیم مەبەستی کوشتنمی هەیە، ئەوسا من دەستپێشکەریی خۆم بکەم.. خۆ بەسەرێکیش خێرا لەناوی بەرم چاکترە، بۆ ئەوەی چاوم بەرپێی خۆم ببینێت.. دەتۆ سەیرکە ئەو پیاوانە وا بەئارەزووی خۆیان لەناو ئەو چیمەنەدا دەسووڕێنەوە، من وا مێشکم بەو فیرنەگولەیەوە خەریکە، نەوەکا لە دواوە زەفەرم پێ بەرێت.. من شەڕی چەند لا بکەم..؟! هی ناو ماڵم، یان هی دەرەوە..؟! لەناو ماڵیش هی دایکم، یان هی برام..؟! با شتەکە بەئەقڵ بکەم.. با هەر ڕەمەکییانە بڕیارێ نەدەم و دوایی پەشیمان ببمەوە.. من نابێت ئەوەم بیر بچێت، کە برامە..

براشم نەبێت، خۆ کوڕی «حەمە عەلی»یە.. ڕاستە من تا ئێستاش لە «حەمە عەلی» نەگەیشتووم، بەڵام خۆ نکووڵی لەوە ناکرێت، کە گۆرانیبێژێکی بەتوانا بوو.. دەنگخۆشێکی کەموێنە بوو.. نازانم جارێکیان لە کوێ بوو وتم: بۆئەوەی بەچاکی و بەشێنەیی بیربکەمەوە، دەبێت خۆم هێور و ئارامکەمەوە.. ئێستا زۆر زۆر بەشێنەیی و بەهێوری بیر لە کوشتنی دەکەمەوە.. هەر ئەو ڕێگایەشم بەدەستەوەیە، بەتایبەتی، کە دەبینم ئەو پیاوانە نیازی ڕۆیشتنیان نییە.. با لەم پرسیارەوە دەست پێ بکەین: ئایا من بمێنم باشترە، یان ئەو..؟! چەندوچوونی ناوێت من.. جــا بۆ ئەوەی زوڵمی لێ نەکــەم، دەبێت ڕوونیکەمــەوە.. زۆر ئاســوودەم، کــەوا لەم ڕۆژە ڕەش و تەنگانەیەش ویژدان و ئەقــڵم بەئاگــان و ســەریان لێ نەشــێــواوە.. بزانە من هەر بەوەندە وازناهێنم، کــە وەڵامی پرسیارەکەم دایەوە و وتم: من بمێنم چاکترە.. ئەگەرچی تەواویش لە ڕاستی و درووستی وەڵامەکەم دڵنیام.. ئێستا با پرسیاری ئەوە بکەین: بۆچی من بمێنم چاکترە..؟! لەپێش هەموو شتێکەوە من کوڕی گەورەی ئەم ماڵەم.. هەموو سامانەکە لە باوکی منەوە بەجێماوە.. هەموو کەسێ دەزانێت «حەمە عەلی» کە هاتە ئەم ماڵە عانەیەکی نەبوو.. عانەشی هەبوایە، گیرفانی نەبوو تێی بکات.. داخەکەم من کاتی ئەوەم نییە ئەم شتانەی بۆ بسەلمێنم، چونکە ماوەیەکی زۆری دەوێت.. دایکیشــم کــارێکی وایکردووە هیچ بەڵگەیەکم بەدەســتــەوە نەبێت.. بەهەرحاڵ من ئەمانە هەمووی دەخەمە ئەولاوە.. دێم بەڵگەیەکی وای بۆ دەهێنمــەوە، هەر خــۆی داوای مــردن بکات.. وەکــو چۆن «حــەزرەتی ئیسماعیل» سەری بۆ «حەزرەتی ئیبراهیم» خستە بەر چەقۆ.. ئەویش ئاوا بەبێ مشتومڕ، سەریم بۆ دانێت تا چەقۆی پیادابهێنم.. نابێت بیریش لەوە بکاتەوە، لە لایەن خوای گەورەوە بەرانی قەڵەوی بۆ بێت و لەجیاتی ئەو سەری ببڕم.. نا.. نا.. با چاوەڕێی شتی وا نەکات، چونکە ئێمە تازە پیس بووین.. کوڕی دایکێکی پیس و گڵاوین.. هەموو گیانمان گومانە.. ناخمان لە پرسیاری بێمانا سیخناخە.. دەبێت ئازایانە و بەبێ ترس بۆم پاڵکەوێت، تا سەری لە جەستەی جیا دەکەمەوە.. من ئەوەشم لە بەر چاوە، کە دوای مردنی قێز لە تەرمەکەی دەکەمەوە و ماوەیەک لەناو جێدا دەکەوم، بەڵام باشترە لەوەی بمرم

و شیرازەی ئەمماڵە بەجارێ تێکبچێت.. با زۆر بۆ کەم نەڵێین و بیسەلمێنین، کە من بمێنم باشترە.. من لەو بەئاگاترم و زیاتر ئاگام لە ڕووداوەکانە.. هەتا بوونی ئەو، ڕاستە بوونێکی پڕ لە گومانە و تەمومژاوییە، بەڵام هیچ نەبێت من لەو زیاتری لێ دەزانم.. یاخود دەتوانم بڵێم بۆ من زۆر ئاسانترە لە نهێنیی شتەکان بگەم.. من ماوەیەکی زۆرە پێیانەوە خەریکم، بەڵام ئەم هەمووی چەند ڕۆژێکە.. لەوەتەی تەختی نووستنەکەیان لە تەختی نووستنەکەی دایکم جیا کردۆتەوە و هێناویانە بۆ ئەم ژوورە.. لەوەتەی ئەو چوار پیاوە هاتوون.. ئەم بۆچی حەوت ساڵ پێش ئەمڕۆ بیر خۆی ناخاتەوە، کاتێ لەگەڵیان دانیشتبوو ماسیی دەخوارد..؟! خۆ ناشتوانێت نکوڵی لێ بکات، چونکە بەڵگەم بەدەستەوەیە.. بەڵگەی زۆر زیندووش.. بەڵگەم ئەوەیە پەرداخەکەی لە دەست کەوتەخوارەوە و لە سەر کاشییەکانی ژێر مێزەکەدا شکا و بوو بە هەزاران پارچەی بچووک بچووک.. ئێستاش وا لە بەر چاومە چۆن هەردوو دەست و دەمی تێ نابوو.. تەنانەت ئەوەشم لە بیرە کە دایکم بردیە بەر دەستشۆری قەد دیوارەکە و دەست و دەمی بە سابوون شت.. یەک دوو جاریش لە لووتیەوە نزیکی کردنەوە و بۆنیکردن.. ئینجا پێی وت:

ــ ماسیخواردنیش لێزانینی دەوێت.. دەبێت وا بیخۆیت، چەندیش دەستت چەور بکات، هەرکە ئاوێکت پیادا کرد پاکبێتەوە و بۆنەکەشی نەمێنێت.

کاتێ ئەو ئاوا خۆی مرکرد لەو ماسیە بۆگەنە و قێزی لەو چوار پیاوە پیس نەکردەوە، من ئەو کاتە قێزم دەکردەوە و ڕۆحم دەرچوو.. ئەگەر بیەوێت بەوە چاوبەستم بکات، گوایە ئەو کاتە منداڵ بوو، ئەقڵی بەم شتانەدا نەدەشکا، ئەوا دیسان خەیاڵی خاوە، چونکە قێزکردنەوە هیچ پەیوەندییەکی بە ئیدراکەوە نییە.. من لەوەتەی چاوم کردۆتەوە قێز لە شت دەکەمەوە.. من لەوسای ئەو منداڵتربووم، کە قێزم لە پیت و وشەکان دەکردەوە.. دە ساڵ بووم، کە قێزم لە «تابان» کردەوە.. لێرەدا ئەگەر هەندێ هەڵچوون بە قسەکانمەوە دیارە، ئەوە هی سرووشتی باسەکەیە.. ئاخر ئێمە لەسەر مەسەلەیەکی زۆر گەورە و ترسناک.. لە سەر مەسەلەیەکی چارەنووسسازی قسە دەکەین.. وەکو ئەوە وایە دوو پاڵەوان بین و هەر یەکەی شمشێرێکمان بەدەستەوە گرتبێت و

پەلاماری یەکتری پێ بدەین.. من ئەوا جارێکی تر خۆم هێوردەکەمەوە و دیسان ئەوە دەخەمەوە بەر چاوم، کە برامە، بەچاوپۆشین لەو هەموو گومانەی هەمە لەسەری.. ئێستا دێم لایەکی تری مەسەلەکە باس دەکەم.. تا پێشم بکرێت بەویژدانەوە ڕوونی دەکەمەوە.. مەبەستم شیکردنەوەی ڕاو بۆچوونەکانی ئەوە لەسەر مەسەلەی مانەوە.. ئەگەرچی باوەڕم وایە تەواو قەناعەتی بەو بەڵگانەی من هێنابێت، بەڵام با بڵێین نەیهێناوە و ئەویش لە من زیاتر خۆی بەهەقی مانەوە دەزانێت.. دوورنییە ئەم لەبەرئەوە وابزانێت هەقی ئەوە بمێنێتەوە و من بمرم، چونکە من ئیتر پیربووم و تاقەتم چووە، بەڵام ئەو گەنجە و ماوەی تەمەنی لە هی من درێژترە.. من وەکو چۆن هەق بەو دەدەم ئازادانە بیری وا بکاتەوە، ئاواش هەق بەخۆم دەدەم و ئەویش دەبێت بمداتێ، تا بۆی ڕوونکەمەوە، کە بەهەڵەدا چووە.. بۆچی..؟! لەبەر دوو هۆ.. یەکەم: من تاقەتم نەچووە.. بەڵگەشم ئەوەیە تاکو ئێستاش لەو چاکتر بیردەکەمەوە و چاکتر ئاگاداری دەوروپشتی خۆمم.. دووەم: من پیر نەبووم و پیریش نابم.. من پێشتریش وتوومە، کە ڕەنگ و جۆری پێستم بەشێوەیەکە هەرگیز پیریی پێوە دیار نادات.. ڕاستە ئەویش لە من دەچێت، بەڵام کێ دەڵێت وەکو من دەردەچێت..؟! ئەگەر ئەم لەبەر ئەوەش خۆی بەشایانی مانەوە دەزانێت، گوایە شەڕانییە و کتێبی زەردهەڵگەڕاو و تۆزلێنیشتووی لە ژوورەکەی داناوە و وێنەی نازانم کێ و کێ و چەک و تەقەمەنی بە دیوارەکانەوە هەڵواسیوە، ئەوا با بیر لەوە هەر نەکاتەوە، چونکە گرنگ نییە تۆ شەربکەیت، گرنگ ئەوەیە چۆن و لەگەڵ کێیدا بکەیت.. ئاخر ئەم تا ئێستاش نازانێت کێ دوژمنیەتی.. ئەوەتا لەجیاتی سەیری ناو چیمەنەکە بکات و بزانێت ئەو چوار پیاوە چی دەکەن و نیازی چییان هەیە، جارێ مۆڕە لە من دەکات.. بەڕاست منیش لەبەر ئەو پشقلە ئاگام لێیان برا.. ئەوەتا وا هاتوونەتە هەیوانەکە و لەوێ وەستاون.. ئیتر نارۆن.. من بەڕاستی دەترسم شەو لە ماڵێکدابم، ئەوانەی لێبێت.. باشە ئەوە دایکم لە کوێیە..؟! تۆ بڵێیت خەریکی ڕێکخستنی ژووری نووستنەکە بێت..؟!

* * * *

من تا ئاوا ڕاڕابم ناگەم بەهیچ.. هەر ئەوا سەراسیمە و ئەبڵەق لە چوار دەوروپشتم ڕادەمێنم و هیچیشم دەسگیر نابێت.. هەر دەبێت ڕووداو لە دوای ڕووداو ببژێرم و بڵێم: ئای ئەوە بۆچی وابوو..؟! ئەی بۆ وانەبوو..؟! ئەی دوای ئەوە چییتریش دەبێت..؟! ئەوەش هەمووی خەتای ئەو کتێبانەیە، کە لە منداڵیی و سەردەمی هەرزەکارییدا دەمخوێندنەوە.. ڕاستە ئێستا ناوی هیچ نووسەرێکم بیرنەماوە.. تاقە شیعرێکم لەو هەموو شیعرە لە یادنەماوە، کە لەبەرمکردبوون، بەڵام تا ئێستاش لەژێرەوە ئەوان هەڵمدەسووڕێنن.. ئەوان فێری ڕاڕایی و دڵەڕاوکێیان کردم.. وایان لێ کردم ئەوەندە لە شت بکۆڵمەوە.. باشە من پێنج ساڵ لەمەوبەر بەبەڵگەوە نەمسەلماند، کە هەقی سەربڕینی ئەو هەتیوەی بەرامبەرمم هەیە..؟! ئەی چی وای لێ کردم پەشیمان ببمەوە..؟! تۆ بزانە چەند بەگەمژەیی دایکمی کوشت.. کوشتی و ڕەنجی ئەو هەموو ساڵەی منی بەفیڕۆ دا.. ئەو وەکو من نەبوو ئۆقرە بگرێت و بەحەزەوە لە نهێنییەکان بکۆڵێتەوە.. هەر خێرا پەنای بۆ کوشتن برد.. کوشتی و خۆی خزاندە کونجی ژوورەکەیەوە.. ئەوە حەفتەیەکە لەوێیە و هەر سەرێکیش لە دەرەوە ناکێشێت.. باشە ئەوە برسیی نییە..؟! تینووی نییە..؟! بێزار نەبووە..؟! دووریش نییە نیازی لەوە پیستریشی هەبێت.. ئیتر من دەبێت زیاتر ئاگام لێ بێت، چونکە گومانی تیا نەما پیاوکوژە.. با بۆم بوەستێت چۆن هەر ئێستا بە لەقە ئەم دەرگایەی دەشکێنم و لە چاوترووکانێکدا بەسەر دنیاوەی ناهێڵم.. ئەم بەم کارەی کردی ترسی منی لە مردن شکاند.. بە دەستی خۆی گۆڕهەڵکەنی خۆی خولقاند.. من کە تا ئێستا لەوە دەترسام خەڵک بکوژم، نەوەکا قێز لە تەرمەکەی بکەمەوە، ئەوا ئەم ترسەشم نەما.. من ئەمڕۆ هەستم کرد چاکبوومەتەوە و ئیتر قێز لە مردوو ناکەمەوە.. زۆر سەیر بوو خۆ لەسەر تەرمەکەی وەستام و دەستم لە قژ و ناوچەوانیشی دا.. دەستەکانیم گرت و ئاوا پەنجەکانیم لە یەکتر جیا دەکردەوە.. بەبێ ئەوەی قێزیشی لێ بکەمەوە.. دواییش هەر لە پەنجەرەکەی ژووری میوانەوە سەیری ناو حەوشەکەم کرد، کە هەر چواریان هەڵیانگرت و بردیانە دەرەوە.. باشە بردیان بۆ کوێ..؟! بردیان

بۆ لای «حەمە عەلی»..؟! دەبووایە من بەشوێنیاندا بچم، بۆئەوەی بزانم لە کوێی دەینێژن.. ئەوەی بەرامبەرم سەری لێ شێواندم، ئەگینا دەچووم.. بۆچییش بچوومایە..؟! تازە مرد و بەکەڵکی چی ماوە.. من ئیتر دەبێت ئاگام لە خۆم بێت، لەناکاو لەو ژوورەی بەرامبەرمەوە پەلامار نەدرێم.. ئیتر هەر خۆم و خۆی لە ماڵدا ماوین.. بەڕاست ئیتر ئەو چوار پیاوە نایەنەوە..؟! ئەوە پێنج ساڵە لێرە دەژین و لەگەڵ ئەم ماڵە ڕاهاتوون.. تۆ بڵێیت ئاوا بەئاسانی وازی لێ بهێنن..؟! تۆ بڵێیت ئەگەر بزانن بکوژەکەی وا لەم ژوورەی بەرامبەرمە، هەقی لێ نەکەنەوە..؟! جا بۆ نایزانن..؟! خۆ ئەوان دەمێک بوو هەستیان پێی کردبوو.. دەیانزانی ئەو پیاوکوژە، بەچاوێکی تر سەیریان دەکرد.. چاوێ کە جیا بوو لەوەی سەیری منیان پێ دەکرد.. زیاتر لە من حیسابیان بۆ دەکرد.. کەچی هیچیشیان پێ نەدەوت.. جا ئەوان کوا قسەیان دەکرد..؟! لەگەڵ دایکیشمیان نەدەکرد.. ئەو پێنج ساڵە لەم ماڵە بوون بەیەکەوە نانیان دەخوارد.. لە یەک ژوور دەنووستن، کەچی جاریێ گوێم لە دەنگیان نەبوو.. من پێویست ناکات ئیتر خۆم بەم پرسیار و بەو پرسیار خەریککەم.. تەواو هەموو شتێ کۆتایی پێ هات.. ئەو فیرنەگولەیە هەمووی لەبار یەکتر برد.. فیرنەگولەی چی..؟! ئێستا وا ئەوەندەی منی لێ هاتووە.. درێژی و کێشمان ئەوەندەی یەکە.. ڕەنگوڕوومان وەکو یەکە.. ئەگەرچی بیستویەک ساڵ لەو گەورەترم، کەچی وا هەستدەکەم دووانەین.. ژوورەکەشمان ئەوەندەی یەکە.. بەڵام ئێستا وای لێ دەکەم هیچی لە من نەچێت.. کارێکی پێ دەکەم سیماو ڕووخساری تەواو بگۆڕێت.. من دەبووایە زووتر دەستی خۆم بوەشاندایە.. دەمتوانی بە دوو مست و پێلەقەیەک لەناوی بەرم، کەچی نەفام بووم و وام نەکرد.. هەڵەی خۆم بوو.. کێ دەڵێت ئێستا پێی دەوێرم..؟! من بەدەستی ڕووت.. ئەو خاوەنی چەک و تەقەمەنی.. من نەشارەزا لە شەڕ.. ئەو شارەزا و لێهاتوو.. هەر ئێستا نا ساتێکی تر دەرگا دەکاتەوەوە و تەختی ناوچەوانم دەکات بە نیشانە.. وەی..؟! چی بکەم و بۆ کوێ بچم..؟! ئەوا دڵم کەوتە خورپە.. ئەوا چاوم کەوتە ڕەشکەوپێشکە.. ئێستا دەرگاکەیم لێ بووە بە دەشتێکی کاکی بەکاکی.. وشکوبرینگ.. چۆڵوهۆڵ.. هەرچەند نیگام دوورو

نزیک ڕەوانە دەکەم، شتێ نابینم.. ئەوا چەند تارماییەکم لێ دەرکەوت.. کێن ئەوانە..؟! تۆ بڵێیت شوان نەبن..؟! یان کچە لادێیی نەبن بۆ دارکۆکردنەوە هاتبن..؟! ئاخ..!! بۆ کەسێ نییە، دەستی لەرزۆکم بگرێت و لەم دەشتە چۆڵوهۆڵەم دوورخاتەوە.. من کوڕەشارستانم لە دەشتی چۆڵ دەترسم.. لە وەڕینی سەگ و لە لوورەی گورگ زەندەقم دەچێت.. فریامکەون تا گورگ نەیانخواردووم.. تا کەمتیار و ورچ ورگیان هەڵنەدڕیوم.. ئەوا تارماییەکان تا دێت نزیک دەکەونەوە.. تا دێت چاکتر دەردەکەون.. ئێستا دەتوانم بیانبژێرم یەک.. دوو.. سێ.. چوار.. چوارن، بەڵام چوار چیین..؟! چوار ئاژەڵی دڕندەن، یان چوار مرۆڤی کێوین..؟! ئای..!! خۆ ئەوە خۆیانن.. ئەوانن.. ئا.. ئا.. خۆیانن.. چوا پیاوەکەن.. چوار تفەنگیان پێیە.. هەر دەمزانی وازناهێنن.. بەڵام خۆ من نەمکوشتووە، براکەم بوو.. ئەو کوشتی.. ئای لەمنی بێکەس و داماو.. من بە دەستی ڕووت، ئەوان بە تفەنگ.. لە دەشتێکی ئاوا تەخت و ڕێکیشدا.. ئەوە بۆ بەردێ نییە، خۆمی لە پەنا حەشار دەم..؟! ئەوە بۆ قەدی درەختێ نییە، پشتی پێ بدەم..؟! بۆ شتێ نییە بیکەم بە قەڵغان..؟! هاوار دەکەم و دەنگم دەرناچێت.. ڕادەکەم و قاچم هێزی تیانییە.. دەکەوم بەناچاری هەڵدەستمەوە.. هەر گوللەیە و تیژ تیژ بە پەنا گوێچکەمدا تێدەپەڕێت.. نازانم چەندیان بەر گیانم کەوتوون.. چەندیان سەرگۆی دڵیان سمیوم.. هەرئەوەندە زانیتان کەوتم و نەمتوانی هەستمەوە.. هاکە زانیتان کەوتم و گەیشتنە سەر سەرم.. هەناسەم تەنگبووە و سەرم گێژ دەخوات....

* * * *

ئەوە چۆن گەیشتوومەتە ناو شار..؟! ئەو هەموو گوللەیەم بەرکەوتووە، چۆن نەمردووم..؟! بۆ کەسێ نییە زامەکانم تیمار کات..؟! بۆ کەسێ نییە چۆڕێ ئاوم بەدەمەوە بکات..؟! بەلامدا دەڕۆن و سەیرم ناکەن.. سەرنجیان دەدەم و نایانناسم.. کوا هاوڕێکانم..؟! کوا کوڕانی گەڕەکم..؟! ئەوە بۆ کەسێ ناناسم..!! ئەوە ئەم شارە چۆن ئاوا لە شەو و ڕۆژێکدا گۆڕا..!! ئەم بازاڕە

چی بەسەرهاتووە..!! هەمووی هەر گۆزەیە.. هەمووی هەر بووە بەگۆزەفرۆش.. نانەواخانە، دووکانی سەوزە، هی ماسی، هی جلوبەرگ، هەر هەمووی بووە بە گۆزە.. عەرەبانەکانی بازاڕی «شێخەللا» لەجیاتی هەموو شتێ گۆزەیان بە سەرەوەیە.. تێکڕا هاواردەکەن: «گۆزە.. گۆزە.. گۆزە.. گۆزە».. من تینوومە ئاوم دەوێت.. «گۆزە.. گۆزە.. گۆزە».. دایکم کوژراوە.. برام کوژراوە.. لە ماڵ دەرکراوم، فریامکەون.. «گۆزە.. گۆزە.. گۆزە».. من «هیڤان»ی گۆرانیبێژم، وەرن گوێم لێ بگرن.. «گۆزە.. گۆزە.. گۆزە»... کوا قوتابخانەکان..؟! کوا دواناوەندیی «ڕزگاری» و «کوردستان»..؟! دەچم چۆڕێ ئاو لە بەلووعەکانیان دەخۆمەوە.. «گۆزە.. گۆزە.. گۆزە».. نەخۆشخانەکانم پیشاندەن، تا بچم داوای کەمێ دەرمان بکەم.. «گۆزە.. گۆزە.. گۆزە».. گازینۆی «مەچکۆ» و «دڵزار» بۆ نەماون..؟! «گۆزە.. گۆزە.. گۆزە».. کوا منارەی چۆڵی..؟! ئەوە هەڵتانوەشاندەوە و کردتان بە گۆزە..؟! «گۆزە.. گۆزە.. گۆزە».. قەلا ئەوەندەی گردۆڵکەیەکی لێ ماوەتەوە.. هێشتا وازی لێ ناهێنن و لە چوارلاوە خەریکن دەیکەن بە گۆزە.. «گۆزە.. گۆزە.. گۆزە».. نە لادێتان هەیە و نە کانی، نە ڕووبار و نە جۆگە، پێم ناڵێن چی لە گۆزە دەکەن..؟! «گۆزە.. گۆزە.. گۆزە».. هەمان بوو نەمان بوو شارێ، ئەویش لە سەر پشتی «ئەسپیدیلۆن» دامەزرابوو.. «ئەسپیدیلۆن» خۆی جووڵاند و ورد و درشتی نقووم کرد.. ئێوەی گۆزەفرۆش مانەوە.. «گۆزە.. گۆزە.. گۆزە».. لە تینوا خنکام، چۆڕێ ئاوم بدەنێ.. «گۆزە.. گۆزە.. گۆزە».. مردن و ئابڕووچوونە بۆ ئێوە من لە شاری گۆزەدا لە تینوا بخنکێم.. «گۆزە.. گۆزە.. گۆزە»..

ــ گۆزە.. گۆزە.. گۆزە.

ــ گۆزە.. گۆزە.. گۆزە.

ــ گۆزە.. گۆزە.. گۆزە.

ئەرێ ئەوە من لە کوێم..؟! ئەو هەموو منداڵە چیین سەیرم دەکەن و پێدەکەنن..؟! پێدەکەنن و سەریان دەلەقێننەوە.. سەریان دەلەقێننەوە و تێکڕا دەڵێن:

ــ گۆزە.. گۆزە.. گۆزە.

گەورەو بچووک سەیری من دەکەن و پێدەکەنن.. خۆ من هەر بیرم نەمابوو لەناو کەشتییم.. ئەوە خۆ ئەو تفەنگە دارەشم هەروا بەدەستەوەیە، کە بۆ «ئاگرین»ی «تابان»ی پوورزامم کڕیوە.. ئەوەتا دایکیشم وا لە جامی پەنجەرەکەوە سەیری ناو ئاوەکە دەکات.. هەر دەڵێی لە «ئەسپیدیلۆن» دەڕوانێت.. نازانم بۆ لە ڕۆژان گەنجتر و جوانتر دێتە بەر چاوم.. هی ئەو خەیاڵە چڕ و درێژخایەنەیە، یان ئەم جلانەی زۆر لێ هاتووە..؟! ئەگەرچی دەبێت خێرا دەم و قورگی وشکهەڵاتووم تەڕکەمەوە و هەندێ ئاوی سارد بە دەموچاومدا بپرژێنم، بەڵام حەز دەکەم جارێ بچم کەمێ گاڵتەی لەگەڵدا بکەم.. دەشزانم خۆی حەز دەکات:

ـ ئەمڕۆ زۆر جوان بوویت.. دەڵێیت چی مێردێکت بۆ بدۆزمەوە..؟!

ـ دەستت بە قسە قۆڕەکانت کردەوە..؟! ئەوە ئەو هەموو کاتە بیرت لەوە دەکردەوە..؟! لە منیش وایە بیر لە شیعر دەکەیتەوە..!!

ـ ئێستا وتت چی شوو دەکەیت، یان نا..؟!

ـ بەڵام بە مەرجێ کوڕێکی قۆز بێت.

ـ حەمە عەلی قۆز نییە..؟!

ـ حەمە عەلی کێ..؟!

ـ حەمە عەلی شاسواری.. شاعیرێکی بەتوانا و ناسراو.. کوڕێکی ڕێکوپێک.

ـ کەست نەدۆزیەوە حەمە عەلی چڵکن نەبێت..!! چۆنت بیرکەوتەوە..؟! جا خۆ دەبێت هەموو ڕۆژێ شەڕمان بێت.

دایکم پێدەکەنێت و منیش هێشتا خەیاڵ بەرینەداوم.. منداڵە دانیمارکییش هەروا گۆزە گۆزەیانە، بەبێ ئەوەی بشزانن «گۆزە» چییە.

بەهاری ١٩٩٦/ دانیمارک

---

(١) ناوی چەند پشیلەیەکن، کە «ئیلیۆت» لەو شاکارەیدا باسیان دەکات.. ناوەکان ڕەهەندێکی موزیکییان هەیە.

(٢) ئاماژەیە بە ڕۆژی ناشتنی تەرمی فەیلەسووفی گەورەی چینیکی «یان

باتۆشکا»، کـه له ١٣ی مـارتی ١٩٧٧دا مـردووه. وەکو «یان فـادیسـلاس»ی شـاعیـر و قـوتابیی «باتۆشکا» باسی دەکات ئەو ڕۆژه لەسـەرتاسـەری ولاَت گـوڵفـرۆشتن قـەدەغـەکـراوه و پۆلیس به مـاتـۆڕەکـانیـان ڕژاونەته سـەر ئەو گۆڕستانه و کۆپتەرەکانیش له ئاسمان کردوویانه به ڤرەڤرِ بۆئەوەی دەنگی ئەو قەشەیه نەبیسترێت، که نوێژی لەسەر دەکات و دووعای بۆ دەخوێنێت..

(٣) ناوی یەکێ له پاڵەوانه سەرەکییەکانی ڕۆمانی «کاتژمێر بیستوپێنج»ی «کۆنیستانتان جۆرجیۆ»یە.

(٤) ناوی پاڵەوانێکی ڕۆمانی «مەسیح سەرلەنوێ له خاچدەدرێتەوه»ی «کازانتزاکی»یە. چەند بڵێیت دەوڵەمەند و پیسکەیە. ژنەکەی پێی پەتییە، چونکه دڵی نایەت جووتێ نەعلی بۆ بکڕێت.. تاقەکچەکەشی دەمرێت، چونکه نایبات بۆ لای دکتۆر.

# پێڵاوی چەرخەدار

پێشکەشە بە هێلا ڤیەن و ئانا کییستینای هاوڕێم

زۆر لێیان پاڕامەوە و پێم وتن:

ــ بە قوربانتان بم.. بە قوربانی چاو و دڵتان بم منیش فێرکەن، ئاوا بەم پێڵاوانەوە بڕۆم.. بڕۆم و بە تیژی ئەم شەقام و ئەو شەقامیان پێ ببڕم.

هەر وەڵامیشیان نەدامەوە.. هەر سەیریشیان نەکردم.. کوڕ و کچ، گەورە و بچووک، سەرو جووت لەو پێڵاوانەیان لە پێ کردبوو، بەلامدا تیژ تیژ تێدەپەڕین، بەبێ ئەوەی گوێ لە هاوارم بگرن.. یاخود بێن ئەم دەست و ئەو دەستم بگرن و بەدوای خۆیاندا ڕامبکێشن.. خۆ هەر ئەوەندە ترسم بشکایە و ماوەیەک ئاوا بەپاڵپشتی ئەوان بڕۆیشتمایە، ئیتر قاچەکانم ڕادەهاتن و ڕێتمی خۆیان وەردەگرت.. من هەر ئەوەندەم لەوان دەویست، ئەوە بۆچی بەدەنگمەوە نەهاتن..؟! تازە بێن و نەیەن هەر وەکو یەک وایە.. ئیتر ئەگەر بشیانەوێت فێرمکەن، هەر فێرنابم.. ئاخر ئەوەندە لەسەر ئەم شەقامە لێژ و قیرتاوە کەوتووم، هەموو گیانم کوتراوە.. باوەڕناکەم ئیتر بتوانم هەستمە سەر پێ و بە پێی پەتییش هەنگاو بنێم، چجای بەم پێڵاوە قورسانەوە..!! وا هەست دەکەم لە ئەژنۆ بەرەو خوارەوەم پێوە نەماوە.. سەرم گێژ دەخوات و دڵم دەلەرزێت.. دەلەرزێت و نازانم بە خاوی، یان بەخێرایی لێدەدات..!!

وابزانم ئەوان بۆیە گوێشیان لێ نەدەگرتم، چونکە باوەڕیان نەدەکرد کچێکی گەورە و تەواوی وەکو من، بۆ فێربوونی پێڵاوی چەرخەدار ئاوا بگری و بکڕووزێتەوە.. بپاڕێتەوە و هاوار و ڕۆڕۆ بکات.. من خۆشم نازانم ئەوە چی بوو لەپڕ بەخەیاڵمدا هات..!! نازانم چ ئەقڵێکی کاڵ و هەرزەیە، جار جار بۆ ناو مۆخم دزە دەکات و هەڵمدەسووڕێنێت..!! دەمخاتە سەر کەڵکەڵەی کارێ، نە لەگەڵ تواناو، نە لەگەڵ تەمەنم یەکنەگرێتەوە.. ئێستا چەند دەکەم نازانم

چۆن و کەی و بۆچی ئەم بڕیارەم دا.. هەر کاتێکم زانی وا لە سەراوردی ئەم شەقامە هەورازە وەستاوم و جووتێ پێڵاوی چەرخەدارم لە پێ دایە.. هەردوو جەمسەری قەیتانی جووتەکەی خۆشمم لە یەکتر گرێداون و ملوانکەئاسا لە ملم کردوون.. هەر تاکە و بۆ سەر لایەکی مەمکم شۆڕبۆتەوە و شەکەت و ماندوو لە سەریان پاڵکەوتوون.. باشە من ئەوەندە کەوتم و هەستامەوە، چۆن لە ملم نەترازاون و نەکەوتوونەتە خوارەوە..؟! بشکەوتنایە، هەستم پێ نەدەکردن.. بەشێوەیەکی زۆر سەیریش دەکەوتم.. لەپێشدا کەمێ دەڕۆیشتم.. وا باشترە بڵێم بە حوکمی هەورازەکە بەرەو خوار دەبوومەوە.. ئینجا دەترسام و دەمزریکاند.. ئەنجام لەنگەری خۆمم لە دەست دەدا و بەبێ ویست لامدەدایە سەر خۆڵەکە.. لەوێ دەکەوتم.. هەندێ جاریش لەپڕ قاچەکانم لەباریەکتر دەچوون و لە سەر قیرەکە سەرەنگرێ دەبووم و بەرەو خوار تلدەبوومەوە...

من دەبووایە هەر لە چەند جاری یەکەم، کە زانییم بێ سوودە و فێرنابم، وازم بهێنایە.. دەبووایە گەڕانەوەم لەبەرچاو بگرتایە.. ئاخر ئێستا من بە دوو قاچی شکاو و بەم گیانی وا کوتراو و داهێزراو، چۆن بەسەر ئەم هەورازەدا هەڵبزنێم..؟! ئەوا شەویشم بەسەرداهات، ئیتر چاویشم نابینێت.. ئیتر ئەوانیش نایەن و بەلامدا تێناپەڕن.. ئەگەرچی ئەوان هەستیان بەبوونی من نەدەکرد، بەڵام من بەهی ئەوانم دەکرد و سەبووریيم پیایاندا دەهاتەوە.. ئەگەر پەناهەندەیەکی کەمپەکەی خۆشمانم لێ هەڵکەوێت، هەر باشە، بەڵام باوەڕناکەم کەسیان ڕێیان بەشوێنی ئاوا بکەوێت.. باوەڕناکەم لە من زیاتر کەسی تر ئاوا ئەقڵی خۆی لە دەست دابێت و بۆ فێربوونی پێڵاوی چەرخەدار خۆی ڕیسواکات.. ئیتر هیچ پێویست ناکات چاویشیان بۆ بگێڕم.. وا چاکە تا تەواو تاریکدانەهاتووە، مشووری خۆم بخۆم.. ئەگەر بە قنەخشکێش بێت، هەوڵی سەرکەوتن بدەم.. مەحاڵە بشتوانم ئەم هەموو ڕێگا سەختە بە خشکە خشک ببڕم.. ئیتر تەواو ئەمشەو لێرە ڕەقدەبمەوە.. ڕەقیش دەبمەوە بە دۆزەخ.. جا تووخوا من بەم ئەقڵە ساکارەوە بۆچی بژییم..؟! لەم چورتوومەش دەربازبم، دەیانی ترم تووشدێت.. تا خاوەنی ئەم ئەقڵە نابووتە بم، حاڵم لەمە چاکتر نابێت...

تۆ سەیری لەیەکچوون و دووبارەبوونەوەی شتەکان بکە.. من و «تریفە» ئەو جارە چەند بەو کاتژمێرەی قەد دیواری ماڵی «میدیا» پێکەنین، کە پیلەکەی کز بووبوو.. میلە باریک و بنێسەکە، هەرچەند تەکانی دەدا، سەر نەدەکەوت.. لە خواری خوارەوە، ڕێک لەسەر شەشەکە گیری خواردبوو.. «تریفە»، کە هەمیشە حەزی لە گاڵتە و پێکەنین بوو، چووختیانە پێی دەوتم:

ــ تۆ جوان لێی وردبەرەوە، بزانە لە چی دەچێت..!!

ــ سەربەگۆبەند، مانات لەمەشدا دۆزییەوە..؟!

«میدیا»، کە ئەوسا چای بۆ تێدەکردین وتی:

ــ ڕەزای بمرێت.. دە ڕۆژ نابێت پیلەکەیمان گۆڕیوە، ئەوا جارێکی تریش وەستایەوە.. لەبەر جوانییەکەی نەبوایە، دەمێک بوو بێستوون بە لەقە لەتوکوتی کردبوو.

من دوایی هەر لە خۆمە بەزەییم بەو میلە باریک و درێژەدا هاتەوە.. دوای ئەو هەمەوو پێکەنینە، خەریک بوو دەستکەم بە گریان.. من چ دڵێکی سەیرم هەیە، ئاخر تووخوا ئەوە ڕاستە بەزەییم بە پارچە میتاڵێکدا بێتەوە، کە کراوەتە میلی کاتژمێر..؟! سەیرە خۆ هەر بە «پەروین»ی باوەژنیشمم دەهاتە بەرچاو.. وەکـــو ئەو درێژ و باریک بوو.. ئەی بۆچی ئاوا بەزەییم پیـــادا هاتەوە..؟! دوای ئەوەش هەر بیرم لێی دەکردەوە.. هەر کاتژمێرێکم دەدی، ئەوم بیردەکەوتەوە.. هاوکات سیمای «پەروین»ی باوەژنم لە بەرچاومدا دەهات و دەچوو.. بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ کەی «بێستوون»ی مێردی «میدیا» لێی بێزار دەبێت و لە دیوارەکەی دەترازێنێت.. بە لەقە تێی دەکەوێت و وردوخاشی دەکات..؟! تۆ بڵێیت دوای ئەم چەند ساڵە هەر بەو دیوارەوە مابێت..؟! خۆزگە هەواڵێکیم دەزانی.. بۆچی من هەواڵی «میدیا» دەزانم، تا هی کاتژمێرەکەیان بزانم..؟! بێجگە لەوەش من ئێستا هەستێکی تری تەواو جیاوازم لە ئاست کاتژمێرەکاندا هەیە.. بەتایبەتی لە ئاست ئەو میلە باریک و بنێسەیان، کە لە باوەژنەکەم دەچێت.. هەرچی خراپەکاری هەیە لەژێر سەری ئەودایە.. یان چاکتر وایە بڵێین ئەو ئەرکە خراپ و بەدەی پێی سپێردراوە، گوێڕایەڵانە بەجێی دەهێنێت.. ئێوە سەیریکەن و جوان لێی وردبنەوە، بەڵام بەمەرجێ

چاوتان بەتەواوی بکەنەوە و بیخەنە سەری.. هەر ئەوەندەش بەس نییە، دەبێت هەمــوو شــتێ بیـر خــۆتان بەرنەوە.. وابزانـن ئێـســتـا لە دایک بوون و هـیچ ڕابردوویێکتان نییە.. هەر کاتێکتان زانیوە وا خولْقاون و بەرامبەر دەعبایەکی خڕی سەیر و سەمەرە، ئەبڵەق و سەراسیمە وەستاون.. وا چاکە من هەرچییم پێ وتن، ئێـوە بەبێ دوودڵی جـێـبـەجـێی بکەن.. وا نـەبێت لە مــەبەســتی من تێناگـەن.. دەی چاکە، با لـەو کاتەوە دەست پێکەین، کە میلەکە، وا چاکـترە بڵێم باوەڕنەکەم، لە سەر دوانزدەیە.. ئەو کاتژمێرەی ئێوە تێی ڕادەمێنن، من خۆم درووستم کردووە، لەجیاتی ژمارە هێمام بۆ داناوە.. لەجیاتی دوانزدە، وێنەی گۆڕستانێکم کێشاوە.. دەزانم ئێوە سەرەتا دەترسن.. زۆریش دەترسن، بەڵام کەمێکی تر ڕادێن.. ئەگەر ڕاشنەیەن دەستەڵات نییە.. تازە تووش بوون.. ئێستا ئێوە زیندەوەری ورد وردن و لەناولەپی باوەڕنەکەمدا متبوون.. بیر لە دەربازبوون مــەکــەنەوە، تازە مــەحــاڵە بتــوانن لەو جــامــە بچنە دەرەوە.. ئاسمانێکی بەرز و دوورەدەستە و ئێوەی خشۆکی بێباڵ و بێدەستەڵات، هەر دەبێت لە دوورەوە بۆی بڕوانن.. یانزدەکـەی تریش هەر یەکـەی هـێـمــایە بۆ شتێ، بەڵام من پێتان ناڵێم هێمان بۆچی.. دەبێت خۆتان بیزانن.. کاتێکیش دەیزانن، کە باوەڕنەکەی من ئەوەندە دەتانخولێنێتەوە، تا سەرتان گێژدەخوات و بەرچاوتان تاریکدادێت.. ئیتـر هەندێکتان زوو دەکـەونە خوارێ و گیـانتان دەردەچێت، هەندێکیــشــتــان خــۆتان لەنێــوان چرچی ناولەپی و کــەلێنی پەنجەکانیدا دەقرسێن و ناکەون.. ناکەون، بەڵام بۆ کوێ دەچن..؟! تازە لەناو ئەو کــاتژمــێــرە عــاسی بوون.. وا دەزانن تا کـــەی باوەڕنـەکـــەم ئاوا هەڵتاندەگرێت..؟! هاکە تاقەتی چوو.. هاکە ئەویش سەری سووڕا و لەسەر «دوانزدە»کـە دانیان.. دانیان و ئاشبەتاڵی پێکردن.. من دەزانم ئێستا ئێوە چەند ڕقـتـان لەو باوەڕنەمـە.. دەزانم چۆن ترسی مـردن دایگرتوون و هەمـوو گیانتان دەلەرزێت، بەڵام ئێستا ئاوێنـەیەک دەهێنم و لە بەرامبەر کاتژمێرەکەی دادەنێم، بزانن چۆن هـەستێکی تری تەواو جیاوازتان لە دڵدا دەخولْقێنم..... دەی ئیتـر ئێـوە لە ئاوێنەکـەوە سـەیری کـاتژمـێرەکـە بکەن.. دیوتانە مـیلە درێژەکـە، بڵێم باوەڕنـەکـەم چۆن بەپێچـەوانەوە دەخـولێتـەوە..؟! خۆ زانیـتان

خەتای ئەو داماوەی تیا نییە.. ئەوا ئێوەش ترسەکەتان ڕەوییەوە و لە مردن قورتارتان بوو.. ئەوا ئێوەشم فێر کرد لەمەودوا هەر لە ئاوێنەوە سەیری کاتژمێر بکەن.. من خۆشم ئەوەندە نییە ئەو فێڵەم دۆزیوەتەوە.. ئەو سەفەرەی پێشوو، کە لە «ئەلبۆرگ»ەوە دەچووم بۆ «کۆبنهاگن»، بەڕێککەوت لە جامی پەنجەرەی شەمەندەفەرەکەوە سەیری کاتژمێری یەکێ لە ستوونەکانی سەر شۆستەی ئەو وێستگەیەم کرد.. چ هەستێکی گەشبین بوو، ئاوا لەپڕ خزایە گیانمەوە و وای لێ کردم لە هەموو کاتێکی تر خۆم و ئەو شتانەی تایبەت بەخۆمن، خۆشم بوێن..!! شەمەندەفەرەکە ڕۆیشت و من هەر لە شوێنی خۆم وەستابووم.. یەکێکی تر و دووانی تر و نازانم چەندی تر هاتن و هەر نەڕۆیشتم.. باشە من بۆچی دەچووم بۆ «کۆبنهاگن»..؟! دەچووم بۆ لای کێ..؟! نازانم.. دوایی کاتێ سەیرم کرد، بلیتەکەشم بەدەستەوە نەمابوو.. کە گەڕامەوە ژوورەکەم، هەر خێرا شوێنی کاتژمێرەکەم گوێزایەوە و هێنامە بەرامبەر ئاوێنەکەوە.. کارێکی چاکم کرد، بەتەواوی لە خەڵک دابڕام.. من تاکە شتم کە لە هی ئەو خەڵکە دەچوو، کات بوو، ئەوا ئەویشم گۆڕی.. بەوە باشە کاتژمێرەکەم لەجیاتی ژمارە، بەکورتەهێڵ هێماکراوە و بۆ مەبەستەکەی من تەواو گونجاو و لەبارە.. کاتی نانخواردن.. هی چوونەدەرەوە و بازاڕ.. هی نووستن.. هەر هەموویم لە هی ئەوان جیاکردەوە.. کاتژمێر هەشت بەکاتی بەرئاوێنە دەچووم بۆ نانی بەیانی.. قاپ و چەقۆ و چەتاڵەکەمم دەبرد، تا بچم خێرا لە بەردەمی چێشتخانەکە بۆ پاکەتێ کەرە و سەرەکەوچکێ مرەبا سەرە بگرم.. کاتێ سەیرم دەکرد، دنیا شەوە و کەس بەدەرەوەنییە.. دەرگای چێشتخانە داخراوە.. ژەمەکانم تەواو گۆڕان.. بینینی دکتۆر و هی پارێزەر و هی ئەو ژن و پیاوانەی فایلەکەمیان لە بەردەست بوو، هەر هەموویم گۆڕی.. پەردەیەکی ئێجگار ڕەشی زۆر ئەستوورم کڕی و هەر کاتێ بەپێی کاتژمێری بەرامبەر ئاوێنە دەبوو بە شەو، دامدەدایەوە و شەوی ڕاستەقینەم بۆ ژوورەکەم دەهێنا.. جارێکیان لەگەڵ دەنگی لێدانی دەرگا بەئاگا هاتم.. کاتێ چووم و بەچاوی خەواڵووەوە کردمەوە، سەیرم کرد «ڤیبیکا» بوو.. پرسی:

ــ ئەرێ ئەوە تۆ لە کوێیت..؟! خۆ کەس ناتبینێت..!!

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو، پیایدا هەڵشاخام:

ـ تۆ شەرم ناکەیت بەم یەکی شەوە دەرگات لێ گرتووم..؟!

کەچی ئەم زۆر بەهێمنی دەستی لە ملم کرد و پێی وتم:

ـ ببوورە کوێستان.. وا دیارە تۆ نەخۆشیت، بۆیە یانزدەی پێش نیوەڕۆت لێ بووە بە یەکی شەو.

ـ نەخێر، لە تۆ ساغترم.. دە سەیری کاتژمێرکە بزانە کاممان لێمان تێکچووە..؟!

ئەم سەیرێکی کاتژمێرەکەی مەچەکی خۆی کرد و دوایش لە چاوی منی نزیککردەوە:

ـ سەیریکە یانزدەی ڕێکە.

بە تووڕەیی پاڵێکم بە دەستیەوە نا و پێیم وت:

ـ من باوەڕم بە کاتژمێری تۆ نییە.

سەیرێکی کاتژمێری قەد دیوارەکەی کرد و بەڕوویێکی خۆشەوە وتی:

ـ ئەوەتا ئەوەی تۆش هەر یانزدەیە.

ـ نەخێر، دووە و دووی شەویشە.. دە تۆ وەرە لەم ئاوێنەیەوە سەیریکە، بزانە وایە یان نا..؟!

لەوە دەچوو تەواو باوەڕی بە تێکچوونم هێنابێت، بۆیە وتی:

ـ تۆ چۆنت پێ خۆشە، با ئاوابێت، بەڵام من بۆ ئەوە هاتووم پێت ڕابگەیەنم، ئەگەر کار ئاوا بڕوات، فایلەکەت دادەخرێت.. تۆ ئەوە چەند چاوپێکەوتنت بۆ دیاریکراوە، بۆ هیچیان نەچوویت.

من دەچووم، بەڵام ئەوان لەوێ نەبوون.. ئەوان بە کاتی خۆیان و من بە کاتی خۆم، ڕێکنەدەکەوت یەکتر ببینین.. خۆ باشتریش لەوێ نەبوون و یەکترمان نەدەدی.. بەو پرسیارانە هەراسانیان کردبووم.. هەر چییم دەوت، سەریان بادەدا و خێسەیان لێ دەکردم.. یان بەشێوەیەکی زۆر سەیر تەریقیان دەکردمەوە و دەیانوت:

ـ سەیرە تۆ ئێستا ئاوا دەڵێیت، کەچی جاری پێشوو شتێکی ترت وتووە..!!

ماوەیەک بوو چەند سەرم سووک بوو، کە نەمدەدین و و گوێم لە دەنگیان نەدەبوو.. کەچی وا لەپێناوی فێربوونی پێڵاوی چەرخەدار، جیهانی خۆم تێکەڵ بە جیهانی ئەوان کردەوە.. هەر خواخواشمە گوێم لێ بگرن و بەفریام بکەون.. بە چواردەستە هەڵمگرن و بمگەیەننەوە ژوورەکەی خۆم.. هەر ئەوەندە بگەمەوە ئەوێ، بەر لە هەموو شتێ لە ئاوێنەکەوە سەیری کاتژمێرەکە دەکەم.. دوورنییە وەکو ئەوەی ماڵی «میدیا» پیلەکەی کز بووبێت، یان وەستابێت، ئەگینا من ئاوا لێم تێکنەدەچوو.. ئەگەر ئەمجارە دەگەمەوە ئەو ژوورە، بزانە چۆن لە هەموو شتێ زیاتر گرنگی بە کات دەدەم.. کات و ئاوێنە.. خۆ من جارانیش زۆر بایەخم بە ئاوێنە دەدا.. بە ئاوێنە و پێڵاو.. ئاوێنەیەکی چوارگۆشەم لە پشت دەرگا دانابوو، هەر کاتێ بچوومایە بۆ پیاسەی بەردەم زانکۆ، یان بۆ هەر شوێنێکی تر، لێیەوە سەیری پێڵاوەکانم دەکرد.. یەک دوو هەنگاو، بەڵام بە سووکی بۆ پێشەوە، یەک دوانێکیش بۆ دواوە.. جارێک لەسەر نووکی پەنجەکانم و جارێکی تر لەسەر پاشپانی.. دواتر بۆ دڵنیایی ئیسفنجەکەم پیادا دەهێنا.. دەشمزانی وا «خێلان» و «تانیا» و «تاڤگە»ی هاوژوورم سەیرم دەکەن و لەژێرەوە پێدەکەنن.. ناهەقیشیان نەبوو، من ئەوەندە بەدیقەت سەرنجم لە قاچ و پێڵاوەکانم دەدا، کەچی هەر زۆر بەخێرایی شانەیەکم بەقژمدا دەهێنا.. زۆر بەکەمی سەیری دەموچاوی خۆمم دەکرد.. تەنانەت ئاوێنەکەم بەشێوەیەک دانابوو، هەر تەنها قاچمم لێ دیاربێت.. من لە جوانیی چاو و قژ و باڵا و لە ڕێکیی جلەکانم تەواو دڵنیا بووم، تەنها گومانم لە قاچ و پێڵاوەکانم هەبوو... ڕەنگە لەبەرئەوە بووبێت زیاد لە ئەندامەکانی ترم خۆشمدەویستن.. باشە من بۆچی ئەو قاچە بزێوانەمم ئەوەندە خۆشدەویست..؟! چ نهێنییەکی سەیر بوو، هەرچەندم دەکرد، پەییم پێ نەدەبرد..؟! بۆئەوەی زوو زوو جووتێ پێڵاوی تازەیان بۆ بکرم، سکمم برسی و قژمم بێ شامپۆ و دەموچاومم بێ ماکیاج دەکرد.. خۆ پێڵاوکڕینیش شتێکی ئاسان نەبوو.. تا جووتێکم دەدۆزیەوە، کە شایانی قاچەکانم بن، قیڕ دەیوت چەق.. ئەو دووکانانەی سەر شەقامی «دەواسە» و «حەلەب»م یەکە بەیەکە دەکرد.. ئەو کچانەی هاوڕێمم تەواو بێزار کردبوو.. ئەوان ئەگەر لەبەر ئەوە

نەبوایە، کە جووتە کۆنەکەمم دەدانێ، لەگەڵم نەدەهاتن.. من دەڵێم کۆنە، ئەگینا تازەبوون.. هیچیانم مانگێ لە پێ نەدەکرد.. چ هەستێکی سەیرم لە ئاست ئەو قاچانەمدا هەبوو..!! چ خووێکی سەیر و سەمەرە بوو، نەمدەتوانی دەستبەرداری بم..!! کچان چەندیان گاڵتە پێ دەکردم.. کوڕان چەندیان توانج تێدەگرتم و گوێی خۆمم لێ کەڕدەکردن.. ڕۆژێکیان «شەماڵ» پێی وتم:

ــ چەند تۆ دەبینم ئاوا بایەخ بەم قاچ و پێڵاوانەت دەدەیت، باوکمم بیردەکەوێتەوە.. ئەویش بە دەستی بوایە نانی لە دەمی ئێمە دەگرتەوە و دەیدا بە ئەسپەکەی.. جا نازانم ئەوەی ئەسپەکە بۆ باوکمی دەکرد، ئەوان بۆ تۆی دەکەن..؟!

من دەمزانی گاڵتەم پێ دەکات، بۆیە وەڵامم نەدایەوە، کەچی «خێلان» لەولاوە هەڵیدایە:

ــ ئەگەر پێت بڵێم چۆن بەسەر ئەو گردە دەکەوێت، ڕەنگە باوەڕ نەکەیت.. تا ئێمە بە هانکە هانک دەگەین، ئەم لە ژوورەوە دانیشتووە و پشووێکیشی داوە.(*)

«بەناز»ی دەسگیرانی «شەماڵ» وەکو کای کۆن گڕی گرت و وتی:

ــ ئەم منداڵی قەڵایە و ڕاهاتووە.. قەڵانشینەکان هەموویان هەروان.

بەڵام هەموویان هەر وانین.. من هەر لە منداڵییەوە بزێو بووم و لە هەموو منالانی تری قەلا جیاواز بووم.. هەموویان یان بەسەر شەقامەکە، یانیش بە قادرمەکاندا دەهاتنە خوارەوە، کە دەچووین بۆ قوتابخانە، من بەتەنها ڕێگایەکی جیاوازم دەگرت.. مقەبایەک، یان پارچە تەنەکەیەکم دەهێنا و دەچوومە ئەو شوێنەی، کە ئاوی باران لە سەرەوە تا خوارەوە چاڵی کردبوو.. لە چاوترووکانێکدا بەخلیسکێنە دەهاتمە خوارەوە.. جارێک و دووانی تریش سەردەکەوتم و خۆم دەخلیسکاند، ئینجا لەپێش ئەوانیشەوە دەگەیشتم.. بەڵام کاتێ دەگەیشتم، جلە ڕەشەکانم لە ناو تۆز و خۆڵدا سپی دەچوونەوە.. «ستە پەروین»، کە ئاوا دەیدیم، شێت و هار دەبوو.. بەقژ ڕایدەکێشام و بەدار تێمدەکەوت:

ــ خوام لەو خوایەیە بەیانی ئاوا بەم پیسوپۆخڵییە دێیتەوە، دەبێت بەقژ لە

دەسکی ئەم پەنجەرەیەت ببەستمەوە.

دەترسام و بڕیارم دەدا ئیتر بەڕێگای منداڵانی تردا بێم، کەچی بۆ بەیانی هەمان ڕێگای خۆمم دەگرتەوە.. ئەوەی لەبیرم نەدەما لێدان و کوتانی «ست پەروین» بوو.. ئێستاش نازانم بۆچی هەرکە لە بەردەرگای قوتابخانەوە سەیری ئەو چاڵاییەم دەکرد، کە ئەملا و ئەولای لەیەکتر جیا کردبووەوە، بە مەمکی دایکمم دەهاتە بەرچاو..!! باشە من لە کوێ مەمکی ئەوم دیبوو..؟! نەمدیبوو، بەڵام نەگبەت بووم.. سەربەگۆبەند بووم.. وا نەبووایە چۆن «ست پەروین» دەبووە باوەژنم..؟! وام نەکردایە ئەم لە چ ڕێگایەکەوە دەگەیشتە ماڵی ئێمە و دەبوو بە خاوەنی..؟! تۆ بزانە ئەو قاچە بزێوانەم لەوەتەی هەن چورتووم و نەهامەتییم بۆ دەهێنن.. لەوەتەی هەن ڕووڕەشی لای ئەم و ئەوم دەکەن، کەچی هەر خۆشیشم دەوێن.. ئەوا بەئێجگاری سەریان خواردم و پەراگەندەی ئەم شوێنە چەپ و لاپەڕەیان کردم.. بەجارێ سووک و ڕیسوایان کردم.. من هەق نییە ئاوا بێویژدانانە خەتاکەی بخەمە سەر ئەوان.. «کات» بوو فێڵی لێ کردم.. «کات» بوو تەڵەی بۆ نامەوە، ئەگینا قاچی من هی ئەوە نییە لە ئاست پێلاوی چەرخەداردا دۆش دابمێنێت.. کاتژمێری ژوورەکەی خۆم ناپاکیی لەگەڵدا کردم.. ئەو میلە باریک و بنێسەبوو، کە لەوەتەی هەم بەدوامەوەیە و پەلەم لێ دەکات.. بەرەو «دوانزدە» ڕاپێچ مدەکات.. چک یەک.. چک دوو.. چک سێ.. چک... چک... چک... خۆ من لای خۆی لە سنووری خۆیم وەستاندبوو، کارێکی وام پێ کردبوو، نەک هەر دەست لەو چکە چکەی هەڵبگرێت، بەڵکو بەرەو دواوەشم بگەڕێنێتەوە.. من دەمویست ڕابردووم.. هەرزەکارییم.. منداڵییم، هەموو ساتەکانی ژیانی بەسەرچووم بۆ بگەڕێنێتەوە.. دەمویست لەمەودوا لەجیاتی چک چک، کچ کچم بۆ بکات.. چک چک، دەنگی پیری و پەککەوتنە.. دەنگی نەخۆشی و مردنە.. خۆ من دەمزانی گەڕانەوە بۆ دواوە، دەرباز بوون نییە لە «دوانزدە»کە، بەڵام هەر ئەو سەرەیانم بەلاوە چاکتر بوو.. چەند بەختەوەرن ئەوانەی بە تەندروستی چاکەوە لەسەر «دوانزدە»کە لادەدەن.. چەند ئاسوودەن ئەوانەی پیری و پەککەوتەیی ناچاری نەکردوون سەر بە ماڵی «دوانزدە»دا بگرن، بەڵکو خۆیان بەبێ ترس و دوودڵی

له دەرگـا دەدەن.. بەخـۆڕایی نـەبوو «نیـتـشـە» لە هـەمـوو شـتێ زیاتر شـەیدای تەندرووسـتی بوو.. ئـەو ڕاست بۆی چووە، کـە پێی وایە جـەسـتـە چاوگی زیندووی بیـرکردنەوەیە.. ئیـتر من تـەواو ئەوەی هـەمـبـوو لە دەسـتم دا.. ئیـتر چاوەڕێی هـیچ داهێنـانێکم لێ مـەکـەن.. من کـە لە ئـاست فـێـربوونـی پێـلاوی چەرخـەداردا دەسـتـەوسـتـان بم، مـردنم چاکترە.. دەبێت بەتاریکی و بەدزە دزە خـۆم بگەیەنمـە سـەر «دوانزدە».. لەوێ بەسـەرشـۆڕی و ترسنۆکـانە، بەو تواناو وزە ئێـجگار کـەمـەی تیـامـدا مـاوە، هـەر بەنیـنـۆک چاڵێ هـەڵکەنم و بـەبێ ناونیـشـان تیـایدا ڕاکشـێم.. من کە قـاچم لە جووڵە بکەوێت، چی لە چاو و چی لە دەست و چی لە سـەر و دڵ بکەم.. تەنها قـاچە دەتوانێت کاری گەورە ئەنجام بدا.. هـەر قـاچە مـرۆڤ بۆ مـەنزڵی ئاسـوودەیی پێشـڕەویی دەکات.. ئادەی ئەو کـەمـانـەم بـۆ بێـنن و بە لەقــە لەتوکـوتی بکەن.. بە ژێـیـەکـانی بمـخنکێنن.. شیعرەکانم، چیرۆکە کورت و درێژەکانم، لەسـەر لاپەڕەی گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا کۆکەنـەوە و بیانسـووتێنن.. ئیـتـر کـەس داوام لێ نەکات کەمـانجـەی بۆ بژەنم.. کەس داوام لێ نەکات گۆرانیی بۆ بڵێم و شـیـعری بۆ بخـوێنمـەوە.. هۆ کچ و کوڕانی کۆلیـژی «پەروەردە» و «ئەدەبیات»ی زانکۆی «مـووسڵ»، لە ناخی دڵەوە لێتان تووڕە دەبم، ئەگەر وەکو جاران پێم بڵێن:

ــ تۆ هونەرمەندێکی مەزنیت.. کەمانجەژەنێکی بەتوانا و لێهاتوویت.

ئیـتـر من نە کـەمانجـەژەنم و نەدەشـتـوانم وەکو جـاران بەکۆمـەڵ بتـانـهێنمـە گـریانی بەکـوڵ.. مـن کـەمـانیـشـم هـەر بەقـاچ دەژەند.. ڕاسـتـە ئەوەی دەیگرت دەسـتم بوو.. ئەوەی دەجـوڵا پەنجـەکـانم بوون، بەڵام هونـەری قـاچم بوو.. ئەوان لە سـایەی قـاچـمـدا هونـەرمـەندبوون.. لە سـایەی قـاچـمـدا بەناوبانگ بوون.. دەبا لەمـەودوا کـاری وایان پێ بکرێت.. خـۆ ئێـوە لە بیـرتانە بەپێـوە نەبـووایە، من نەمدەزانی بیژەنم.. ئەی هـەموو جارێ پێتان نەدەوتم:

ــ دەتۆ دانیشە با ماندوو نەبیت..؟!

بیـری خـۆتان بخـەنەوە بزانـن، جـارێ لە جـاران منتـان دیوە بەدانیـشـتنەوە کـەمـانم ژەندبێت، یان گـۆرانیـیم بـۆ وتبن..؟! من بەپێـوەش دڵداریيم دەکـرد.. بەپێوەش ئەو هـەتیوەم ماچ دەکرد، کە خۆشمدەویست و باوەڕی پێ نەدەکردم..

پێی دەوتم:

ــ خۆشمدەوێیت، بەڵام لێت تێناگەم.

دواجاریش کە یەکترمان دی، هەر وای پێ وتم.. بەڵام وتنی ئەو جارەیانی تەواو جیا بوو.. قوڵپی گریانێ لەرەیەکی گوناهی خستبووە دەنگیەوە.. تەمی گومانێکی زەپکاو، ڕەنگوڕووی تەواو گۆڕیبوو.. گریانی ئەو جارەیانی هیچ لە هی جارانی نەدەچوو.. دەگریا و سەریشی هەڵنەدەبڕی.. دەگریا بەبێ ئەوەی بهێڵێت لە چاوەکانی ڕابمێنم.. هەر دەتوت نەیدەویست چیتر من وەکو جاران چاوە شینەکانی بەپڕ فرمێسکی ببینم و لەزەت لە جوانی ئەو کاتە کورت و کەمخایەنە وەربگرم.. گریا و گوێی لێ نەگرتم شتێ بە گوێچکەیدا بچرپێنم.. هەر هیچ نەبووایە وەکو جاران بەگاڵتەیەک، کە تەنها خۆی دەیزانی چەند حەزی لێ دەکات، پێم بوتایە:

ــ دەبەسە دەی.. دەزانم هەر بۆ ئەوە دەگریت تا سەرنج لەو چاوە شینانەت بدەم، چونکە دەزانیت من ئەو کاتانەی بەگریانەوە دەیانبینم، لە بەرچاوم دەبن بە نوقڵ و دەمەوێت بیانخۆم.

هەندێ جاریش بەنازێکەوە پێم دەوت:

ــ ئەوە تۆ ئیشێکی چاکت کرد نوقڵت بیری من خستەوە..؟! ئەوەتا دەمم ئاوی کرد.

چەند گوناه و داماو بوو.. چوار ساڵ بەیەکەوە بووین و بەتەنیشت یەکەوە دادەنیشتین.. بەجووتە پیاسەی بەردەم زانکۆ و ناوبازاڕمان دەکرد.. لەو دارستانە گۆرانیی دنیام بۆ وت.. بەو کەمانجەیە «باسەرە»یەک فرمێسکم پێ ڕشت، کەچی هەر لێم تێنەدەگەیشت.. هەر زوو زوو ئاخی هەڵدەکێشا و دەیوت:

ــ خۆشمدەوێیت، بەڵام لێت تێناگەم.

ئەگەر ئاخیشی هەڵنەکێشایە، هەر باوەڕم پێی دەکرد.. ئەگەر نەشگریایە هەر دەمزانی درۆ ناکات.. ئەو ڕاستی دەکرد، من کەسێکی سەیر بووم.. زۆر زۆریش سەیر بووم.. ئەو خەیاڵانەشم ئێجگار وایان لێ کردم خەڵک بەلایانەوە سەیربم.. ئەو بیرکردنەوانەم وایان لێ کردم لە هیچ کەس نەچم.. وایان لێ

کردم لەو هەموو خەڵکی وا زۆر و زەبەند تەنیا بم.. من بە تەنیا باوەڕم بە مردنی دایکم نەدەکرد.. باوەڕم نەدەکرد بەسەر منەوە چووبێت.. ئەگەرچی باوکم و پوور و نەنکیشم هەر وایان دەوت، بەڵام من باوەڕم پێ نەدەکردن.. بزانە من بەو منداڵییەی خۆم چ چیرۆکێکی سەیر و سۆزرەتم بۆ کۆچەکەی ڕێکخستبوو..!! وا خستبوومە دڵی خۆمەوە، کە جیهانێکی تری جیاواز لەو جیهانەی ئێمە لەژێر قەڵادا هەیە.. ئەوان خەڵکی چەند هەزار ساڵ بەر لە ئێستان و تاکو ئەمڕۆش هەر ماون.. دەرگایەکی هەیە و وا لەناو ماڵەکەی ئێمەیە، دەتوانیت لێیەوە بۆی بچیت.. کەس بەنهێنیی ئەو دەرگایە نازانێت، باوکم نەبێت، بەڵام ئەویش بە کەسی ناڵێت.. کاتی خۆی چووە بۆ ئەوێ و بۆ کۆشکی شاکەیان.. لەگەڵ کچە تاقانەکەی شادا دڵیان بەیەکتردا چووە.. کاتێ باوکم داوای لە شا کردووە، ئەم ڕازیی بووە بەو مەرجەی هەر لەوێ بمێننەوە، بەڵام باوکم هەر سوور دەبێت لەسەر گەڕانەوە.. دواجار بەتەگبیری کچەکە لەسەر ئەوە ڕێکدەکەون، بڕۆنەوە سەر قەڵا و لەوێ بژین، ئەگەر نۆبەرەیان کوڕ بێت، ئەوا هەر لەوێ بمێننەوە، ئەگەر کچیش بوو بێنەوە.. ئیتر باوکم کچە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت.. دوای نۆ مانگ منیان دەبێت، بەڵام باوکم لە بەڵێنی خۆی پاشگەزدەبێتەوە.. دایکیشم بەناچاری و بەدڵساردی دەگەڕێتەوە لای باپیرم... من چەند کتێبی مێژوویی و جیۆلۆجییم لەسەر قەڵا خوێندەوە و نەمدی تاقە لاپەڕەیەک باس لەو جیهانە بکات، کەچی هەر خۆمم بەڕاست دەزانی.. هەمیشە لە خەیاڵی خۆمدا دەمهێنا و دەمبرد.. ئەگەر کچێکی سەردەمی سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر شوو بە کوڕێکی ئەم سەردەمە بکات و منداڵێکیان ببێت، تەمەنی منداڵەکە کاتی لە دایک دەبێت چەندە..؟! سەر بە کام سەردەمە..؟! ئایا تەمەنی وەکو هی ڕەگەزی دایکی درێژ دەبێت، یان کورتە وەکو هی باوکی..؟! ئەوا ئەو پێلاوە چەرخەدارانە ئەو مەسەلە حیسابییەیان یەکلاکردەوە.. ئەوا ئەو گرێیەی تەمەنمیان کردەوە و دەریانخست، کە من کچی ئەم سەردەمە پیسکە و لە ئاست تەمەن دەستقوچاوەم.. کچی ئەم سەردەمە قرچۆک و دڵڕەقەم، کە بە چکە چکی کاتژمێر هەراسانی کردووم.. ئێستا من زانییم دایکم مردووە، بەڵام چی بکەم

له ئاست گریان و خۆڕنینەوەشدا دەستەوستانم.. تا لەوێ بووم و قاچم هەبوو، جارێ نەچووم لەسەر گۆڕەکەی پڕ بە شووشەی گوڵاوێ فرمێسکی بۆ بڕێژم.. باوەڕم نەدەکرد ئەو گۆمەتەخۆڵە، کە هەر لە بێشکەی منداڵ دەچوو، گۆڕی دایکم بێت.. من ڕازییش نەدەبووم کەس بە دایکمردووم بزانێت.. لە بیرمە ئەو جارەی «ست پەروین» پێی وتم:

ــ وا دیارە تۆ بەلێدانی من واز لەم پیسوپۆخڵییەت ناهێنیت، بەیانی دایکت لەگەڵ خۆتدا بێنە، قسە لەگەڵ ئەو دەکەم.

هێشتا من وەڵامیم نەدابۆوە، «هاژە»ی دراوسێمان پێی وت:

ــ دایکی مردووە.

هەر خێرا دەستم لە قژی گیرکرد و پێیم وت:

ــ من دایکم نەمردووە.. چۆتەوە ماڵی باپیرم.

«ست پەروین» وتی:

ــ دەباشە باوکت بێنە.

باوکمم هێنا و ژوورەکەی «ست پەروین»م پیشان دا...

ئەوە ئەو هەموو کاتە لەو ژوورە هەر باسی پیسوپۆخڵیی منیان دەکرد..؟! ئەی دوایی «ست پەروین» هەر بۆ ئەوە هاتوچۆی ماڵی ئێمەی دەکرد و دەرگای ژوورەکەیان بەسەر خۆیاندا دادەخست..؟! لە بازاڕ و لەسەر شەقامەکاندا، کە بەجووتە پیاسەیان دەکرد، هەر بۆ ئەوەبوو تەگبیر لە حاڵی من بکەن..؟! ئەگەر وابوو بۆچی باوکم سەرزەنشتی نەدەکردم..؟! بۆچی گوێچکەم، یان قژمی ڕانەدەکێشا..؟! خۆ هەموو ڕۆژێ جلەکانیشی دەشتم و هیچ بۆڵەبۆڵیشی نەدەکرد.. من ئەو کاتە لە پۆلی «چوار» بووم.. ئەگەرچی ڕقی زۆرم لە کتێبەکانم بوو، بەڵام زیرەکیش بووم.. دەمزانی بەئاسانی دەردەچم و دەبم بە «پێنج»، ئیتر «ست پەروین»م لە کۆڵدەبێتەوە.. من دەرچووم، بەڵام «ست پەروین»م لە کۆڵ نەبووەوە.. نەخێر، بوو بە ژنی باوکم.. بوو بە مامۆستای هەمیشەییم.. بوو بە میلە باریک و درێژەکەی کاتژمێری قەد دیواری ژوورەکە و کەوتە چکە چک.. ماڵ و قوتابخانەی لێ کردم بەیەک.. ڕۆژانی هەینی و پشووی نیوەی ساڵ و سەری ساڵیشی لێ هەڵگرتم.. وامدەزانی شەو و ڕۆژ

لەسەر کورسیە ڕەقەکەی قوتابخانە دانیشتووم و «ست پەروین» لە بەرامبەرم وەستاوە.. وەستاوە و «مێژووی عێراق و وڵاتانی دراوسێ»م بۆ باس دەکات.. مەنجەڵی چێشت، قاپ و قاچاغ، سەماوەرەکەی بەردەمی، پیاڵەی چاکەی دەستی، هەر هەمووییم لێ دەبووە «مێژووی عێراق و وڵاتانی دراوسێ».. «مێژووی عێراق و وڵاتانی دراوسێ»ی تێکەڵ بە نان و چێشتم کرد، کەچی هێشتا ئەم ناڕازیی بوو.. پێی دەوتم:

ــ ڕازیی نابم لە ماڵەوە بە «ست» بانگم بکەیت.. هەر چەند تۆ ئاوا بانگم دەکەیت، وا دەزانم لەو قوتابخانە کاولبووەم.

باشە ئەوە هەر لەسەر پیسوپۆخڵیی من بوو، ئاوا زوو زوو دەبوو بە شەڕیان..؟! ئەو فەرتەنەیان لەسەر من دەخوڵقاند..؟! خۆ من ئەو کاتە وازم لە خلیسکێنە هێنابوو، جلەکانم درەنگ درەنگ چڵکن دەبوون.. زۆر جار بەدزییەوە دەچوومە پشت دەرگای ژوورەکەیان و گوێم هەڵدەخست، تا بزانم شەڕیان لەسەر چییە.. گوێم لە ناوی خۆم دەبوو، بەڵام هیچ شتێکم لەسەر پیسوپۆخڵیی نەدەبیست.. باشە باوکم لە داخی من دڵی لە لێدان کەوت..؟! باوەڕ ناکەم.. شەو پێش ئەوەی بنوێت دیم هیچی نەبوو.. من لە هەیوانەکەدا کراسم لەبەر بووکە تازەکەم دەکرد، کە دەرگای حەوشەی کردەوە و بەدەم گۆرانیوتنەوە بۆ ژوورەوەکەی خۆیان چوو.. وابزانم مەست بوو، بۆیە گۆرانییشی دەوت.. تەنانەت کە لە پشت دەرگاکە پێڵاوەکانی داکەند، پێی وتم:

ــ جووجەڵەی ناوخۆڵ، ئەوە هێشتا نەنووستوویت..؟!

من دەمزانی باوکم هەر کاتێ ئاسوودە بووایە، ئەم گاڵتەیەی لەگەڵدا دەکردم.. کەواتە نەخۆش نەبوو.. دڵتەنگ نەبوو، کەچی بەیانی لەگەڵ هاوار و ڕۆڕۆی «پەروین» بەئاگا هاتم.. کاتێ چووم، لەسەر تەختەکە چاوی لێک نابوو.. ئەی باشە بۆچی «پەروین» هەر زوو زوو پێی دەوتم:

ــ سەرەخۆرەی سەربەگۆبەند..؟!

ئەوە بۆچی وای پێ دەوتم..؟! ئەی ئەگەر سەرەخۆرە و سەربەگۆبەند بووم، بۆچی دەستبەردارم نەدەبوو..؟! جاران باوەژنم بوو، بۆی هەبوو پێم بڵێت ئاوا بکە و ئاوا مەکە.. بۆی هەبوو چاوم لێ سوورکاتەوە و قژم ڕابکێشێت، بەڵام

کە باوکم نەما، ئیتر چی ئێمەی بەیەکتر دەبەستایەوە..؟! ئەم هەروەکو جاران بە دوامەوە بوو.. هەروەکو جاران خۆی بە خاوەنم دەزانی.. تا ئێستاش هەر بە هی خۆیم دەزانێت.. بزانە من لە چ ماڵێکی سەیر و سەمەرە چاوم کردەوە و گەورە بووم.. تا ئێستاش نە لە دایکم و نە لە باوکم و نە لە خۆم و نە لەو باوەژنەم نەگەیشتووم.. وا دەمرم و هەر تێنەگەیشتم.. وا چاوم ئاوا دەبێت و ئەم هەموو مەتەڵە لەگەڵ خۆمدا دەبەمە ژێر گڵ.. ئەو کوڕە ناهەقی نەبوو پێی دەوتم:

ــ خۆشمدەوێیت، بەڵام لێت تێناگەم.

سەرەتام سەیر و بوونم هەر سەیر و کۆتاییشم سەیرتر.. لە خەیاڵی کێدا بوو، جووتێ پێڵاوی چەرخەدار کۆتایی بە ژیانم بهێنێت..!! ئەوەتا لە پایینی ئەم هەوارازەدا بەبێ جووڵە، بەبێ هەوڵ و تەقەلا کەوتووم.. کاتێ خۆم ئاوا دەبینم، «سیزیف»م بیر دەکەوێتەوە، کە بەردە گەورەکەی بەشان سەردەخستە سەر ئەو شاخە بەرزە.. هەرکە دەیگەیاندە لووتکە، لەوێ لەبەر قورسی لێی دەکەوتە خوارەوە و دەبووایە جارێکی تر سەریخاتەوە.. بەڵام من نە «سیزیف»م و نە وەکو ئەوم پێ دەکرێت.. ئەوەندە هەیە «سیزیف»یش وەکو من ڕقی لە «دوانزدە» بوو.. ئەم لەپێناوی ژیان، ئاسمانی بە زەوی گۆڕیەوە.. گۆمەئاوێکی قەڵای «کۆرنت»ی پێ لە برووسکەی ئاسمان چاکتر بوو.. بینینی ئاو و ڕۆژ و بەردی گەرم و ڕووباری سەر زەویی لە تاریکایی دۆزەخی ئاسمان بە چاکتر دەزانی.. هەر لەسەر ئەوە خواوەند سزای دا و لەسەری کرد ئەو بەردە گەورەیە بەسەر ئەو شاخە سەختە بخات.. «سیزیف» بە هۆشیارییەوە ئەم تراژیدیایەی هەڵبژارد، بەڵام من کەسێکم لە ئەقڵ و هۆش خاڵی.. من بەقاچەکانمەوە هۆشیار بووم، ئەوا ئەوانیشم لە دەست دا.. «سیزیف» بەهێزی قاچەکانی بەردی هەڵدەگرت و ئازایانە سەریدەخست.. کاتێ لێشی دەکەوت و بەرەو خواری خوارەوە تلۆردەبووەوە، ئەم بەهەنگاوی قورس، بەڵام بەرێک و پێکی، بۆی دادەبەزی، بەرەو ئەو ئەشکەنجەیەی، کە کۆتاییەکەی دیار نەبوو..(**) منیش جاران بەو منداڵیەی خۆم بەهێزی ئەو قاچانەم بەسەر قەڵا دەکەوتم و بەخلیسکێنە دەهاتمە خوارێ.. ئەو «ست پەروین»ـە چەندی کردی و

کۆشای نەیتوانی وام لێ بکات وازبهێنم، بەڵام داخەکەم دوایی فیلمەکەی دۆزیەوە و بوو بە باوەڕنم.. وابزانم پێرێ شەو بوو، خەونێکی زۆر سەیرم بە «پەروین»ـەوە دی.. جلێکی لەو جلە ڕەشانە لەبەرکردبوو، کە کچانی سەرەتایی بۆ قوتابخانە لەبەری دەکەن.. کاتژمێرە گەورەکەی دیواریشی خستبووە سەر سەری.. جا نازانم بەچی ئاوا وەستاندبووی، جوولەی نەدەکرد.. کتێبی «مێژووی عێراق و وڵاتانی دراوسێ»کەشی بەدەستەوە گرتبوو.. ئەوەندەم نەزانی چوو بۆ ئەو شوێنەی، کە من جاران خلیسکێنەم لێ دەکرد.. پارچەتەنەکەیەکی هێنا و لەسەری دانیشت.. هەردوو قاچی لێ ڕاکێشا و لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکەی کردەوە.. هەرکە خۆی خلیسکاند، بەدەنگ کەوتە خوێندنەوەی.. دەبێت ئەوەش بڵێم تا میلی کاتژمێرەکە نەگەیشتە سەر «دوانزدە»، ئەم خۆی نەخلیسکاند.. میلەکە جارێ خولایەوە و ئەم گەیشتە خواری خوارەوە.. لەوەش سەیرتر ئەوەبوو، لەم ماوە کورتەدا لاپەڕەکەی تەواوکرد.. ئیتر سەرکەوتەوە بۆ لاپەڕەی دووەم و سێیەم و ئەوانی تر.. بەمجۆرە هەر «چوار» بەشی کتێبەکەی خوێندەوە.. ئەوەم لەبیرنییە باسی ئەو هەموو خەڵکە بکەم، کە لەوێ وەستابوون و گوێیان لێ دەگرت.. کاتێ دەگەیشتە خوارەوە و تا سەردەکەوتەوە چەپڵە و فیکەیان بۆ لێ دەدا.. نازانم بۆچی من هەر لەخۆمەوە بەزەییم پیادا دەهاتەوە و بۆی دەگریام.. پیاوێکی سەرماشوبرنج بەتەنیشتمەوە وەستا بوو، لێی پرسیم:

ــ کچی گەورەم، ئەوا خەڵک هەمووی سەرگەرمی خۆشیە، تۆ بۆچی بەتەنیا دەگریت..؟!

ــ ئاخر ئەو ژنەی وا ئەم خلیسکێنەیە دەکات، دایکمە.. دەترسم بکەوێت و شوێنێکی بشکێت، یان سەری گێژ بخوات و مێشکی بتەقێت.

ــ مەترسە کچی خۆم، تا ئێمە لێرەبین، ناهێڵین هیچی لێبێت.. ئەوە مامۆستای ئێمەیە و خۆمان و ماڵ و منداڵمانی بە قوربان دەکەین.

ــ خۆ من هەر ترسی ئەوم نییە بەتەنیا، هی ئێوەشمە.

ــ ئێمە بۆ..؟! وا بۆ خۆمان شاد و کەیفخۆش گوێمان گرتووە و سەیری دەکەین.

ـ من لە «دوانزدە»کـە دەترسـم.. لەوە دەترسـم دایکم لەپڕ مـاندوو بێت، یان سەری گێژ بخوات و بکەوێتە سەری.

ـ دوانزدەی چی و حاڵی چی..؟! کچم ئەوە تۆ چییت بەسەر هاتووە..؟!

ـ مامە گیان بە قوربانت بم خێرا ئاوێنەیەک بۆ خۆت بێنە و بەوانیش بڵێ با تا زووە سەرو ئاوێنە پەیداکەن.. دەی خێرا تا کار لە کار نەترازاوە.

لەگەڵ دەنگی گریانی خۆم بەئاگا هاتمەوە.. هێشتا هەر بەزەییم پیادا دەهاتەوە.. وابزانم لەبەرئەوە بوو، چونکە لە ئاوێنەکەوە سەیری کاتژمێرەکەم دەکرد.. کەواتە کاتژمێرەکەم تاکو پێرێش نەوەستا بوو.. ئەی باشە من بۆچی ئاوا لێم تێکچووە و جارێکی تریش هاتوومەتەوە سەر کاتی ئەوان..؟!

کاتێ بە ئاگا هاتم، سێ چوار منداڵە «بۆسنەیی»، لە ڕاڕەوەکەدا بەزاق و زریق ئەو ناوەیان هێنابووە هەژان.. دەرگام کردەوە و لێیان تووڕەبووم:

ـ ئەرێ ئێوە بۆچی ناچن بنوون..؟!

دەستیان بەپێکەنین کرد و بەشێوەیەکی زۆر سەیر لە سەروسیمام وردبوونەوە.. یەکێکیان کە لە هەموویان گەورەتربوو وتی:

ـ شەو و ڕۆژ هەر بنووین..؟!

دایکیشی لە دەرگاکەی بەرامبەرم سەری دەرهێنا و بەڕوویێکی زۆر خۆشەوە وتی:

ـ وا دیارە تۆ تازە هاتووی بۆ ئەم ژوورە.!!

ـ تازەی چی..؟! دەمێکە لێرەم.

ـ سەیرە..!! ئەوە یەکەمجارە بتبینم.. هەرواشم دەزانی ئەم ژوورە بەتاڵە..!!

نازانم بۆچی هەر لەخۆمەوە خۆشمویست.. شێوەی زۆر لە «تاڤگە»ی هاوڕێم دەچوو.. وەکو ئەویش سەروزمانی شیرین بوو.. حەزم کرد پەیوەندی لەگەڵدا ببەستم.. پێم وت:

ـ حەزدەکەیت لەمەودوا یەکتر ببینین..؟!

ـ ئەی بۆ حەز ناکەم..؟! بەخۆشحاڵییەوە.

ـ ئاوێنەتان هەیە..؟

ــ بەڵێ، هەمانە.. هەر ئێستا بۆت دەهێنم.
خەریک بوو بچێت بۆمی بهێنێت، پێم وت:
ــ وەرە بۆ کوێ دەچیت..؟! من ئاوێنەی خۆمم هەیە.
ــ ئەی کەوابێت بۆچی پرسیارت لێ کردم..؟!
ــ ئەگەر دەتەوێت من ببینیت، ئەوا دەبێت ئاوێنەکە بخەیتە بەرامبەر کاتژمێرەکەتان.. کاتژمێرتان هەیە وانییە..؟!
ــ هەمانە، بەڵام من لە تۆ تێناگەم.
وایدەزانی گاڵتەی پێ دەکەم، کەچی هێشتا تووڕەش نەبوو.. پرسی:
ــ تۆ خەڵکی کوێیت..؟
ئا ئەمە ئەو پرسیارەیە، کە من نازانم وەڵامی بدەمەوە، کەچی سەر بەهەر شوێنێکیشدا دەکەم، لووتم دەتەقێت بە لووتییەوە. من هەر جارێ شوێنێ دەڵێم.. جاری وا هەیە شوێنی وام وتووە، کابرا هەر حەپەساوە و وتوویەتی:
ــ بۆچی وڵاتی ئاواش هەیە و من نەمزانیوە..؟!
بەڕاستی ئەو خەونە نەبووایە، نەمدەزانی وەڵامی ئەو ژنە «بۆسنەیی»ـەش بدەمەوە.. وتم:
ــ من خەڵکی سەر زەمین نییم.
ئینجا تووڕە بوو.. خێسەیەکی کرد و بەتەوسێکەوە وتی:
ــ دیارە خەڵکی ئاسمانیت..!!
ــ نەخێر، خەڵکی ناو کتێبەکەی دەستی باوەژنمم.. هەر لەوێ چاوم کردۆتەوە و هەر لەوێش گەورە بووم.
من قسەکەمم تەواو نەکردبوو، ئەم بەزمانەکەی خۆیان، کە وایدەزانی لێی تێناگەم، کەوتە جنێودان و دەرگاکەی بە قایمی بە ڕوومدا داخستەوە:
ــ زێزۆش تیمەنە..؟! تیسی گلووپ، کوورڤە.. تینێمەش رۆدیتەلیە.. تینیسی ئوودگۆیەنە، تینەپۆزنەش ڕێسپێکت.(***)
باوەڕم نەدەکرد ئەو ژنە هێمن و ڕووخۆشە ئاوا زوو بە قسەکانم قارس بێت.. بمزانیایە ئاوا دڵی دەڕەنجێت، قسەی وام نەدەکرد.. خۆ من هیچ مەبەستی تووڕەکردنیم نەبوو، بەڵام ئەو لە من نەدەگەیشت.. پڕبەدڵ حەزم

دەکرد بیکەم بە هاوڕێی خۆم، هیچ نەبووایە لە «تاڤگە» دەچوو.. هیچ نەبووایە کاتێ دەمدی، ئەو ژوورەی خۆمانم بیردەکەوتەوە.. نوکتە و قسە خۆشەکانی «تاڤگە»م بیردەکەوتەوە.. چی هەبوو خۆشتر لەو قسانەی «تاڤگە»..!! کچی هەموو ژوورەکانی تر لەو ژوورەی ئێمەدا کۆدەبوونەوە و گوێیان لە قسە خۆش و بەتامەکانی ئەو دەگرت.. ئەوەندە پێدەکەنین و دەتریقانەوە، تا سکیان دەیەشا.. دوایی هەر ئەوەندەمان دەزانی «تاڤگە» ماتی دایدەگرت و خەیاڵ دەیبردەوە.. لەپڕ دەستی بە گریان دەکرد.. سەرەتا باوەڕمان پێی نەدەکرد.. باوەڕمان نەدەکرد دوای ئەو هەموو پێکەنین و قاقالێدانە بگری، بۆیە پێمان دەوت:

ــ چییە ئەو فشەیە..؟! دەتەوێت بڵێین لە شت دەگەیت و بەقووڵی بیردەکەیتەوە..؟!

دواتر زانیمان بەڕاستی و لە دڵەوە دەگری.. دەیوت:

ــ من کە زۆر پێدەکەنم و خەڵک دەهێنمە پێکەنین، هەست بەڕەشبینی دەکەم.. هەست بەکورتیی تەمەن و مردن دەکەم.

هەر خۆیشی دەیوت:

ــ ڕەنگە لەبەرئەوە بێت، کە زیاد لە پێویست لەزەت لە پێکەنین و ئاسوودەیی دەبینم و لەوە دەترسم لە دەستم بچن.

ئێوارەیەکیان، کە لە پەنجەرەکەوە سەیری ناو شاری دەکرد، لەپڕ دەستی بە گریان کرد و وتی:

ــ هیچ شتێ ئەوەندەی پێکەنیین ناتوانێت بمگریەنێت.

کاتێ دەگریا، دەچووە لای زۆپاکە.. فرمێسکەکانی دادەبارانده سەری و دەیکرد بە چزوهووڕ.. هەمووومان سەرمان لەو کارەی سووڕما بوو.. جارێکیان لێم پرسی:

ــ ئەوە گوڵم تۆ بۆچی ئاوا ئەو فرمێسکانەت دەسووتێنیت..؟!

زۆر خەمبارانە وتی:

ــ ئەمە تەنها باوەڕێکی خۆمە.. وا دەزانم ئەگەر وابکەم، ئەوەی بۆی دەگرییم، هەست بە ئازارەکانی دڵم دەکات.

ئەرێ ئەوە چۆن زانی ئاوا بەگوناهی بیلێت..؟! خۆ من دوایی زۆر هەوڵم دا وەکو ئەوی بلێمەوە و نەمتوانی.. ئێستاش هەر ناتوانم.. کردمە باوەش و تێر تێر ماچم کرد و بەخۆمەوەم نووساند.. نەمدەزانی گیانی کاممان بوو ئاوا دەلەرزی و مووچرکی پیادا دەهات.. پێم وت:

ــ تۆ دڵێکی زۆر پاک و گەورەت هەیە زۆر..!!

ئەوسا سەری هەڵبڕی و سەیرێکی چاوەکانی کردم، منیش بزەیەکم بۆی کرد.. دەمزانی چی لێم دەوێت.. هەر خێرا کەمانەکەم لەژێر تەختی نووستنەکەم دەرهێنا.. دەشمزانی بەکام ئاوازە دڵی خۆش دەبێت و خەمەکانی لەبیردەچێتەوە.. خۆ من وەکو ئێستا نەبووم.. قاچم هەبوو گۆرانییم دەوت.. بەپێوە دەوەستام و کەمانجەم دەژنی.. شاعیر و چیرۆکنووس بووم.. بەڵام نا.. من هیچ یەکێ لەوانە نەبووم.. نە هونەرمەند بووم و نە نووسەر.. من دەزانم چەند ساتێکی تر لە پایینی سەر ئەم شەقامە، ئەو گیانە کەم و کزەی لەو جەستە داهێزراو و بێکەڵکەمدا ماوە، دەردەچێت.. دەزانم لە سەر «دوانزدە»کە پاڵکەوتووم و جووڵەم بۆ ناکرێت.. چاک دەزانم مەرگ ئەوەندە لێم نزیکە، وەکو چۆن بەمنداڵیی بەم دوو پەنجەیەم، باڵە تەنک و شەفافەکانی پەپوولەم لە باخچەی قوتابخانەدا دەگرت، ئاوا دەتوانم بیگرم، بەڵام ئەگەر زیندووش ببمەوە هەر خۆم بە هونەرمەند و نووسەر نازانم.. من لە شیعر و چیرۆکەکانمدا باسی ڕووبار و شاخ و کانی و جۆگە و بەفر و باران و ژن و پیاو و منداڵم کردووە، بەڵام بەلای پێڵاوی چەرخەداردا نەچووم.. من لە سەر ڕابردوومم نووسیوە.. باسی گەڕەک و شار و هاوڕێکانی منداڵییمم کردووە، بەڵام کوا چییم لەسەر داهاتووم وتووە..؟! باسی سەرەتامم کردووە، بەچاوپۆشین لەو هەموو گومانەی هەمە لەسەری، بەڵام کوا کۆتاییم..؟! کوا گۆرانییەکم، ئاوازێکم، شیعرێکم، چیرۆکێکی کورتم، یەکێکی درێژم، نوقڵانەی ئەم مەرگەساتەیان لێدابێت..؟! پێشبینیی ئەم کۆتاییەیان کردبێت..؟! دە ئاخر ناهەقیشم نییە.. من لە کوێ پێڵاوی وام دیبوو، تا لەسەری بنووسم..؟! من بۆچی ئاوا زوو زوو میلە باریک و بنێسەکەم لەبیردەچێتەوە و خەتاکە لەسەر ئەو لادەبەم..؟! باشە من بۆچی ئاوا بەجاری ورەی خۆمم

ڕووخـــاندووه..؟! ئەوە هـەمـــووی خـەتـای ئەو بیــرە ســـەیر ســـەیرانـەیە، کــە بەخـەیاڵمـدا دێن و دەچن.. وام لێ دەکـەن تەنهـا بیـر لە «دوانزدە» بکەمـەوە و هەمـیـشـە هـەر ئـەوم لەبەرچاو بێت.. بەڵام هـەق نیـیـە ڕێگایـان بدەم، چیـیـتـر بەئارەزووی خـۆیان مـێشکم بکەن بە خان و بارگە و بنەی خـۆیانی لێ بخـەن.. من لـەجـیـــاتی ئـەوەی جـــورئـەت بنێـــمـــە بـەرخـــۆم و ئـەگـــەر بـەبرینداری و بەتێکشکاویشـبێت، ڕێگا ببڕم، دەچم ڕووداوی ترسـناکی چەند ساڵ لەمـەوبەر بیری خـۆم دەخـەمـەوە.. من بۆ ئەو قسـەیەی «تاڤگە» بیـر خـۆم ناخـەمـەوە، کە شەوی بەفرە زۆرەکە پێی وتم.. ئەو کاتەی پەردەکەی لادابوو، سەیری ئەو کلوە بەفرانەی دەکرد، کە بە نەرم و شلی بەسەر قژی ڕەشی شەودا دەبارین:

ـ بەفر و مردن چەند لە یەکتر دەچن کوێستان گیان..!! ڕاستە ئەمیان سپـییە و ئەویان ڕەش، بەڵام هـەردووکیـان بە دزە دزە و لەناکـاو دێن.. ئەوەی سەیرە ئێمەین، بە بەفر شەڕ دەکەین و لە ئاست مردندا ئەژنۆمان دەشکێت.. هەر لەبەر ئەمەشە بەفر زوو دەتوێتەوە و مردن دەمێنێتەوە و دەمانتوێنێتەوە.

چیـیـتـر چاوەڕێی مـەرگ ناکـەم، بێت و بەئاسـانـی لەم شـوێنە چۆڵوهۆڵەدا، بەبێ ئـەوەی هـاوارێ بکـەم، یان خـــۆمـی لە دەست ڕابپـــسکێنم، دەست لە بینەقاقام گیر بکات.. تەواو ئیتر هەر چۆنێ بێت سەردەکەوم.. ئەگەر بشـمرم با لە سـەرەوە بمرم، نەک لەم دامێنە.. با یاخییانە بمرم، نەک بەدەستەمۆیی.. ئەم بە دزە دزە دێت، وەکـو «تاڤگە» دەیوت، من بەفـرئـاسـا دەیکەم بـە تۆپەڵ و شـەڕی پێ دەکەم.. هـەر ئێسـتـا هەڵدەستمـە سـەرپێ.. خۆم گورجدەکەمـەوە و هەنگاو دەنێم.....

ـ نـابێت خـــۆت بجـــووڵێنیت.. دەزانم لـە ناو جـێگادا بێـــزار بوویت، بەڵام هـەمووی چەند ڕۆژێکی ترە و هەڵدەستیتەوە.

ئەوە من لە کوێم..؟! ئەوە بۆ بیرم نەمابوو لە نەخـۆشخـانەم..؟! چی بوو ئەو خەیاڵە بـەدفەڕ و قرچۆکە..؟! چی بوو ئەو خەونە بێتام و نامـاقووڵە..؟! ئەوە چ نەهـامـەتـیـیـەکـە من هەردوو قـاچم لە ئەژنۆوە بـڕاوەتەوە و خـەون بەپێـلاوی چەرخـەدارەوە دەبینم..؟! ئەوەتا دارشـەقـەکـانیـان بۆ داناوم، تـا هـەر کـاتێ چاکبوومـەوە، بیـانخـەمە ژێر هـەردوو باڵم و پێیـان بڕۆم.. «ئانا کییستـینا» لە

بەرامبەرم دانیشتووە و ئاخم بۆ هەڵدەکێشێت.. هەر دەڵێیت زانیویەتی من بیرم لە چی دەکردەوە، بۆیە سەیرکردنی ئەمڕۆی جیایە لە هی ڕۆژانی.. ئەمڕۆ زیاد لە ڕۆژان سۆز و بەزەیی لەو دوو چاوە شینانەیدا بەدی دەکەم.. خۆ دووریش نییە، لەبەرئەوە بێت ئیتر نەمبینێتەوە و ماڵئاواییم لێ بکات.. ئاخر ئەم دکتۆری قاچەکانم بوو.. بەهۆی قاچەکانمەوە منی دەناسی.. بەهۆی قاچەکانمەوە یەکترمان دەدی و گوێی لە ئازارەکانم دەگرت.. لەبەر قاچەکانم بوو دەستی بەسەرمدا دەهێنا و دڵنەوایی دەکردم.. ئەوا ئەوانیش نەمان.. ئیتر چی بەیەکمان دەبەستێتەوە.. تۆ بڵێیت ئەویش وەکو «پەروین»ی باوەژنم بەوەفا بێت..؟! ئەم دوای مردنی باوکم وازی لێ نەهێنام.. ئاخۆ ئەو دوای مردنی قاچەکانم، هەر ئاوا لەگەڵمدا دەمێنێتەوە..؟! ئەمەش نەهامەتییەکی ترە و وەکو «پەروین» لێم دەبێت بە مەتەڵ و دەبێت تا ماوم خەریکی شیکارکردن و لێکدانەوەی بم.. ئیتر ئەوەندەی تر گومان ئۆقرەم لەبەر دەبڕێت.. من کە تا ئێستا پێڵاوم دەکردە پێم، ئەو هەموو گومانەم لە دەوروپشتم دەکرد.. ئاخۆ لەمەودوا کە دەیکەمە ملم، حاڵم چۆن دەبێت..؟!

دانیمارک ــ نۆڤێمبەری ١٩٩٦

---

* هەر بەڕاستییش بەشی ناوخۆکانی کچانی زانکۆی «مووسڵ» لەسەر گردێکی زۆر بەرزبوون.. بۆ مەبەستی چیرۆکەکە زۆر گونجاوە.

** مەبەست لە «ئەفسانەی سیزیف»ـە.. هەندێ لە ڕستەکان وەکو خۆیان لە کتێبی «ئەفسانەی سیزیف» ی «ئەلبێر کامۆ» وە وەرگیراون.

*** واتا: «گاڵتەم پێ دەکەیت..؟! تۆ شێتیت، سۆزانییت.. تۆ زۆڵییت و پەروەردە نەکراویت.. تۆ کەسێکی بێڕێزیت».

ئەم چیرۆکە پێشتریش لە ژمارە ( ٢٢)ی گۆڤاری «ڕابوون»دا بڵاوکراوەتەوە.

# دەرگای چواردەری

پێشکەشە بە «نەوال جابر» و «فریال جابر».

ئەرێ ئێوەش وان..؟! ئێوەش کاتێ لە بەر ئاوێنە دەوەستن، لەبەر خۆتانەوە قسە دەکەن..؟! ورێنە دەکەن و شتی سەیر سەیر دەڵێن..؟! من هەندێ جار دەستەکانیشم بەکاردەهێنم.. هەر ئەوەندە دەزانم وا لەگەڵ ئەوەی بەرامبەرم تێکگیراوین و دەستمان لە قژی یەکتر ناوە.. زۆر جار لە خۆم دەپرسم: باشە من بۆچی ئاوا لەو کچە داماوەوەم هەڵپێچاوە و هەمیشە دژایەتیی دەکەم..؟! بۆچی هەر زوو زوو لە شیرینخەودا هەڵدەکوتمە سەری و بە هاوار هاوار ڕایدەپەڕێنم..؟! لە سەر نانخواردن هەڵیدەستێنم و بە جنێو ڕیسوای دەکەم..؟! هەر خۆشم وەڵامی خۆم دەدەمەوە و دەڵێم: خەتای من نییە و هی ئەوە.. ئەو شەڕی بەسەر مندا سەپاندووە.. بەڵام چونکە وەکو من نییە و زۆرزانە.. زۆرزانە و دەزانێت چۆن تووڕەم بکات و قینم هەستێنێت.. دەزانێت چۆن هەر کاتێ خۆی حەزی لە گێچەڵ بێت، سیحرم لێ بکات و وام لێ بکات بەپێی خۆم بچمە بەردەرگاکەی و بە شەق و پێلەقە، بە مست و ئانیشکم تێی بکەوم، بۆیە زۆر جار خۆشم خۆم بە ناهەق و ئەو بە خاوەنهەق دەزانم.. بزانن ئەو کاتانەی خۆی شەڕی نەوێت، من هەر چەند ئەو دەرگایە بکوتم و جنێوی سووک سووکی پێ بدەم.. هەرچەند بیکەم بە قریشکوهووڕ و هاتوهاوار، نایکاتەوە و خۆی لە هوورە نابات.. هەر وەک لەگەڵ ئەویشمدا نەبێت وایە.. ئەم وەکو خۆی بڕیار دەدات، کەی شەڕ بکەین و کەی نەیکەین، هەر خۆیشی شوێنی شەڕ دیاریی دەکات.. هەموو کاتێ ئەو ژوورەی من دەکات بە شەڕگە.. هەر بۆیە هەمیشە ئەو براوەیە و من دۆڕاو.. هەندێ جاریش گاڵتەم پێ دەکات.. دێت لەودیوی ئەو دەرگا شەفافەوە دەوەستێت و من هەرچی دەکەم، ئەویش دەیکاتەوە.. دەستم بەرزدەکەمەوە.. ئەویش بەرزی دەکاتەوە.. مستی پیادا دەکێشم.. ئەویش پیایدا دەکێشێت.. تووڕە دەبم و بە چەپۆک تێی

دەکــەوم.. ئـەویش هـەمـــان شت.. من مـــاندوو دەبم و ســـەرم گــێــژدەخــوات.. هـەناسـەم تـەنگ دەبێت و دەکەوم.. ئەویش دەکەوێت، بەڵام بەدرۆ خۆی دەخات.. گــاڵتــە بە ئەقــڵی ســاکــارم دەکـات.. حــەز و لەزەت لـە دەســتــەپاچـەیی و بێدەستـەلاتییم دەبینێت.. نەشئە و خۆشیی لەوە دەبینێت، کە کچێکی گەورە و تەواوی وەکو من دەرگایەکی ناسک و شەفافی پێ ناشکێت و ناتوانێت جارێ، هەر تاقە جارێک و بەس، دوو پێی بخاتە ئەودیو سنووری ئەوەوە..!!

خـۆ ئەم کـەوتن و زەلیلیـە بەســەرێکیش بۆ خـۆم چاکـە، چونکە تـەنـهـا لەم حـاڵەتەدا گومـانم لەوەدا نامێنێت، کە ئەمـەی بەرامبـەرم، ئەوەی وا ئەو شـەڕە بێوچانەی لـەگەڵدا دەکەم خـوشکمە.. هـەردووکیشمـان کچی ئەو جـووتە حاجی لەقلەقـەین، کـە ســاڵـەهـای ساڵـە سـەر منارە بەرزەکـەی «مـزگـەوتی خـانـەقـا»یان کـردۆتە هێـلانە.. تەنـهـا لـەم حـاڵەتەدا دەتوانم، بەبێ تەنگوچەڵەمـە، ڕابردوو بیـر خـۆم بخـەمـەوە.. دە ئـاخـر هـەر لێرەشـەوە سـەری گرفتـەکە دەردەکـەوێت.. ئەو گرفتـەی، کـە هـەرگیـز باوەڕ ناکـەم لە من زیاتر، کـەسـی تر تووشـی بووبێت.. چ شتێکی سـەیر و سـەمەرەیە..!! تۆ بڵێ چ نەهامـەتی و بەدبەختییـەکی گەورەیە، کــچــێکی تەواو و هۆشــیــاری وەکــو من، باوەڕ بـەو ئەفــســانەیە بهــێنێت و ڕەچەڵەکی خۆی بەرێتـەوە سەر حـاجی لەقلەق..!! مـردن و ئابڕووچوونە بۆ من، ماجستێرم لە فیزیادا هەیە و ئاوا گەوجانەش لە ئاوێنە تێگەیشتووم.. ئێ چی بکـەم خــۆ بەدەست خــۆم نـیـیــە.. چەند هەوڵـم دا وەکــو هـەر کــەســێکی تری ئـاسـایی، لە بەرامـبـەریدا بـوەستم و بەبێ هـیـچ گومـان و دڵەڕاوکێیـەک سـەیری خـۆم بکەم، هەر نەمتوانی... دەتوانم.. دەتوانم وابکەم، بەمـەرجێ بە تەنیـا نەبم و کەسێک، جا ئەو کەسـە هـەر کێ بێت گرنگ نییـە، لەگـەڵمدا بێت.. لە بیرمـە ئەو ئێـوارەیەی ســەردانی «چنار ســەرچناری»یم کـرد، کـە بەتەنـیـا لە گـەرەکی «عەرەب»ی شاری «مووسڵ»دا، ژوورێکی بەکرێ گرتبوو، وتی:

ــ ئەفسـانەکـان بـەرهـەمـی بیـری مـرۆڤـە تەنیـاکـانـن.. من لەم ژوورەدا بیـر لە هـەندێ شت دەکـەمەوە، کە لەمـەوپێش هـەرگیز بەخـەیاڵمدا نەهاتوون.. هـەندێ جــار تـەواو گــومـــان لە بوونـی خــۆم دەکــەم.. چۆنە پێت بڵــێم وا دەزانم دوو ڕابردووی تەواو لەیەکتـر جیاوازم هەیە.. یـەکێکیـان ئەوەی کە تا ئەم مـاوەیەی

پێشـوو، بەبێ هیچ گومـانێک بەهی خۆمم دەزانی و کەسـیش نەیدەتوانی بیکات بەهی خۆی.. دووەمیان ئەوەی کە لەم دواییەدا بۆ خۆمم داهێناوە..؟!

هەر خۆیشی وتی:

ـ من ئێستا تەواو سەراسیمە و ئەبڵەق بووم.. سەر لەوە دەرناکەم، کامیان ئەفسانەیە و کامیان ڕاستی..؟! ئەوەندە دەزانم ئەفسانە فێڵێکی گەوجانەیە لە زەمـەن، بەڵام بەتام و چێـژیشـە.. ئەو تەمـەنە کورتـە بە ئەفـسـانە نـەبێت درێژ نابێتەوە.

باشـە من ئـەو کاتەی ئەو جـووتە حـاجی لەقلەقـەم کرد بـە دایک و باوکم، نە تەنیـابووم و نە هەسـتـیـشم بە کـورتیی تەمـەن دەکـرد.. منداڵێکی چوار پێنج سـاڵان بووم.. ئەو کاتە مـاڵمـان لە قەڵا بـوو.. لە پەنجەرەکەوە سـەیرم دەکردن، کە بەدەنووک کلک و باڵیـان دەخوراند، یان زاخیـان دەدایە پێچووەکـانیان.. من زیاتریش سەرنجم لە بێچووەکانیان دەدا.. چاوەڕێی ئەوەم دەکرد هەراش بن و شـەڕەکـە دەست پێـبکات.. ئـەو شـەڕەی، کە بـەمـردنی هەردووکـیـان کـۆتایی دەهـات.. ئێسـتاش نازانم من لە خەڵکم بیستبوو، یان خۆم دامـهێنا بوو، کە ئەو جـووتە حـاجی لەقلەقـە، هەمـوو بەهـارێک، کە دەگـەڕێنەوە سـەر ئەو هێلانەیان، دوو هێلکە دەکەن.. سـاڵێک جـووتێ نێـر و سـاڵی دواتر جـووتێ مێ سـەریان تیادا دەجـووقێت.. تا بچووکن، ڕێک و تەبان، بەڵام کـاتێ کەمێ هەراش دەبن و بۆیـان دەردەکـەوێت، هـەردووکـیـان سـەر بە یەک توخـمـن، دەیکەن بە شــەڕ.. هەریـەکـەیان هـەوڵدەدات ئەویـتـریان هـەڵداتە خــوارەوە.. ســەیرەکـە لـەوە دایە هەردووکـیـان، بەقـەدەر یەک هێـز و توانایان هـەیە، بۆیە شـەڕ بێـهـوودە درێژە دەخایەنێت، بەبـێ ئەوەی یەکیان ئەویتریان بخاتە خـوارەوە.. ئا لێرەدا دایکە و باوکە کۆتایی بە شەڕەکە دەهێنن.. چۆن..؟! ئەو سـاڵانەی هـەر دووکیـان نێرن، باوکەکە و ئەو سـاڵانەی هـەر دووکیشیـان مێن، دایکەکە دەیانخاتە خـوارەوە و دەیانکوژێت.. خـۆ من نـاهەقـیـشم نـەبوو ئاوا بیـرم دەکـردەوە، چونکـە ئەگـەر وانەبووایە، ئێسـتـا نەک «هەولێـر»، بگرە ئەم وڵاتە سـەرتاپای دەبووە حـاجی لەقلەق.. ئەوسا سـەر منارەی هـەر مزگەوتێک، جووتێ حـاجی لەقلەق هێلانەیان لەســەر دەکرد.. سـەر ئاڵێـری تەلەڤـزیۆن و کەپری مێـوی هەر مـاڵێک، دەیان

حاجی لەقلەقیان لەسەر هەڵدەنیشت.. تۆ لێکیبدەرەوە ئەوە سەدانساڵەو هەر ساڵەی دوو هێلکە دەکەن، کەچی هەر خۆیان جووتە حاجی لەقلەقی ئەم شارەن.. باشە ئەوە چۆن بێزار نابن..؟! چۆن لە هێلکە ناچنەوە..؟! چۆن واز لەیەکتر ناهێنن و هەر یەکەیان ناچێت تاکێکی تر بۆ خۆی پەیداکات..؟! جا لە کوێی پەیدا کەن..؟! مەگەر بچن لە هەندەران بیهێنن.. دووریش نییە هەر لەم شارە وابن و لەو شوێنانەی، کە وەرزەکانی تر کۆچی بۆ دەکەن و هێلانەی لێ دادەنێن، نەوەی زۆریان خستبێتەوە.. ڕەنگە لەوێ ئەوەندەیان بێچوو هەڵهێنابێت، هەرچی «مار» و «دووپشک» هەیە هەڵیانلووشیبێت.. هەندێ جار وای بۆ دەچم، کە ئاووهەوای ئەم شارە لەو دووانە زیاتری پێ ناکەوێت.. من تا لەوێ بووم و هاوڕێی نزیکی «چنار سەرچناری» بووم، نەمکرد پرسیاری لێ بکەم.. ئەم شارەزاییەکی زۆر سەیری لە ژیانی باڵندە و ئاژەڵەکاندا هەبوو.. لە بیرمە جارێکیان، کە چووم بۆ لای لە «سەرچنار» و کاهووی دەدایە کەروێشکەکانی، وتی:

ــ کەروێشک زوو زوو زاووزێ دەکەن تاژان.. دەڵێیت چی جووتێکت بۆ دابنێم، لەگەڵ خۆتیان بەریتەوە..؟!

ــ من تاقەتی بەخێوکردنی هیچ باڵندە و ئاژەڵێکم نییە.

ــ ئاخر ڕۆڵە تاقییت نەکردۆتەوە.

ــ ناشمەوێت تاقیی بکەمەوە.

ــ سەیرە..!! تۆ حەزت لە خوێندنەوەیە و ڕقت لە بەخێوکردنی باڵندە و ئاژەڵە.. من ئەوەندەی لەوانەوە فێربووم، لە کتێبەکانەوە فێری نەبووم.

ــ چییە ئەو فشەیە..؟! ئادەی بزانم چییان لێوە فێربوویت..!!

ــ هەر ئاوا بەئاسانی ناکرێت پێت بڵێم چییان لێوە فێربووم، بەڵام زۆر مناڵ بووم هەستم بە جیاوازیی ئەوان و خۆمان کرد.

ــ بەخوا شتێکی گرنگ فێربوویت..!! ئەوە تۆ چییت..؟! تا ئێستا نەمزانی بوو «داروین» کچی ناو «چنار»ی هەیە.

ــ گاڵتەت لێ دێت کچەتیوە ڕشکنە..؟! من مەبەستم ئەو جیاوازییە نییە، کە تۆی هێناوەتە پێکەنین.. مەبەستم جیاوازیی نێوان خەسڵەتیانە.. من لەوساوە

بۆم دەرکەوتووە، کە پەیوەندیی ئەوان بە شەڕ دەستپێدەکات و بە ئاشتی کۆتایی دێت، بەڵام هی ئێمە بەپێچەوانەوە، بە ئاشتی دەستپێدەکات و بە شەڕ کۆتیایی پێدێت.

ــ هم..!! ئەوە چۆن توانیت ئەو نهێنییە گەورەیە بدۆزیتەوە..؟! ئادەی بۆم ڕوونکەرەوە.

ــ تۆ بەگاڵتە وام پێ دەڵێیت، بەڵام من بەڕاستی بۆت ڕووندەکەمەوە.. سەیری ئەم کەڵەشێرە بکە لەناو ئەو کۆمەڵە مریشکە.. ئەگەر کەڵەشێری ماڵی دراوسێکەمانی بۆ بهێنم، بەبێ ئەملا و ئەولا دەیکەن بەشەڕ.. ئەوەندە دەندووک بە پۆپنە و سەروگوێلاکی یەکدا دەکێشن، تا تەواو شەکەت و ماندوو دەبن.. ئەنجام یەکێکیان دەبەزێت.. دوای ئەوە بەماوەیەک ڕادێن و براوە و دۆڕاو ئەوەندەی یەک هەقیان هەیە بەسەر مریشکەکاندا بتسن.. خاوەنی کەڵەشێرەکە وەکو باوکم پیاوێکی کەللەڕەقە.. کە یەکەمجار هاتینە ئەم خانووەوە، زۆر بەگەرمییەوە بەخێرهاتنی کردین.. هەر خێرا بانگهێشتی ماڵی خۆیانی کردین و نان و چێشتێکی چاکی دەرخوارد داین، کەچی ئەوەندەی پێنەچوو لەگەڵ باوکم کردیان بەشەڕ و یەکتریان کەللەپاچە کرد.. ئێستا بەدەستیان بێت خوێنی یەکتر فڕدەکەن.

دەکرا هەر ئەو کاتە، بەبێ ئەوەی هەست بەهیچ شتێ بکات، سووک و ئاسان، پرسیاری ئەو جووتە حاجی لەقلەقەی لێ بکەم، بەڵام نەمکرد.. من هەر لە خۆمەوە وامدەزانی ئەگەر باسی بکەم، خەڵک بەو نهێنییەی دڵم دەزانن، کە لەوەتەی هەم دەمەوێت بیشارمەوە و لە بنی بنەوەی حەشاردەم.. وامدەزانی هەرچی خەڵک هەن لەو شارە بە چیرۆکی کەوتنەخوارەوەی خۆم و خوشکەکەم دەزانن، بەتایبەتی دراوسێ کۆنەکانمان.. هەرکە دەمدین، شەرم دایدەگرتم.. شەرمێک، کە تەواو پڕزەی لەبەر دەبرییم و زمانی لاڵ و چاوی شۆڕ دەکردم.. هەر چییان پێ دەوتم، لە لای خۆمەوە لێکم دەدانەوەو ورد ورد شییم دەکردنەوە.. جارێ خۆ ئەو «ئایشەی مامان»ـە، کە دەمدی، تەواو ئەژنۆم دەشکا.. بۆ نەگبەتییش زوو زوو لووتم دەتەقی بەلووتییەوە.. هەر دەتوت هەموو ئیش و کارێکی خۆی بەلاوەناوە و بە دوای منەوەیە، تا بزانێت چی دەکەم و بۆ

کوێ دەچم..؟! هەموو جارێکیش خۆم لێی گێلدەکرد، گوایە نەمدیوە، کەچی ئەم وەکو مۆتەکە دەهات، دەستی دەخستە سەر شانمەوە و توند دەیکردمە باوەش.. بەگەرمی ئەملا و ئەولای ماچ دەکردم.. نازانم بە گاڵتەی بوو، یان بەڕاست پێی دەوتم:

ــ قەحپەدایک.. هەموو کەسێکت لەبیر بچێتەوە، نابێت منت بیر بچێتەوە.. بەم دەستانەم ناوکم بڕیویت.

ئینجا لە بەژن و باڵام ڕادەما و دەیوت:

ــ بێچاوێنی بێت خوایە.. کێ دەیوت ئەو شەمشەکوێرەی لە ناو هەردوو لەپم جێگای دەبۆوە، دەبێت بەم شازادەیە..!!

دواجاریش، کە بەجێی دەهێشتم، پێی دەوتم:

ــ مەترسە چاوم پیس نییە.. دایک چاوپیسیش بێت، کچی خۆی ناکات بەچاوەوە.. کچی خۆم بوویت، بەڵام داخەکەم «نازە لەقلەق» دەستی بەسەرداگرتیت.

هەر دەتوت ئەم چەند قسەیەی لەبەرکردووە، بۆئەوەی هەر کاتێ بمبینێت، پێمی بڵێت.. ئەم تاکە کەس بوو بە دایکمی دەوت «نازە لەقلەق».. نیو سەدەیە هەر منداڵێ لەو قەڵایە دوو چاوی کردبێتەوە، ئەم ناوکی بڕیوە، بۆیە لە هەموو کەسێ چاکتر لە ڕەگەز و بنەچەی من دەگەیشت.. بەخۆڕایی نەبوو ئەو ناتۆرەیەی دوای دایکم خستبوو.. ئەو قسە بەتوێکڵانەی بەبێ مەبەست پێ نەدەوتم.. دوورنییە ئەو پیاوە جادووگەرەی، گوایە لە هەوادا ئێمەی قۆزتۆتەوە و نەیهێشتووە سنگمان بکەوێتە سەر کۆنکرێتە ڕەقەکەی حەوشی مزگەوت و بمرین، مێردی ئەو بووبێت.. کێ چووزانێت..!! ئەوە چ دەستێکی شووم بوو، نەیهێشت ئەو گیانە پیس و بۆگەنەمان لە حەوشی ئەو مزگەوتە، لەژێر نەعل و قاپقاپی نوێژکەراندا بپلیشێتەوە..؟! چ دەستێک بوو ئەو دەستە، ئاوا دڵڕەقانە تووڕی هەڵدایـنە ئەم دنیا پڕ لە کارەساتەوە..؟! سەراسیمە و ئەبڵەق، دڵ سیخناخ لە گومان و سەر پڕ لە پرسیاری هیچ و بێمانا، هەڵەتەی ئەم کێشوەرە نامۆیەی کردین.. باشە ئەوە من بۆچی بە ناوی هەردووکمانەوە قسە دەکەم..؟! بۆچی ئەو خوشکەمم هێناوەتە ڕیزی خۆم..؟! ئەم ئاسوودە و

سـەرفـراز، من زەلیل و دڵ پڕ لە حـەسـرەت.. ئەم سـەربـەرز و چاوكـراوە، من شـەرمن و چاوبەرەوژێر.. ئەم سـەربـەست و ئازاد، من كـۆیلە و دەسـتـەپاچە.. چی بەیەكـەوەمـان دەبەسـتـێـتـەوە..؟! ئێمـە هەریەكەمـان جیـهـانێكی جیـا لە یەكترمان هەیە.. جیهانی من پڕ لە خەم و هی ئەو پڕ لە بەختیاری.. جیهانی من ڕژد و پیسكە و دەستقوچاو لە ئاست تەمەن، هی ئەو بێ سنوور لە ژیان.. من تەنها خاوەن جیهانی خۆم، ئەم خاوەنی هەردووكیان.. خاوەن جیهانی من و هی خـۆی.. ئەوە چەند سـاڵە من لە هەوڵی ئەوەدام، تاقـە جـارێ دوو پێم بخـەمە ئـەودیو سنووری ئەوەوە و ناتوانم، كـەچی ئەم سـەربەسـتانە، هەر كاتێ بیەوێت و ئارەزوو بكات، دەرگا دەكاتەوە و دێتە دەرەوە.. بە بەردەممدا دەڕوات و هەر سـەیریشم ناكات.. وەك بڵـێیت نەزانێت، یاخـوود نەیەوێت بزانێت، كە منیش هەم و خـوشكی ئەویشم.. دەرگـای حـەوشـە دەكـاتەوە و دێتـە دەرێ.. لە منیش زیاتر كەس نایبینێت.. دەیان جار دیومـە بـە بەردەمی دایك و باوكمدا ڕۆیشـتووە و هەر هەسـتیشـیان پێی نـەكردووە.. كێ دەڵێت هـەسـتیـشی پێ ناكەن..؟! بەڵێ، ئەوان لە هەمـوو كەس چاكتر دەیناسن و ئاگای تەواویان لە بنجـوبنەوانی مـەسـەلەكەیە.. ئەگەر ئـەویش نەبینن، خـۆ ئەو كـوڕە باڵابەرز و چوارشـانانە دەبینن، كـە هەر ڕۆژێ قـۆڵ دەكـات بەقـۆڵی یەكـێكیـاندا و بە بەر چاوی ئـەوان و بەناو ژوورەكـەی مندا دەیانهـێنێت و بەرەو ژوورەكـەی، بڵـێم جیهانەكەی خۆی بكێشیان دەكات.. هەندێ جار لەودیوی ئەو دەرگا ئاوییەوە و لە بەرچاوی من یەكتر لە باوەش دەكەن.. بەبێ ئەوەی شـەرمم لێ بكەن، یان وابزانن هـەم، تێـر تێـر یەكـتـر ڕادەمـووسـن و دەم و لا مل و گـەردنی یـەكـتـر دەلسـنەوە.. دوایی بەئێـجگاری لە بـەرچاوم ونـدەبن.. باشـە ئـەوە چیـیـان لێـدەكـات..؟! زۆر سـەیرە خـۆ هـەر كێ چووبێت بۆ ئەوێ، نـەهاتۆتـەوە..!! ئا ئەمـەشـە ئێـجگار وای لێ كـردووم، ئەوەندە بە پەرۆشی گەیشتن بەودیوبم.. تا بزانم ئەو هـەمـوو كـوڕە قـۆزە چیـیـان بەسـەرهـاتووە..؟! ئایـا زیندەبەچاڵیـان دەكـات، یان ئاوی نەمـرییـان بـە دەمـەوەدەكات..؟! ئاخـۆ ئەودیوی كـردووە بە گـۆڕسـتـان، یان بەهەشـتی ڕاسـتـەقینـەی بۆ دابین كـردوون..؟! بۆئەوەی هـەر بەمەزەندە و بۆچوونی خۆم لێكیبدەمـەوە، دەبێت و پێویستیشـە، زۆر پرسـیاری

تر هەن لە خۆمیان بکەم.. ئاخر هەر زۆری و تێکچڕژانی ئەو پرسیارانەشە، ئاوا ئێـجگار لە ئاسـتی هێنانەبەرچاوی ئەو دنیـا سـەیر و سـەمـەرەیە دەستـەوستـانیان کـردووم.. با ئەمـجـارە زۆر بەشـێنەیی و یەکـە بـە یەکـە پرسیارەکان لە خۆم بکەم و زۆریش بەهێمنی و بەکاوەخۆ وەڵامیان بدەمەوە.. دەی چاکە با دەست پێ بکەم: ئەو کوڕانە کێن..؟! نازانم.. خەڵکی شارەکەی ئێـمەن..؟! نازانم.. باشـە بۆچی هەر ڕۆژەی یەکێکیان دەهێنێت..؟! نازانم.. بۆچی هـەر کوڕ دەهـێنێت و جـارێ نەمـدیوە کـچێ لەگـەڵ خـۆیدا بـهێنێت..؟! نازانم.. ئایا لە جـیـهـانەکـەی ئەودا تـەنـها کچ هەیە و ئـەو کـوڕانە بـۆ ئەوان دەبات..؟! نازانم... دە ئاخر ئەوە نابێت.. خۆ نابێت من هەر پسیار لە خۆم بکەم و نەشزانم وەڵامی بدەمەوە.. کـەوابێت هیـچمـان دەسگیر نەبوو.. تاکە شتێ، کە پێی بگەم هەر ئەوەیە، ئەم کارەی ئەم و هی جووتە حاجی لەقلەقەکە زۆر لەیەکتر دەچن.. ئیتر هیچ گومانی تیادا نەماوە ئێمە کچی ئەوانین.. ئای لە بەدبەختی و کـڵـۆڵیی خـۆم..!! ئای لەمنی دەسـخـەڕۆ و دڵهـەڵقـرچاو و داغان..!! نازانم گلەیی لە کێ بکەم و تف و جنێو و نەفرەت بۆ کێ بنێرم..!! بۆ دایک و باوکم، یان بۆ ئەو پیاوە جادووگەرەی نەیهێشت سـەری کرماوییم لە ژێر قاپقاپی ئەو پیاوە نوێژکەر و نوورانیانەدا بپلیشێتەوە و گیانی بۆگەن و عەمارەپۆم ئاوی ئاموون و توونی باباچێت....؟! ئەوە من لەناو کام دەستیان بووم و ئەویتر لە کامیان، کە «هەلەق مەلەق»ی پێ کردین و من دۆزەخ و ئەم بەهەشتی بەرکەوت.. من دەبووایە زووتر هەستم بکردایە و بمزانیایە بێچووی زۆڵی حـاجی لەقلەقم.. دەبووایە زوو خـۆم زیندەبەچاڵ بکردایە.. دەمـزانی و چاکم دەزانی، بەڵام دایک و باوکم سـەریان لێ شـێـواندم.. ئەوان زەلیل و دەسـخـەڕۆیان کـردم.. نـەیانـهێـشت تەواو بـۆم دەرکـەوێت و دوابڕیاری خـۆم بدەم.. ئەوە چییە من تا ئێستاش ئەوان بە دایک و باوکی خۆم دەزانم..؟! ئیتر با بەسـبـێت چەواشـەیی.. تاکـەی هەر بە دایکە و باوکـە بانگیان بکەم..؟! ئەوانیش دوو جادووگەرن وەکو جادووگەرەکەی تر.. ئەوانیش دەستیان هەیە لەو تاوانەی دەرهەقم کـراوە.. با وەلبن ئەو دوو درۆزن و دووڕووەی سی سـاڵ زیاترە هەڵمدەخەڵەتێن و بە تاقـانەی خۆیانم دەزانن.. ئیـتر تەواو ناتوانن

چییتر ڕووی ڕاستەقیینەی خۆیانم لێ بشارنەوە.. ئەو وەجاخکوێر و نەزۆکانە، چەند ساڵە درۆم لەگەڵدا دەکەن و خۆیان لێ کردووم بە دایک و باوک.. ئەگەر ڕاستیان دەکرد با لە دوای من، منداڵێکی تریان بووبوایە.. نا.. نا.. مەسەلەکە وەکو ڕۆژی ڕووناک دیارە.. دیارە، بەڵام چییم لە دەستدێت..!! تازە دەتوانم چی بکەم..!! هەرچییش بکەم، بێ سوودە.. ئێستا ڕاستی و درووستیی بۆچوونەکانی «چنار سەرچناری»م بۆ دەرکەوت.. ئەوا بۆم دەرکەوت، کە منیش دوو ڕابردووی تەواو لە یەکتر جیاوازم هەیە.. ئەم نەیدەزانی ڕابردووی ئەفسانە لە هی ڕاستەقینە جیابکاتەوە، بەڵام من زۆر چاک دەیزانم.. من کاتێ ئاوڕ لە ڕابردووم دەدەمەوە، هەر دڵم بەو کاتانە خۆشە، کە کوڕان نەیاندەتوانی بمخەڵەتێنن.. تاکە مەسەلەیەک کە تیایدا کۆڵەوار نەبووم و شارەزا و لێهاتوو بووم، هەر ئەوەبوو.. هونەریش هی خۆم نەبوو، بەڵکو هی ئەو گومانە بوو، کە کونەپەپووئاسا، کەلاوەی سەری کردبووم بە هێلانە.. ئەو گومانەی دەیترساندم و لەرزی دەخستە دڵمەوە.. مووچرکی بەهەموو گیانمدا دەهێنا.. ترسی جووتبوونی حاجی لەقلەق و مرۆڤ.. ترسی جووتبوونی دوو ڕەگەزی جیاواز.. هی دوو ئاژەڵی لەیەکنەچوو.. لە خۆی دەترسام، یان لە ئەنجامەکەی..؟! لە هەردووکیان.. ئەو ترس و گومانە نەبووایە، ئێستا دەمێک بوو چاوم لەم دنیایە ئاوا بووبوو.. خۆ بەسەرێ ئەو سەرچڵییەم بکردایە باشتر بوو.. هیچ نەبوایە زووتر بۆ من و بۆ خەڵکیش دەردەکەوت، کە بێچووی زۆڵی حاجی لەقلەقم.. بڵێ بۆ وام نەکرد..؟! هەر هیچ نەبووایە گیانەوەرێکی دیکەی تازە دەخوڵقا.. ئاخۆ چ مەخلووقێکی سەیر و سەمەرە لە ئەنجامی جووتبوونی مرۆڤ و حاجی لەقلەق بکەوێتەوە..!! ئەوەندە دەزانم ئەگەر توخم و ڕەگەزی حاجی لەقلەق لە مرۆڤدا بەرجەستە بێت، نموونەیەکی زۆر جوان دێتە کایەوە.. ئەوەتا من لە هەموو کچی سەرتاسەری ئەم جیهانە جوانترم.. من بە دەمی خۆم نەڵێم زۆر جوانم، بەڵام ئاسوودە و سەرفراز نییم.. ئەگەر جوان نەبوومایە ئەو هەموو کوڕە دوام نەدەکەوتن.. بزەیەکم، چاونووقانێکم، پەرچەم لادانێکم لەسەر چاوە دڵڕفێنەکانم، کرۆشتنی لێوی سوورم، بەس بوو بۆ قۆزترین کوڕ، تا حەیران و سەراسیمە لە بەرپێم بکەوێت و شەو لە ناوجێدا

تلاوتل بکات.. من هەقیش نییە شانازیی بەوەوە بکەم، کە کوڕان شێت و شەیدام بوون، چونکە ڕوون نییە لەبەرچی لە هەر کچێکی دیکە زیاتر، ڕەزامەندیی منیان گەرەک بوو.. بۆچی ڕوون نییە..؟! ئەگەر ئەوسا گومانم هەبوو، ئەوا ئێستا تەواو بۆم دەرکەوتووە، کە چ مەبەستێکیان هەبوو.. من کاتێ ئاوا ئەو ڕۆژگارەم بیردەکەوێتە، بەدەست خۆم نییە پێکەنین دەمگرێت.. بزانە چەند چاوم قایمە.. لە گەرمەی کارەساتەکان، لە پەنا دیواری ماڵی مەرگ، کە هەندێ ڕووداوی بەسەرچووی ژیانی خۆمم بیردەکەوێتەوە، قاقا لێ دەدەم.. ئەوەتا وا بەو هەموو سیرە پێدەکەنم، کە ئەو چەند ساڵە بۆ دوورکەوتنەوە لە کوڕان دەرخواردی خۆمم دەدا.. باشە من ئەو فێڵەم چۆن دۆزییەوە..؟! کێ فێری کردم..؟! لە کونجی لاپەڕەکانی کامە کتێبدا خوێندبوومەوە..؟! باوەڕ ناکەم هیچ کەسێ لەپێش منەوە ڕێی بە شێوازی ئاوا بردبێت.. سەیرەکە لەوەدایە، من هەر لە منداڵییەوە ڕقم لە سیر بوو.. هەرکە دەمدی، یان بۆنەکەی دەهات بەلووتمەوە، قێزم دەکردەوە.. دڵم تێکهەڵدەهات و دەڕشامەوە.. ئێستاش لەبیرمە هەر جارێ «ست شیرین»، دەهاتە پۆلەوە و بۆنی سیر بڵاودەبۆوە، من هێڵنجم دەهاتێ و دەڕشامەوە.. بۆ نەگبەتییش لە پێشی پێشەوە دادەنیشتم.. ئەو کاتە پۆلی «چوار»ی سەرەتایی بووم.. ئیتر وای لێ هات هەر جارێ وانەی ئەومان هەبوایە، نەدەچوومە ژوورەوە.. ئەو ساڵە هەر لەبەر بۆنی ناخۆشی سیر و لە ترسی ڕشانەوە، نەمدەتوانی لە وانەی «جۆگرافیای عێراق و وڵاتانی دراوسێ»دا ئامادە بم.. ئەوەبوو نیوەی ساڵ و سەری ساڵ و خولی دووەمیش هەر دەرنەچووم.. ڕەنگە ئەمەش پەیوەندیی بە سرووشتی حاجی لەقلەقەوە هەبێت.. حاجی لەقلەق مار دەخوات و ماریش ڕقی لەسیرە.. بەڵێ، ئەمە شتێک بوو پەیوەندیی بە سرووشتی خۆمەوە هەبوو، لە هیچ کەسێکی ترەوە فێری نەبووبووم.. ئەوەندە هەیە زۆر دەمێکە دەزانم «یۆنانی»یە کۆنەکان، بۆ چارەسەرکردنی هەموو نەخۆشییەک سیریان وەکو دەرمان بەکاردەهێنا.. من تەنها بۆ ئەو نەخۆشییە، وا چاکترە بڵێم بۆ ئەو حاڵەتە بەکارمدەهێنا، کە لەپڕ بۆم دەهات.. لە ناو بازاڕ، لەسەر شەقامە گشتییەکان، لە پۆل، لە ژوور، لە بەرچاوی دایک و باوک و مامۆستا و

دراوسێکان، بۆم دەهات و بەتوندی یەخەی دەگرتم.. خۆ سیرەکە هیچی لەو حەز و ئاڵۆشییەم کەم نەدەکردەوە، بگرە زیاتری دەکرد، بەڵام شەرمێکی پێ دەبەخشیم.. شەرمێک، کە تەواو جیابوو لە شەرمەکانی تر.. هەموو کچێک ئەوەی بەلاوە چاکترە بەتەنیا لە ژوورەکەی گۆشەگیر دانیشێت، نەک بە دەمی بۆگەنەوە لە کوڕ نزیک بکەوێتەوە.. خۆخواردنەوە و لێوکرۆشتن و سەرکێشان بە دیواری ژووری چۆڵدا، باشترە لەوەی ناوت بزڕێت.. ئەمە باشتر بوو لەوەی رووی ڕاستەقینە و سرووشتی حاجی لەقلەقانەمیان بۆ دەربکەوتایە.. لە بیرمە «چنارسەرچناری» هەموو جارێ دەیوت:

ــ هەموو ڕووداوێک دوو ڕووی هەیە.. یەکەمیان ئەوەی ڕوودەدات، دووەمیان ئەوەی لەپێناویدا ڕوودەدات.. بۆ نموونە باوکم هەر کاتێ تەنگوچەڵەمەیەکی لەگەڵ کەسانێکدا هەیە، کە دەرەقەتیان نایەت، خەفەت دایدەگرێت.. بۆ ئەوەی ئەو خەفەتە گەورەیە بە یەکێکی بچووکتر بگۆڕێتەوە، بیانوو بە دایکم دەگرێت و دەکەوێتە وێزەی.. ئەوەندە دڵڕەقانە تێیهەڵدەدات، تا هەموو گیانی شین و مۆر هەڵدەگەڕێت.. ئیتر دوای ئەوە تا بەیانی بەسەر دەست و قاچییدا دەکەوێت.. بۆی دەگریت و دەکڕووزێتەوە.. دایکم سەرەتا دڵی دەڕەنجا و تەواو نیگەران دەبوو، بەڵام دوایی کە تێگەیشت، لای بوو بە شتێکی ئاسایی.. ڕەنگە ئەمیش بەم ئازارچەشتنە، ئازارێکی لەوە گەورەتر بیر خۆی بەرێتەوە.. بەم جۆرە هەر کەسەو لە یەک کاتدا خۆی لەگەڵ ئازاری ئەوانەی لە خۆی بەدەستەڵاتترن ڕادەهێنێت و ئەوانەش لەگەڵ ئازاردانی خۆیدا ڕادەهێنێت، کە دەستەڵاتی بەسەریاندا دەشکێت.. ئازارگەیاندن و ئازارچەشتنە ئێمەی لە دەوری یەکتردا کۆکردۆتەوە.. من وای بۆ دەچم هەموو کەسێکیش بۆ خۆدزینەوە لە تەنگوچەڵەمەیەکی گەورە، دەست بە یەکێکی بچووکترەوە دەگرێت.. ئەمەش شتێکی خۆڕسکانەیە و کەم و زۆر تواناو وزەی گەرەک نییە.

ئەو ڕاستی دەکرد، من لەگەڵ هەر دەنکێ سیر، کە دەمخستە دەممەوە، مردنم بەچاوی خۆم دەدی، کەچی ئەوەم بەلاوە چاکتربوو لەوەی بەم بۆنبۆگەنەوە بچمە ناو خەڵک.. هەمیشە جانتاکەی شانم، بێجگە لە قوتووی ماکیاج و بۆیەی نینۆک، سەرکێ سیریشی تیابوو.. ڕۆژێکیان، کە لەگەڵ

«چرۆ» و «هاژە»ی هاوژوورم، لە دووکانێکی بەردەم زانکۆدا پرتەقاڵمان دەکڕی، جانتاکەم کردەوە، تا پارەی تیادا دەربهێنم، بۆ سەرکێ سیر بەدەستمەوە نەهات و نەکەوتە بەردەمیان..؟! من ڕەنگم هەڵبزڕکا و شڵەژام، ئەوانیش ئەبڵەق بوون.. بەبێ ئەوەی پرسیارم لێ بکەن، لاڵوپتانە وتم:

ـ ئەوە دکتۆر بۆی نووسیوم.

«هاژە» باوەڕی پێ کردم، بەڵام «چرۆ» هی ئەوە نەبوو فێڵی لێ بکرێت.. بەگاڵتەیەکی زۆر سەیر وتی:

ـ وای لێ هاتووە بۆ هەرچی بچیت بۆ لای دکتۆر، پێت دەڵێت سیر بخۆ.

دواییش وتی:

ـ دەموت خوایە ئەو بۆنی سیرە چییە هەمیشە لەم ژوورە دێت..!!

کچی وا زۆرزانم نەدیبوو.. شارەزاییەکی سەیری لە خوێندنەوەی دەموچاو و ناخی خەڵکدا هەبوو.. بۆ نەگبەتییش لە ژوورەکەی منیان دانابوو.. هەر تەنها بینینی ئەو سەرکەسیرە و کەوتنەخوارەوەی و ئەو شڵەژانەم، بەس بوو، تا لە بنجوبنەوانی مەسەلەکە بگات.. ئێوارەیەکیان کە هاتە ژوورەوە، بۆنی دەمی کردم.. ئینجا چاوە پڕ لە مەکرەکانی بڕییە چاومەوە.. ئەو چاوانەی کە تەنها یەک دوو تروکانیان بەس بوو، تا لە بەر دەمیاندا، قوتابیی گوێڕایەڵ و گوێبادراوئاسا، ڕێک بوەستم و بۆ ئەوانی مامۆستای بەڕێز، هەر هەمووی بە ترس و لەرزەوە بڵێمەوە.. چەند بەدڵنیاییەوە لێی پرسییم:

ـ ئەمڕۆ نۆرەی کێیە چاوەڕێت بکات و دواییش بەدڵساردی بەرەو ماڵ بگەڕێتەوە..؟!

ـ تێناگەم دەڵێیت چی..!!

ـ دەتوانی بە جوانییەکەت هەموو کوڕانی ئەم شارە لە خشتەبەریت، بەڵام ناتوانیت بەو هەموو فێڵەی هەتە، تاقە جارێک من بخەڵەتێنیت.

من کوڕانم لە خشتە نەدەبرد.. کاتێ بەڵێنم دەدانێ و جێژوانم دیاریی دەکرد، لە هەمووو دڵێکمەوە دەمویست بچم، بەڵام ترس و گومان نەیاندەهێشت.. خۆ من بەو کارەی دەمکرد، تەواو ناویشم زڕا.. خۆم تەواو سووک و ڕیسوا کرد.. دەیان چیرۆکی سەیر و سەمەرەیان بۆ خوڵقاندم..

ناهەقیشیان نەبوو.. کورِ نەما لەم زانکۆیە، لە هەرە ناشیرینیەوە بیگرە تا هەرە قۆزیان، گفتم نەدابێتێ و دواییش نەمدەبردە سەر.. ئەوان لە نهێنیی مەسەلەکەیان نەدەزانی.. چەندیش خۆیان ماندووبکردایە، هەر نەیاندەزانی.. نەیاندەزانی چ پەیوەندییەک لە نێوان چاوەڕێکردنی ئەوان و سیرخواردنی مندا هەیە.. نەیاندەزانی چ پەیوەندییەکی سەیر و سەمەرە لە نێوان پیاسەی کورت کورت و زوو زوو لە کاتژمێرڕامان و بەهەر چوارلادا ڕوانینی لە سەریەکی ئەوان و پیشخواردنەوە و لەسەرپشت ڕاکشان و هەستانەوە و لەسەردەمکەوتن و قیتبوونەوە و سەرگۆی مەمکگوشین بە پەنجەکان بەسووکی و ناڵە ناڵی مندا هەیە.. کێ دەڵێت نەشیاندەزانی..!! کێ ناڵێت ئەو کچەتیوە دەمشرە هەموو شتێکی بۆ باس نەدەکردن.. کێ..؟! «چرۆ»..؟! ئا.. ئا.. ئەو.. بەڵێ، ڕۆژ بە ڕۆژ هەرچی دەبینی و دەبیست، چوار ئەوەندەشی دەخستەسەر و بەو زمانە بڵحەی بۆی دەگێڕانەوە.. بەخۆڕایی نەبوو هەمیشە چوار و پێنج دەوریاندابوو.. ئەو قاقالێدان و تریقانەوەیان هەر لەبەر ئەوەبوو.. ئای کە مەکرباز و جانانە بوو..!! ئەوەندەی توانا و بەهرەی لە دەرخستنی ناخی بنیادەمدا هەبوو، چوار ئەوەندەش لە گێڕانەوەی بەسەرهات.. هەندێ جار بەبێ ئەوەی زمانیشی بخاتە کار، هەر بە جووڵاندنی لەناکاوی پەنجەکانی، هەڵتەکاندنی ئێجگار سەیری برۆکانی، داخستن و کردنەوەی جار جار سووک و جار جار قورسی پێڵووەکانی، بزواندنی عەیارانەی شانەکانی، کۆمەڵێ شتی دەدرکاند و وێنەی ئەکتەرێکی تەواو شارەزا و لێهاتووی شانۆی «پانتۆمایم»، لە کۆمەڵێ قسە و باس حاڵیی دەکردین.. زۆر جار لەناو پۆل و لە بەرچاوی دکتۆر و مامۆستاکان، بەبێ ئەوەی دەمی بکاتەوە و زمانی هەڵبێنێتەوە، دەیان شتی پێ دەوتین.. من خەتای خۆشم بوو، دانم بە هەموو شتێکدا نا و وردەچەوی ناخی خۆمم پیشان دا.. جا بەدەست خۆم بوو دانی پیادا بنێم، یان نەینێم..؟! خۆ ئەم پێش ئەوەی لە دەمی منیشەوە ببیستێت، خۆی بە هەموو شتێ گەیشتبوو.. بۆ هەر قسە و هەڵسوکەوتێکم، لێکدانەوەی ڕاست و درووستی کردبوو.. هەر ڕێک و ڕەوان پێی وتم:

ــ باوەڕدەکەیت من زۆر دەمێک بوو هەستم بە هەموو شتێ کردبوو، بەڵام

خـۆم لێکردبوویت بە کـەڕەی شـەربـەت و نەمـدەویسـت وا خـۆم پیـشـاندەم، کـە ئاگام لێتە چی دەکەیت و چی ناکەیت.. دەشمویست بزانم دەیگەینیە کوێ..!!

ئەڵبـەتە ئەم مـەبـەسـتـی سـیرخـواردنەکە بوو، ئەگینا کێ هـەبوو بێوەفـایی و بێمروەتی منی نەبیستبێت.. دەیان بەندی جۆراوجۆریان بۆ ڕێکخستبووم و لە گـەشت و بۆنـەکـاندا، یەکـدەنگ و یەکـئـاهـەنـگ دەیانوتنەوە.. بـۆ نەگـبـەتیـیش ناوەکەم بۆ کێش و سەروا زۆر خۆشدەسـتە.. هـەر وشـەیەک کۆتایی بە ئەلف و نوون بهاتیایە، خێرا دەیانهێنا و لەگەڵیاندا ڕێک دەخست.. دەیان وشـەی وەکو «نان» و «گـان» و «ڕان» و «دان» و «ژان»یان لەگـەڵ «تاژان»دا کردبووە سـەروا.. دەیان شـیـعری «فـەل»یان لەسـەر هـەڵبـەسـتـم.. هەمـوویشـی هـەر تەعبـیـری لە بێوەفایی من دەکرد.. وەک بڵێیت شیعر و گۆرانییەکانمان، لەمەوپێش درێغیان کردبێت و کەمیان لەسەر ئەم بابەتە وتبێت... جا کێ ناڵێت ئەوان ڕاستیشیان نەدەکـرد..!! بەشکو بێـوەفـایی پیـشـەی حـاجی لەقلەق بێت و غـەریزە بێت تیـایدا..!! دەسـا هەر واش بوو.. من بێـوەفـا بـووم.. بەڵێ، ئـەگـەر لەگـەڵ ئەوانیشدا بێوەفا نەبووبم، ئەوا لەگەڵ ناخ و جەستەی خۆمدا بێوەفا بووم.. هـەر بێوەفا نەبووم، بگرە زاڵمیش بووم.. بزانە چۆن چەمی ڕوون و سازگاری ناخی خـۆمم کردە زەلکاو و کـردمـە مـەڵبـەندی مێشـوولە و زەروو و مـێرووی زیانبەخش..!! جەسـتەی لە گوڵ پاکترمم کرد بە ناوەخنی گەدە و سی و سپڵی کەر و کـەمتـیـار.. کـاتێ ئاوا خۆم لـە ئاوێنەدا دەبینم، دڵم تێکهـەڵدێت.. جا کێ دەڵێت ئەوە منم..؟! کێ دەڵێت ئەوەی ئەودیو نییە..؟! کێ دەڵێت ئەو نییە، ئاوا بەم ناشـیرینی و دزێوییـە خـۆیم نیشـاندەدات و منیش زۆر گەوجـانە بە خـۆمی تێدەگەم.. سـەرشـێتـانە لە بەرامبـەریدا دەوەستم و لێی وردەبمەوە.. خەفـەتی پێــوە دەخــۆم و ئـاخ و داخی بۆ هــەڵدەکـێـشـم.. دەگـریم و فـرمــێـسکـی بۆ هەڵدەڕێژم.. دەموچاوم دەڕنمەوە و توند توند سنگمی بۆ دەکوتم.. من هـەرگیز نابێت ئەوەم لە بیـربچـێـتـەوە، کـە دوژمنـمـە و بۆ لەناوبردنم هـەمـوو ڕێگایەک دەگرێتە بەر.. نابێت بۆ ساتێکیش ئەوەم لە یاد بچێتەوە، کە هەر ئەو بێچووە حـاجی لەقلەقەی جارانە.. ئەو بێـچووە حـاجی لەقلەقـە زۆڵەیە، کـە دەیویست لەپێناوی مـانەوەی خـۆیدا، لەسـەر ئەو منارە بـەرزەوە فـرێـمـداتە خـوارەوە..

خۆیشی لەسەری سەرەوە سەیرم بکات، تا بزانێت کوێم لە پێشدا دەکەوێتە سەر ئەو کۆنکرێتە ڕەق و تەقەی حەوشی مزگەوت.. سەرم، یان باڵەکانم..؟! قەفەزەی سنگم، یان موورەغەی پشتم..؟! تۆ سەیرکە ئەم ئێستاشی هەر لەوسای دەچێت.. ئێستاش وەکو ئەوسا لەزەت و خۆشیی لە کەوتن و زەبوونییم دەبینێت، کەچی من بەپێچەوانەی ئەم، زۆر جار سەرەڕای ئەو هەموو خراپە و ناپاکییەی، کە لێی دەبینم، خۆشمدەوێت و بە خوشکی خۆمی دەزانم.. بە کەسی خۆمی دەزانم و سەبووریم پێیدێتەوە.. من دانی پیادا دەنێم، ئەوسا دەمویست لەناوی بەرم و خۆم بە تەنیا لەسەر ئەو هێلانەیەدا بمێنمەوە.. ئەمەش هەقێکی ڕەوای خۆم بوو، چونکە ئەوسا تەنها چوار بووین.. من و ئەو و دایکە و باوکە.. وانەبوایە نەمدەتوانی تاکێ بۆ خۆم پەیدا بکەم.. هەموو تاکێکیش مافی خۆیەتی لەپێناوی گەیشتن بە تاکێکی تری جیاواز لە خۆی، تاکێکی تری وەکو خۆی و هاوچەشنی خۆی لەناو بەرێت.. ڕەنگە ئەمە لۆژیکێکی حاجی لەقلەقانە بێت، بەڵام تاکو ئێستاش هەر باوەڕم پێیەتی.. من کە ئاوا باس لەو ڕابردووە دەکەم و مێژووی ئەو ناکۆکیانەی ناو هێلانەی سەر منارەی ئەو «مزگەوتی خانەقا»یە دەگێڕمەوە، نابێت یەکلایەنانە سەرنجی لێ بدەم.. دەبێت ئەو هەقەی بەخۆمی ڕەوا دەبینم، بەویشی ڕەوا ببینم.. من بینیومە، بەڵام ئەم نایبینێت.. ئەم یەکلایەنانە سەیری من دەکات و ناتوانێت، یاخود دەتوانێت، بەڵام نایەوێت، ڕق و کینەی ڕۆژانی بەسەرچووی سەر ئەو منارەیە لە بیر خۆی بەرێتەوە.. ئەم لەوە تێناگات، ناشیەوێت تێبگات، کە ئەو شەڕەی ئەوسا لەو بەرزاییەدا دەکرا، ئەمڕۆ لەم خوارە، لە ناو ئاپۆرەی ئەو خەڵکەدا ناکرێت.. ئەم هەمیشە بیر لە من دەکاتەوە و وا لە منیش دەکات، هەموو شتێک بەلاوە بنێم و هەر ئەوم لە بەرچاو بێت.. جا ئەو شتانەی کە هەمیشە لەبەرچاون، وەکو «چنار سەرچناری» دەیوت، لە جوانی و ڕەونەق دەکەون و درزێو و ناشیرین دەبن.. ئەنجام کەمنرخ و بێبەها دەکەونەوە.. بێزاری و دڵساردی دەبەخشن.. ئەوە ئەو جارە ئەم قسانەی بۆ دەکردم، کە وێنەکەی خۆی بۆ هێنام و بە قەڵەمێکی نووکباریک، لە پشتەکەی نووسی بوو: «پێشکەشە بە تاژان، لە گەڵ ڕێزمدا».. ئەو هەمووڕێگایەی، لەژێر

لێزمەبارانی ئێوارەی ئەو پایزە درەنگوەختەدا بڕیبوو، بۆئەوەی ئەو وێنەیەم بۆ بهێنێت.. داماوە هەموو گیانی تەڕ بووبوو.. لە گیرفانی ناوەوەی پاڵتۆکەی دەریهێنا و دایە دەستم.. نازانم بە گاڵتەم بوو یان بەڕاست، زللەیەکی سووکم بە پەنا گوێچکەیدا کێشا و پێیم وت:

ــ مەیموون هەر ئاوا تاژان بەڕووتی..؟!

ــ بەڕووتی حەزی لێ ناکەیت..؟!

ــ هەر هیچ نەبووایە بتنووسییایە: «تاژانی هاوڕێم»، یان «تاژانی خۆشەویست».

نازانم بەڕاستی بوو، یان بە گاڵتە وتی:

ــ کێ دەڵێت هاوڕێمی و کێش دەڵێت خۆشمدەوێیت..؟!

ــ تۆ خۆشت بوێم، یان خۆشت نەوێم، من بەوپەڕی ڕێز و خۆشەویستییەوە لە جامی دەگرم و لەم دیوارەی بەرامبەرمی دەدەم.

ــ نەکەی دەخیلت بم.. نەکەی لە دیواری بدەیت، با هەمیشە لە بەرچاوت نەبێت.

ــ ئەوە تۆ بەڕاستیتە چنار، یان گاڵتە دەکەیت..؟!

ــ ئەمەت لێناشارمەوە و بەڕاشکاوی پێت دەڵێم: بەڕاستیمە و زۆریش بەڕاستیمە.

ــ تۆ زۆر سەیریت.. دەزانیت..؟!

ــ بەڵێ.

ــ باشە دانیشی پیادا دەنێیت..!!

ــ دەبێت تۆش دان بەوەدا بنێیت، کە «من»ی بەیانی وەکو «من»ی ئێستا نامێنمەوە لە بەرچاوت.. ئەوە ئەگەر شەو بمێنمەوە، بەڵام بەم تۆف و ڕەهێڵەیەش هەر دەڕۆمەوە.. ناهێڵم وێنەکەم، مەبەستم لە هەردووکیانە، لەوەی بەرامبەرت و ئەوەی سەر ئەو کارتۆنە لاکێشەییەی ناو دەستت، لە جوانی و ڕەونەق بکەون.. دزێو و ناشیرین بن.. ئەنجام کەمنرخ و بێبەها بکەونەوە.. بێزاری و دڵساردی ببەخشن.

خۆ گوێی نەدایە ئەو سەرماوسۆڵە و ڕۆیشتەوە.. ماڵی ئەویشم بە قوڕ گرت،

خۆ کەس لێی تێنەدەگەیشت.. ئەویش کەسێک بوو سەیر و سەمەرە، کەچی هەر خۆشیشم دەویست.. دەسا ئێستاش هەر خۆشم دەوێت.. جارێکیان، کە لە هەیوانەکەدا ناوساجیی سووردەکردەوە و ناوچەوانی بەپەڕۆیەکی نێرگزی بەستبوو، هەر لە خۆمەوە پێیم وت:

ــ من تا ئێستا لە تۆ تێنەگەیشتووم، کەچی هەر خۆشیشم دەوێیت.

ئەم تەلێکی نووکتیژی بە دەستەوەبوو، ناوساجیی ناو تاوە ڕەشەکەی پێ کون کون دەکرد.. هەر ناوساجیە و «چوار» کونی تێدەکرد.. ئیتر خێرا شوێنەکانیان دەبوونە بلۆقی گەورە گەورە و بلۆقەکان لە پێش هەر جێگایەکی دیکەی ناوساجییەکەوە ئاڵ دەبوون و سوور هەڵدەگەڕان.. نازانم بەڕاستی گرەگرِی پرێمزە نەوتییەکە نەیهێشت، گوێی لە دەنگم بێت، یان حەزی دەکرد قسەکەم دووبارەکەمەوە.. نا.. نا.. گوێی لێبوو، بەڵام ویستی دووبارەی بکەمەوە.. مەکربازانە گوێچکەی هێنایە پێشەوە و تا تینی تیا بوو وتی:

ــ دەڵێیت چی..؟!

منیش زۆر قایمتر لە جاری پێشوو وتم:

ــ دەڵێم: من تا ئێستا لە تۆ تێنەگەیشتووم، کەچی هەر خۆشیشم دەوێیت.

ــ ئێ.. ئێ.. تێگەیشتم.. زۆر قسەم لەگەڵدا مەکە، چونکە دەنگی ئەو پرێمزە بڵحە نایەڵێت گوێم لە دەنگت بێت.. ناشبێت ئاوا قسە بکەین.. من گوێچکەم لە دەمی تۆوە نزیک بکەمەوە، ئاگام لە ناوساجیەکان دەبڕێت.. یان لەوانەیە پریشکی ڕۆنە داخبووەکە بپەڕێت و دەمموچاومان بسووتێنێت.. هی من بەتایبەتی، چونکە وەک دەیبینیت من نزیکترم لێیەوە.. ئیتر بیبڕەرەوە نامەوێت گوێم لە دەنگت بێت.

منی ئاوا تەریق و دەمکوت کردەوە، کەچی خۆی ئەوەندەی پێنەچوو، بەبێ ئەوەی گوێ بە گرەگرِی پرێمز و پریشکی ڕۆنی داخبوو بدات وتی:

ــ دەتوانیت قسەکەت دووبارە بکەیتەوە..؟!

تەواو ڕقی هەستاندم.. خەریک بوو بڕۆم و بەجێی بهێڵم.. بگرە تێروپڕ جنێویشی پێ بدەم.. خەرک بوو پێی بڵێم:

ــ تۆی قەحپە و نانەجیب، شایەنی ئەوەنییت، نەک من، هیچ کەسێک خۆشی

بوێیت.. تۆ شایانی ڕیسواکردنیت، نەک خۆشەویستی.

نازانم چی بوو نەیهێشت ئەو جنێوانەی پێ بدەم.. نازانم چی بوو وای لێ کردم نەک هەر ئاوا نەکەم، بەڵکو بەو هەموو ڕق و قینەشەوە، ئەو قسیەم، کە ڕێک لەگەڵ ئەوەی ناخ و ناو دڵمدا پێچەوانەبوو، جارێکی تریش بیڵێمەوە.. وتمەوە، بەڵام وتنەوەی ئەو جارەیانم تەواو لەو دوو جارەی پێشووم جیابوو.. وشەکان هەر ئەوانەی جاران بوون، بەڵام لەرەی دەنگم تەواو گۆڕابوو.. هەر دەتوت بەڕاستی جنێوی پێ دەدەم و لە بەرچاوی هەزاران کەسدا ڕیسوای دەکەم.. وامدەزانی هەرچی ڕق و قین هەیە، لە دڵمدا، لەگەڵ وشەکان دەردەپەڕنە دەرەوە و دەکەونە بەرچاوی، بۆیە تەمی شەرمێکی نامۆ، شەرمێک، کە هەرگیز لەمەوپێش هەستم پێی نەکردبوو، کەوتە سەر ڕووم و هەستم بە تەریقبوونەوەیەکی لەناکاوکرد، کەچی ئەم بەدەم بزەیەکی زۆر سەیر، کە من پێشتر هەرگیز بزەی وام لە هیچ حاڵەتێکی تردا لەسەر ئەو لێوانەیدا نەدیبوو وتی:

ــ ئێستا چاکتر تێتگەیشتم.

من لە شەرما سەرم داخست، بەڵام ئەم وازی نەهێنا.. ئەو جارەیان لێی پرسیم:

ــ تۆ دوو ڕستەت بەکارهێناوە وانییە..؟!

یەکەمجار بوو ئاوا بەم شێوەیە قسەم لەگەڵدا بکات.. وامدەزانی تێکچووە.. هەر لەخۆمەوە خەتاکەیم خستە ئەستۆی گرەگرِی پرێمزە نەوتییەکە و بلۆقی ناوساجیەکان.. باشە بۆچی پرێمز و ناوساجیەکانم بەبێ خەتا دەزانی..؟! چ جیاوازییەک لە نێوان پرێمز و گرەگرەکەی و ناوساجی و بلۆقەکانیدا هەیە..؟! بە خێرایی لە خەیاڵی خۆمدا دەمهێنا و دەمبرد.. دەمبرد و دەمهێنایەوە: پرێمز بەبێ خەتاو گرەگرەکەی تاوانبار.. ناوساجی داماو و بلۆقەکانی زاڵم و زۆردار.... چی بوو ئەو قسە بێتام و چێژانە، من لە دڵی خۆمدا دەمکردن..؟! دە ئاخر ئەو کچەتیوە مێشکی منیشی لەگەڵ ئەوەی خۆیدا تێکدابوو.. خەیاڵیشی منیشی پچڕ پچڕ و پەرت و بڵاوکردبووەوە.. دەبووایە من بێ دەنگ بم و وەڵامی نەدەمەوە، کەچی زۆر بێزار و شەرمنانە، بەڵام بەحەز و

پەرۆشانەوە، هەرچی دەپرسی، بەخێرایی و ڕێکوپێک وەڵامیم دەدایەوە.. پێیم وت:

ــ بەڵێ، دوو ڕستەم بەکارهێناوە.. بۆچی دەپرسیت..؟!

ــ ئاخر نابێت نەپرسم.. تۆ لە پێشدا دەستتپێکرد.. تۆ بوویت وانییە..؟! ئا.. ئا.. تۆ بوویت.. هەر دەبێت تۆ بیت، خۆ کەسی ترمان لەگەڵدا نییە.. ئێستا ئەوە گرنگ نییە، من دەستم پێکرد، یان تۆ.. حەزیش ناکەم لەسەر شتێکی وا هیچوپووچ بیکەین بە موشتومڕ.. بەکارێکی ڕاست و شیاوی نازانم، تۆ ئەو هەموو ڕێگایەت بڕیوە و هاتوویت بۆ سەردانی من، منیش دڵڕەقانە دەستی ئاردوییم بنێمە قژتەوە.. ئەگەر ئەوەش لە بەرچاو نەگرم ئازارت پێدەگات، خۆ قژت بە ئارد سپی دەکەم و دەشزانم تۆ چەند خەفەت بەوە دەخۆێت، ئەگەر ئاوا خۆت لە ئاوێنەدا ببینیت.. ئەو ئێوارەیەم لەبیر ماوە، کە لە شەقامی «دەواسە» پیاسەمان دەکرد، بۆت باسدەکردم، چەند بۆ ئەو تاڵە قژە سپییەت گریاویت، کاتێ بەڕێککەوت لە ئاوێنەی ئەو پاسە بیستویەک نەفەرییەدا کەوتۆتە بەرچاوت.. هەرکە گەیشتینە باخەکەی ئەوبەریش، لەپڕ دەستت بەگریان کرد..؟! منیش دوایی بۆت گریام، بەڵام نەمدەویست تۆ بزانیت بۆت گریاوم.. ئێستاش نەمدەویست بیزانیت، بەڵام وا ناچارت کردم دانی پیادابنێم.. ئاخر تاڗان گیان زۆر گوناه و داماو هاتیتە بەرچاوم و زۆریش بەخەمناکی دەگریایت.. زۆر جار ویستوومە لاسایی ئەو گریانەی تۆ بکەمەوە و نەمتوانیوە.. تەنانەت ئەو شەوانەش ناتوانم، کە تا درەنگ گوێ لەو گۆرانی و مۆسیقا خەمناکانە دەگرم.. دەگریم، زۆریش دەگریم، بەڵام نازانم وەکو ئەو جارەی تۆ بگریم.. چەند حەز دەکەم جارێکی تر بتبینم، وەکو ئەو ڕۆژە بگریت، بەڵام بەمەرجێ هەر لە خۆتەوە، بەبێ ئەوەی من داوات لێ بکەم، یان ناچارت بکەم، بگریت.. پێم خۆشە لە خەوێکی قووڵدا بم، یان چووبمە خەیاڵێکی دوورەوە و لەگەڵ هەنسکی گریانت ڕامچڵەکێنیت.. سەرهەڵبڕم و فرمێسکەکانت ببینم، کە تا سەر ڕوومەتت هاتوون.. لەوێ من ناهێڵم بگەنە سەر چەناگەت و بۆ ناو سنگت تکە بکەن، هەر بە ماچ هەڵیاندەگرمەوە.. کەنارییت دیوە چۆن سووک سووک و بەئەسپایی، دەنکی هەرزن بە دەنووک

هەڵدەگرێتەوە..؟! یان باڵندە سپییە سەربالڕەشەکانی سەر زێی «مووسڵ»ت بینیوە، کە دەنووکیان وەکو ئەم تەلەی دەستم تیژە، لەپڕ خۆیان بە ئاوەکەدا دەدەن و دەیکەن بە شلّپ و هووڕ.. لە چاوتروووکانێکدا ماسیەکی بچکۆلە دەگرن و بەپڕتاوی بەرەو ئاسمان هەڵدەفڕنەوە..؟! ئینجا من زۆر چاکیش دەزانم تۆ بۆچی ئەو ڕۆژە تاڵەقژە سپییەکەتت بیرکەوتەوە، بەڵام وابزانم خۆت نەتدەزانی.. تۆ ئەوسا زمانت بە ئایسکرێمەکەدا دەهێنا و بەشێوەیەکی زۆر سەیریش دەتلستەوە.. هەر ئەوەش وای لێ کردم ئەوەندە بەدیقەت سەرنج لە دەموچاو و ڕەنگوڕووت بدەم و بەئاسانی بزانم بۆچی بیرتکەوتەوە و خەفەت دایگرتیت.. دەزانیت تاژان گیان منیش گوناه و داماوم..؟! منیش زۆر کەساس و بەدبەختم، کە نازانم وەکو تۆ ئایسکرێم بخۆم و بیری قووڵ بکەمەوە و بگریم.. بۆ ئەوەش وات پێ ناڵێم تا بەزەییت پیامدا بێتەوە و بۆم بگریت.. حەزیش ناکەم تۆ بە هەڵە لێم تێبگەیت و وابزانیت من هەمیشە دەمەوێت تۆ بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە ببینم.. من بۆ ئەوەش ئەو ڕۆژە بیری تۆ ناخەمەوە، تا جارێکی تریش بتگریەنم.. ئەو ڕۆژەش من نەمگریاندی.. تۆ خۆت حەزت لە ئایسکرێم کرد و بۆ منیشت کڕی.. دڵنیابە من ئێستا نیازی ئەوەم نییە تۆ بهێنمە گریان.. هەتا ئەگەر بشگریت، سەیرت ناکەم.. ڕەنگە قێزیشم نەیەت سەیرت بکەم.. ئێستا ئەگەر تۆ بگریت، دوورنییە من برشێمەوە.. دوورنییە تنۆکێ فرمێسک بەچاوتەوە ببینم، ئەم ئێوارەیە نانم بۆ نەخورێت.. لەوانەیە بلۆقی سەر ناوساجییەکان لە بەرچاوم ببن بە فرمێسکەکانی تۆ و بێزم نەیەت گازیان لێبگرم.. لە داخا هەر هەموویان قلّپی ناو تەنەکە خۆڵەکەی بەردەرگا بکەمەوە.. دە ئیتر ئەوەندە ماندووم مەکە و تێمبگە، کە من گریانی تۆم پێویست نییە.. جا من کە پێویستم بە گریانی تۆ نەبێت، بۆچی شەڕت لەگەڵدا دەکەم..؟! ئێستا زانیت گوڵەکەم من شەڕت پێ نافرۆشم..؟! تۆ بڵێیت تاژە گیان، من ئەوەندە دڵڕەق و بێویژدان بم، تا ئازاری تۆ بدەم..؟! خۆ دەشزانم ئەگەر من بەو دەستە ئارداوییانەم قژی ڕەشی تۆ ڕابکێشم و لە چاوتروووکانێکدا بتکەم بە پیرەژنی سەرسپی، تۆ ناتوانیت تاڵەموویەکی قژی من ڕابکێشیت.. دەتوانی ڕایبکێشیت، بەڵام خۆ تۆ چاوت

هەیەو دەیبینیت چۆن بەم پەڕۆ نێرگزیە ناوچەوانمم شەتەک داوە.. ڕاستە دەتوانیت لە تۆقی سەرمەوە، چەپک چەپک لە بێخەوە هەلیتەکێنیت، بەڵام خۆ تۆ کچیت و دەزانیت کچ تەنها لە لای پێشەوەی ئازاری پێ دەگات.. مەترسە من شەڕت لەگەڵدا ناکەم.. ئەوەی لێتی داوا دەکەم هەر ئەوەیە، شوێنی هەر دوو ڕستەکەتم بۆ بگۆڕە.. دەی خێرا تا ناوساجییەکەم نەسووتاوە.. دەی خێرا تا پرێمزەکە نەکوژاوەتەوە.. دە خێرا.. چییە ئەوەندە خاووخلیچکیت..؟! دەی دەی خێرا... خێرا.. چاوەڕێی چی دەکەیت..؟! لەگەڵ تۆمە خێرا.. کچەتیو خێرا.. خێرا.. خێرا......

ـ کەچی هەر خۆشیشم دەوێیت، من تا ئێستا لە تۆ تێنەگەیشتووم.

ـ بزانە چۆن بلۆقەکانی ناوساجییەکەم سووتان..!! ئەوە هەمووی خەتای خاووخلیچکی تۆ بوو.. قەیناکات لێت تووڕە نابم.. تۆ تا ئێستاش هەر لەوە دەترسی من لەپڕ پەلامارت بدەم و دەستی ئارداوییم بنێمە قژتەوە، بەڵام جارێکی تریش دڵنیات دەکەم، کە نەترسی.. حەزیش ناکەم بەو پەشۆکاوییەوە قسەم لەگەڵدا بکەیت.. حەز ناکەم خۆتم ترساو و زارەترەک پیشان بدەیت، چونکە نامەوێت وا بزانم من تەنها ئەوەندەم لە باردایە دەستەپاچە و داماوێکی وەکو تۆ بترسێنم.. پێم خۆش نییە سنووری کورتی دەستەڵاتی خۆم ببینم.. ئەگەر وابزانم تۆ بەڕاستی لێم دەترسیت، ئەوا منیش لە تۆ دەترسم.. ئەو کاتە تۆش بەو ترسنۆکیەت زەندەقی من دەبەیت.. گوێم لێ بگرە، ئەمە دوا گونکە بەدەستمەوەیە.. تا من لەسەر ئەم پنەیە دەیکەمەوە، تۆ خەریک بە لە لای خۆتەوە پرۆڤە لەسەر هەڵگێڕانەوەی هەردوو ڕستەکەت بکە.. مەبەستم ئەوەیە لە دوا وشەی ڕستەی دووەمەوە دەستی پێبکە و لە یەکەم وشەی ڕستەی یەکەمەوە کۆتایی پێبێنە.. تۆ هەر وشەیەکت وت، من خێرا نووکی تەلەکە دەکەم بە شوێنێکی ناوساجییەکەدا و دەیکەم بە بلۆق، بەڵام دەبێت تۆش بەخێرایێ و بەبێ ترس و دوودڵی بیڵێیتەوە.. دەزانیت بۆچی..؟! چونکە ئەگەر وانەبێت، ئەوا ناوساجییەکە بەتینی ئاگری پرێمزەکە ڕەق دەبێت، واتە سوورهەڵدەگەڕێت و ئیتر ناتوانم کونی تێبکەم.. ئەوسا ناوساجییەکەم بەبێ بلۆق و بەبێ تام و چێژ دەبێت.... دەی دەستی پێبکە.. نا.. نا.. بوەستە..

بوەستە.. بزانم ئامادەیت..؟!

ــ بەڵێ، ئامادەم.

ــ زۆر چاکە.. هەر من خستمە ناو تاوەکەوە و دەستم بۆ تەلەکە برد، تۆ دەست پێکە.

ــ دەوێیت خۆشیشم هەر کەچی تێنەگەیشتووم تۆ لە ئێستا تا من.

هەستم بە بێزارییەکی سەیرتر کرد.. دەتوت دڕک و حوشترالووک دەخۆم، کاتێ ئەو چەند وشە نەشاز و نەگونجاوانەم بەسەر یەکترەوە دەوتەوە، کەچی زۆریشم پێ خۆشبوون.. چەند لەو کاتانەی منداڵییم دەچوو، کە لەسەر ڕێی ڕێبواران و لەو لێژاییەی قەد «قەلا»، بەردی بەقەدەر ناولەپم و هی بچووکتری ئەوەندەی پەنجەتووتە و براتووتە و بالآبەرزە و دۆشاومژە و ئەسپێکوژەم و هی بەئەندازەی نینۆکەکانم کۆدەکردنەوە و لەسەر یەکتر کەڵەکەمدەکردن.. چ ئەقڵێکی ساکار و کرچ و کاڵم هەبوو، دەمویست ئەو هەموو بەردە نارێک و لەیەکنەچووە، بەسەر یەکتردا هەڵبچنم و خانووچکەیان پێ درووست بکەم.. «بەردێک»م لەسەر «ئەویتر» دادەنا دەلەقی.. «سێیەم»م دەخستە سەریان، بەلادادەهاتن و سکیاندەدا.. «چوارەم»م دادەنا و دانەدەنا، دەڕمان.. ئەرێ ئەوە بەڕاستی دەنگیان پەیدادەکرد، یان هەر لە گوێچکەی مندا دەیانکرد بەو زرمەوهووڕە و وێنەی هەرەسهێنانی کێوی سەخت و هەڵەمووت دەنگیان دەدایەوە..؟! هەر دەتوت هەزاران بەردتاش لەناو کەلاوەی سەرمدا بەردی ڕەقی شاخ دادەتاشن.. چەند گاڵتەیان پێ دەکرم.. ئەو ڕێبوارانە چەند دووعایان لێ دەکردم، کە ئەو بەردانەم دەکەوتنە بەر قاچیان و ساتمەیان لێ دەکردن.. هەندێکیان دەیانوت:

ــ کچم عەمرت کورت بێت.. شوێن نەماوە خانووچکەی لێ بکەیت، سەر ئەو ڕێگایە نەبێت..؟!

هەبوو دەیوت:

ــ بۆچی ماڵی باوکت کاول بووە، هەی کاول بێت خوایە، تا تۆ خانوو بۆ خۆت بکەیت..؟!

هی وا هەبوو دەیوت:

ــ لە پێشینانم بیستووە، کە خانووچکەی منداڵ کارێکی شوومە.. دەڵێن ئەو منداڵەی خانووچکە بکات، بەدەستی دایک و باوکی لەناودەچێت.. خوایە ئەو بەندەیەت لە ڕێگا دەرچووە و بیهێنەرەوە سەر ڕێگای ڕاست.

هەندێکی تر هەبوون دەیانوت:

ــ یاری نەماوە لەم دنیایە، بەردڕیزکردن و ماڵەباجێنە نەبێت..؟! تەواو ئێسکی خۆتت قورس کردووە.. بزانە ئەوە هەمووی منداڵە و کەسیان وەکو تۆ ناکەن.

جارێکیان بەڕێوەبەری شارەوانی هات و بە لەقە بەردەکانی هەڵدایە خوارەوە، بۆ سەر شەقامەکەی دامێنی قەڵا.. نازانم سەری چەند کەسی پێ شکاندن و زەندەقی چەندیانی پێ بردن، بەڵام بە لەفزێکی زۆر شیرین پێی وتم:

ــ بووکەشووشەیەکی جوانت بۆ دەکڕم، لەجیاتی بەرد بۆ خۆت هەر یاریی پێ بکە.. باشە ئاقڵ گیان..؟!

هی وا هەبوو نە خەڵکی «قەڵا» بوو، نە هی ئەو دەوروپشتە، کەچی ئەوەندە بەو یارییەی من پەست و قارس بووبوو، خۆی بۆ نەگیرابوو، بۆ گوێچکەبادان و قژڕاکێشان و سەرزەنشتکردنم، «چوار» فرسەخ ڕێگای بڕیبوو.. هەموویان بە لایەک، دایک و باوک و مامەکانی خۆم بە لایەکی تر.. ئەوانیش ڕازیی نەدەبوون من خانووچکە بۆ خۆم بکەم.. هەندێ جار گوێچکەیان ڕادەکێشام، هەندێ جاریش قژم.. جار جاریش بیانووی سەیر سەیریان بۆ دەهێنامەوە.. هەرە سەیرەکەیان ئەوە بوو:

ــ کچم یەک تۆز ئەقڵت هەبێت.. خانووچکە لەم لێژاییە ناکرێت، بەس ئەوەندە ڕووڕەش و خەجاڵەتی لای دەرودراوسێمان بکە.

خۆ ئەوان بەسەرێ هەقیشیان بوو.. ئەو کارەی من زۆر لەوەی «سیزیف» دەچوو.. ئەو بە شان بەردی سەر ئەو کێوە سەختە دەخست.. هەر دەیگەیاندە لووتکە و لێی دەکەوتە خوارەوە.. منیش بەردم لە سەر یەکتر کەڵەکە دەکردن و دەرمان.. بەردەکەی «سیزیف» لەبەر قورسی دەکەوتە خوارەوە، ئەوانەی من لەبەر نارێکی هەرەسیان دەهێنا.. ڕەنگە نەشارەزایی خۆشمی تیابووبێت..

بەڵێ، من نەشارەزابووم و دەستم دابووە کارێ، لە تواناو وزەی خۆم بەدەربوو.. بەڵام خۆ ئەو کاتە من پۆلی «چوار»ی سەرەتایی بووم و دەبووایە سەرم لە درووستکردنی خانووچکە دەربچووایە.. خەتای ئەو «سیر»ەش بوو، کە «ست شیرین» هەموو ژەمێ دەیخوارد و بۆنەکەی بەناو پۆلدا بڵاودەکردەوە.. ئەو لە داخی من وای دەکرد، بۆ ئەوەی هێڵنجم بێتێ و بڕشێمەوە.. بۆ ئەوەی نەچمە پۆلەوە و گوێ لەوانەی «جۆگرافیای عێراق و وڵاتانی دراوسێ» نەگرم.. من لە «جۆگرافیا»دا نەشەرەزابووم و دەشمویست بەدەستی خۆم و بەبێ یارمەتی و پاڵپشتی هیچ کەسێکی دیکە، بەو بیرە پەڕپووت و عەمارەپۆیەی هەمبوو، ماڵ بۆ خۆم پێکەوەنێم.. کەللەڕەقییەکەشم لەولاوە بوەستێت.. چەندیان پێ دەوتم ئەو شوێنە شوێنی خانووچکە نییە، کەچی قسە هەر قسەی خۆم بوو.. ئەمەش هەر پەیوەندیی بە سرووشتی حاجی لەقلەقەوە هەیە.. کەللەڕەقیی بوو وای لە من و لەو خوشکەم کرد، بیکەین بەشەڕ و یەکتر هەڵدەینە ناو حەوشی مزگەوت.. ئەرێ من هەمدیس هاتمەوە سەر ئەم مەسەلەیە.. بەڕاستی تەواو لێی بێزاربووم.. باشە ئەوە شتێکی تر نییە بیری لێ بکەمەوە، ئەم باسە ناخۆش و بێزارە نەبێت..؟! ئەرێ پێش ئەوە بیرم لە چی دەکردەوە.....؟! لە چی.... لە چی.... لە چی.... لە چی.... ئا.. بیرم کەوتەوە.. بیرم لە ڕۆژی ناوساجییەکە دەکردەوە.. دە ئاخر ئەویش هەر بێزارییە.. دەزانم.. بەڵام بێزارییەکی خۆش و ئاسوودەبەخشە.. هەموو ئەو ئاسوودەییەش لە وڕێنە و شوێنگۆڕکێی ڕستەکان و هەڵگێڕانەوەیاندا هەڵقولا.. سەرەتاکەی بێزارییەکی ڕۆحداخکەر و کۆتاییەکەشی ئەوینتکێن.. پڕبەدڵ حەزم دەکرد، ئاوا بەردەوام پرسیاری هیچوپووچی لەم بابەتەم لێ بکات و وەڵامی بێمانای بدەمەوە.. دەمویست هەر ئاوا لەگەڵیدا پیادابچم، تا بزانم ئەنجام بە کوێ دەگات و دەگینە چ مەنزڵ و هەوارێ.. لەمەوپێش هەر لە خۆیم بیستبوو، کە بێزاریی هەندێک جار لە ئاسوودەگی بەتام و چێژترە.. باشە ئەوە هیچ پەیوەندییەکی بەو برسێتییەوە هەبوو، کە ئەو کاتی قسەکانم دەکرد، هەستم پێی دەکرد..؟! من چاوم بڕیبووە بلۆقە ئاڵ و سوورهەڵگەڕاوەکان و ناودەمم لیێکی تیا زابوو، کاتێ ئەو وشە

قـەڵبـانەم بەنارێکی بەدوای یەکتـردا ڕیز دەکـرد.. تەنانـەت هەسـتم بـەتەڕیی وشـەکان دەکرد، کە لە دەمم دەردەپەڕین.. دەردەپەڕیـن و وەکو کەناری خـۆیان ڕادەوەشـاند.. خـۆیان ڕادەوەشـاند و دەوروپشـتی خـۆیان ئاوپرژێن دەکرد.. من هەر لە منداڵییەوە لەبەر ئەو بلۆقانە بوو حەزم لە ناوسـاجی دەکرد.. هەمیشـە هەر گازم لەوان دەگرت و ئەویتریم فڕێدەدا.. دایکم پێی دەوتم:

ــ کچێ چاوت کوێر دەبێت، تۆ ئـەو ناوساجیە جوانە ئاوا فڕێ دەدەیتـە ژێر قاچمانەوە.

ئەوە دایکم دەیویست سـەرزەنشتی من بکات، یان بە ناوسـاجیەکانی خۆیدا هەڵبـڵـێت..؟! چ ئەقـڵـێکی کـاڵ و کـرچی هەبـوو، وایدەزانی کـەس نازانێت ناوساجیی وەکو هـی ئەو بکات.. ئەگەر ئەو ناوسـاجیـەی دەبینی، کە «چنار» کردی و دە بلۆقی بەقـەدەر دە وشەکەی من بۆ دروستکرد، ئەوا ئەوانەی خۆی لە بـەرچاو دەکـەوت.. هـونەریش هـی من بوو.. هی ئـەو وشـە قـەڵبـانەبوو، کـە بەسـەریەکترەوە دەموتنەوە و مانایان نەدەبەخشی، نەک هی تەلە نووکتیژەکەی دەستی ئـەم، کەچی خێرا کردی بەهی خـۆی و بە تەنیا خـواردی.. ڕازیی نەبوو من دەمی لێ بدەم.. پێی دەوتم:

ــ تۆ بـۆ خـۆت چواربلۆقـیـیـەکـان بخـۆ.. ئەوان هـەر هـەمـوویان بـۆ تۆ و ئەم دەبلۆقیەش بەتەنیا بۆ من.

لەپێـشـدا بـەخـۆشی پێـیم وت بمداتێ، بەڵام کـە ڕازیی نەبوو، ئیـتـر تووڕە بووم.. شـەرمم شکا و کۆمەڵێ قسـەی ناشیـرینم پێی وت، کەچی ئەم گوێی بە من نەدەدا و گـازی سـووکی سـووکی لە بلۆقـەکان دەکـرد.. دەیجـووین و دیقـە دیقەی پێ دەکرم.. پێیم وت:

ــ وشـەکان هـی من بوون.. کەواتە ئەم بلۆقانە هـی خۆمن.

ــ بـەڵام تۆ دابووتن بەمن.. خۆ من داواشم لێ نەکردبوویت، بەڵکو هـەر خۆت پێت وتم: من تا ئێستاش لە تۆ تێنەگەیشـتووم، کەچی هـەر خۆشیشم دەوێیت.. پێنج جار و هـەر جارێ بە شـێوەیەکیش پێت وتم.. ئیتر بۆ پاشگەزدەبیتەوە..؟! تۆ ئـەو وشـانـەت داوە بـە من و منیش ئازادم چیـیـان لێ بکەم و چیـیـان لێ نەکەم.. ئەوا من لەجیاتی کونجی کردوومن بەسـەر ئەم ناوسـاجییەدا و بۆ خۆم

دەیانخۆم.. ڕێگایەکی زۆر چاکە بۆ خۆشەویستی گۆڕینەوە.. هەر بەڕاستی خۆشەویستییەکەت دەچێتە ناخمەوە و تێکەڵ بە خوێنم دەبێت، بەناو دەمارەکانی جەستەمدا دەگەڕێت و ڕۆحی وشکهەڵاتووم ئاودەدات.. جا نازانم تۆ بۆچی ئاوا پێی دڵتەنگ و نیگەران بوویت..؟! خۆ ئەوە شاعیرێ لە شیعرێکیدا شتێکی ئاوای بوتایە، دەتوت: «ئای کە وێنەیەکی ناسک و جوان و دڵگیرە..!!» منیش دەتوانم بڵێم ئارد و ئاو و خوێ و ڕۆن و شتەکانی تر، تەنانەت تەلە نووکتیژەکەش هی من بوو، بەڵام من وەکو تۆ نییم، نایدەمەوە بەچاوتا.. حەزیشم دەکرد دانەیەکی دەبلۆقیی وەکو ئەوەی خۆمت بۆ بکەم، بەڵام بەداخەوە ناتوانم، چونکە یەکەم: هەویر نەماوە.. دووەم: ڕۆنی ناو تاوەکە ساردبۆتەوە و مەییوە.. تۆ خۆت لە من چاکتر دەزانیت، کە بەکارهێنانەوەی ڕۆن چ زیانێک بەتەندرووستی دەگەیەنێت.. سێیەم: پریمزەکە کوژاوەتەوە و زۆر بەزەحمەت دادەگیرسێتەوە.. چوارەم: ئیتر تۆ ناتوانیت ئەو وشانە جارێکی تر بڵێیتەوە.. ئەگەر بشیانڵێیتەوە، وەکو جاری پێشوویان ناڵێیتەوە.. وەکو چۆن ئیتر ناتوانیت وەکو ئەو جارە بگریت، کە ئایسکریمەکەت دەلستەوە.. ئاخ..!! ئاخ تاژە گیان ئاخ..!! خۆزگە یان ئەو ڕۆژەم بەجارێ لە بیر بچێتەوە، یان تۆ بیرت بکەوێتەوە چۆن دەگریایت.. بەساقەی ئەو فرمێسکە ورد وردانەت بم، کە وەکو نینۆکی منداڵی ساوا وابوون.. لە دەوری ئەو چاوە جوانانەت گەڕێم، کە لە دوو گۆزەی زۆر زۆر بچکۆلەی پڕ ئاوی ڕوون و سازگار دەچوون.. هەر بینینی ئەو دوو گۆزەیەش بوو وای لێ کردم تینووم بێت، کەچی وامدەزانی هی شیرینیی ئایسکریمەکەیە.. چووم هەر دوو ناولەپمم لە بەر بەلووعەی ناو ئەو باخە گرتەوە و وەکو ئاسکێکی زۆر زارەترەک و تینوو، کە دەعبایەکی ترسناک دەشتاودەشت ڕاوی نابێت، دەمم تێخست، بەڵام تینوویەتیم نەدەشکا.. نا.. نا.. من بە هەڵەدا چووبووم، دەبووایە ئاو لە گۆزەکاندا بخۆمەوە.. گۆزە بە نەخش و نیگار نەخشاوەکانی چاوی تۆ.. کچێ من هەر ئەوەندەم لە دەست دێت پێت بڵێم: بەقوربانی ئەو دوو چاوەت بم، کە لە هەموو شتێ بەنرخترن.. خۆ سوور دەشزانم ئەوەندە و هەزار ئەوەندەش سوکنایی ئەو دڵە لەتوکوت و هەڵقرچاوەم نادەن، بەڵام لەوە زیاترم

بۆ نایەت.. ئەگەر تۆ وەکو من نیت و دەستەڵاتت بەسەر ناخ و ئەقڵ و زمانی خۆتدا دەشکێت، تێمبگەیەنە، کە نهێنی لەوەدا چییە، چاو چاوی تۆن و بە جەستەی تۆوەن، بەڵام من زیاتر لە تۆ خۆشم دەوێن و ڕووناکییان پێ دەبینم..؟! ئاخ..!! چۆن ئەو ڕۆژەم لە دەست خۆم دا..!! تازە ئێوارەی ئاوام بۆ ڕێکناکەوێتەوە.. تازە تۆ ئایسکرێمی هەموو دنیا بخۆیت و قژت نەک تاڵێکی، هەر هەمووی لە چاوترووکانێکدا سپی بێت و ڕەنگی شەختە و بەفر بگرێت، هەر نازانیت وەکو ئەو جارەی ناو ئەو باخە، کە لەژێر سێبەری کورتخایەنی ئەو پۆلە ریشۆڵە سەرگەردانەی ئاسمانە بێگەردەکەدا دەگریایت، بگریتەوە.. ئای لە سێبەری کورتخایەنی کۆچی ڕیشۆڵەکان و لە گریانی کورتخایەنی پڕ لە جوانی و لەزەتی تۆ..!! کورتخایەن بوو وەکو تەمەنی من، کەچی ترسناکیش نەبوو.. نا.. نا.. ترسناکی چی..؟! ئاسوودەییان لێ دەتکا.. ئینجا زانیم ئەو تەمەنەم بۆچی ئەوەندە کورتە.. ئینجا زانیم چ پەیوەندیەکی سەیر، تۆ بڵێ چ ڕێککەوتنێکی نهێنی لە نێوان ئەو چاوانەی تۆ و گۆڕهەڵکەنەکاندا هەیە.. ئەو گۆڕهەڵکەنانەی من نایانبینم، کەچی هەمیشە دەنگی پاچ و بێڵەکانیان، کە دەیکەن بە ناخی زەویدا و گۆڕم بۆ هەڵدەکەنن، لە گوێچکەمدا دەزرینگێتەوە.. تمەز ئەوان لەگەڵ هەر تروکانێکی چاوانی تۆ، هاوکات و هاوئاهەنگ، پاچ و بێڵی خۆیان دەوەشێنن.. زۆر ئاسانە بۆ من، ئەگەر بمەوێت بزانم کەی دەمرم، بەمەرجێ بزانم کەی تۆ جارێکی تر وەکو ئەو ئێوارەیە دەگریت.. بەڵام نا.. من دەمرم و ئەو ئاواتەم نایەتە دی.. ئاخ..!! ئاخ تازە گیان ئاخ..!! ئاخ دڵەکەم ئاخ..!! من دەمرم و بەم داخ و حەسرەتەوە سەر دەنێمەوە.. دەمرم و تۆ نابینم وەکو ئەو جارە بگریتەوە.. دەمرم و ئەو ئێوارەیە وەکو خۆی دووبارە نابێتەوە.. دەمرم و کەسیش نازانێت بۆ مردووم.. ئەگەر بشزانن هەر باوەڕ ناکەن.. وەکو چۆن خۆشت باوەڕم پێ ناکەیت.. من چەند حەزم دەکرد دایکم لە دوای من مناڵێکی تری ببێت و ماوەیەکی زۆر لەو نینۆکە ورد ورد و ئێجگار سپییانەی ڕابمێنم و بچمە خەیاڵی دوور دوور و قووڵ قووڵەوە، کەچی هەر نەیدەبوو.. خۆشم تازە مناڵی خۆم نابینم، بەڵام چی دەبێت ئەگەر جارێکی تر ئەو فرمێسکانەی تۆ، کە بۆ من تامی سەیرکردنی ئەوان و زۆر زیاتریش دەدەن

ببینمەوە.. تووخوا ئەگەر مردم، یان نەخۆشکەوتم و لە ناو جێداکەوتم، هەر خۆت بۆم بگری.. نەهێڵیت نە دایکم و نە هیچ کەسێکی تر بۆم بگرین..... نا.. نا.. تۆش نەگریت.. گریانی تۆشم ناوێت.. دەمویست، بەڵام نەمزانی، خۆم داوام لێ کردیت.. زمانم بە ڕۆنی داخبووی ناوساجی بسووتێت و بە بلۆقە گەرمەکانی هەلاهەلا بێت، کە ئاوا لە دەمم دەرچوو.. ئێستا هیچ پێم ناخۆش نییە، ئەگەر تۆ بە پەرۆ نێرگزییەکەی من، ناوچەوانت شەتەک بدەیت و پرێمزە نەوتییەکە داگیرسێنیت.. تاوە ڕەشەکەی هەر بە ڕۆنە کۆنەکەیەوە بخەیتە سەری.. زمانم بکەیت بە گونکی بچووک بچووک و لە سەر پنە بیانکەیتەوە.. یەکە بەیەکەیان بخەیتە ناو ڕۆنەوە و بە تەلە نووکتیژەکە کون کونیان بکەیت.. بۆ خۆتیان بکەیت بە ناوساجیی دەبلۆقی.. خۆزگە وات دەکرد و لەسەر ئەو خەتا ناماقووڵەی کردم، بەدەستی خۆت سزات دەدام.. تازە ئەگەر بۆشم بگریت، سوودی نییە.. من وام لێ کردیت بگریت.. ناچارم کردیت فرمێسکم بۆ بڕێژیت.. من دەمویست، خۆت لە ناخی ناخی دڵەوە، بەبێ ئەوەی داوات لێ بکەم و ناچارت بکەم، وەکو خوشکێک، یان هاوڕێیەکی دڵسۆز بۆم بگریت.. چی لە تۆی دڵڕەق بکەم، ئەوەندەت بۆ نەکردم.. برۆ هەی بێوەفا.. هەی بێمروەتی بەدنمەک.. گریانی تۆی خۆپەرستم ناوێت.. فرمێسکە قەڵپەکانت بە عانەیک ناکرم.. هەی قەحپەی بەڕەڵڵا... بۆچی ئاوام لێ دەکەیت..؟! بۆ..؟! بۆ..؟! ئاخر بۆ..؟! تووخوا بۆ....؟! چییم کردووە، تۆ ئاوام لێ دەکەیت.. دە پێم بڵێ بۆچی دەتەوێت بمکوژیت..؟! بۆ..؟! بۆ..؟! هاوار.. هاوار.. هاوار خەڵکینە وەرن بزانن تاژە قەحپە چییم لێ دەکات....

هەموو شتێکی ئەو ڕۆژە خۆش بوو، تەنانەت ئەو جنێوانەش لەزەتبەخش بوون، کە منی میوان لەسەر بلۆقی ناوساجی بەوی خانەخوێم دەدا.. ئەو وڕێنانەی «چنار»یش، کە دەیانترساندم و تەزوویان بەهەموو گیانمدا دەهێنا، هەر ئاسوودە بەخش بوون.. جنێوەکانی نوقڵ و پەشمەک بوون.. نا..نا.. من ئەگەر لە دروستکرنی خانووچکەشدا بەهەڵەدا چوویم، ئەوا لەوەیاندا ڕاستییم پێکاوە، کە «بلۆق»ی ناوساجی، با «زۆردار»یش بێت، هەر لە «ناوساجی»ی «زۆرلێکراو» خۆشترە.. کەواتە ئێمە دەتوانین بەبێ ترس و هەر

بەگەرمییشـەوە، بلۆقی ناوساجی بخەینە دەممانەوە و چێژیشی لێ وەربگرین..
تۆ بڵـێیت وابێت..؟! بەڵێ، وایە، بەڵام بەو مـەرجەی جـێگۆڕکێ بـە ڕستـەکان بکەین و ئەم جـەمـسـەر و ئەو جـەمـسـەریان بگۆڕین.. جـا خـۆ ئاوا بڕوات سەرتاپای زمان لەبەریەکتر هەڵدەوەشێتەوە و تەواو لەباریەکتری دەبەین.. هەر کـاتێ دەزانی وا زمـان بـووە بە هەویری ناوسـاجی و وشـەکـانیش بـوون بە گـونکی بچـووک بچـووک و هەڵـهـاتوو.. لەپێناوی گـەیشتن بە لـەزەت و چێـژی بلـۆقـەکـان، هەر ناوسـاجـیـیـەک «چوار» گـازی لێ دەگـیـرێت و ئەویتـری فڕێدەدرێت.... ئەرێ ئەوە من باسی چی دەکـەم..؟! تۆ بڵـێـیت نەخـەڵەفـابم..؟! دەزانی مـن تا ئـێـســتـــاش وڕێنـەی ئەو ڕۆژە بـەرینـەداوم..؟! لەو ڕۆژەوە مـن بەقـەدەر.... بەقـەدەر....بەقـەدەر.... بەقـەدەر.... بڵـێم بەقـەدەر چی.... بەقـەدەر چی.... بەقـــەدەر چی.... بەقـــەدەر چی....؟! نازانم.. جـا ئەمــە پێـوانـەی بۆ چیـیــە..؟! هیچ.. مـنیش دەڵێم نایـەوێت.. ڕێک و ڕەوان دەڵێم حـــەز لە وڕێنە دەکـەم.. لە چی تریش.... لە چی تریش.... لە چـی تریش.... لە چی تریش....؟! لە.... لە.... لە..... لە.... لە بلۆقی ناوساجییش.. ئەوەم وت و تەواویش ناخۆش بوو.. حـەز ناکـەم چیـتـر بـیریشم بکەوێتـەوە.. ئەی ئەگـەر بیـرم کـەوتەوە..؟! ئەوسـا.... ئەوسـا.... ئەوسـا.... ئەوسـا.... جـا قەیچییەکا با بیرم بکەوێتـەوە.. هیچی لـەسەر نـاڵێم.. دەسڕی کلیینسم پێیە وانییـە..؟! پێم بوو، بەڵام وا بزانم پار لووتی ئەو منـاڵەی بەردەم دووکـانی «ناجی ناوسـاجی»یم پێی سڕی، کـە بۆ نوقڵ دەگریـا و بـاوکی بۆی نەدەکـڕی.. نەدەبوایـە وابکەم دەزانـی..؟! ئـا، دەزانم، بەڵام واکـردیشـم.. وا نـەبوایە ئێـسـتـا ڕووی ئەم ئاوێنـەیەم پێی دەسـڕی.. زۆر تەڵـخ بووە.. ئەوە هەمـووی هەڵـمی دەممە.. نەء، هـەناسـەکـانمـە.. قـسـەم زۆر کـردووە.. نەء، بە قـسـە وای لێنایە.. تەنـهـا وڕێنـە دەتوانێت ڕووی ئاوێنـە تەڵخ بکات.. بۆچی وڕێنەش هـەر قسە نییە..؟! چۆن وڕێنە و قسە دەکەیت بەیەک..؟! کـارێکی چاکم کـرد، ڕووی ئەو ئاوێنـەیـەم بە وڕێنە سـواغ دا، وانییـە..؟! زۆر.. دەزانـی بۆچی..؟! نەء.. چونکە هـەنـاســـەکـــانی خـــۆم دەبینم.. دەتوانم بـە پەنجـەکانم بیـانگرم.. بە نینۆکەکانم بیـاکـڕێنم.. نەک هـەر ئەوە، بەڵکو دەتوانم زۆر بەئاسـانی لە ئاوێنـەکـەیان جـیـا بکـەمـەوە و لە هـەر کـوێ، خـۆم حـەزی لێ

بکەم، لەوێیـان دابنێم.. دەتوانم لەجیـاتی وێنەکەی دایک و باوکم، لە جامیـان بگرم و لە دیواری ژوورەکەمیـان بدەم.. دەشتـوانم وەکو کراس و ئاوەڵکراس و دەرپێ و ستیان، لەسەر تەناف هەڵیانبخەم، بەڵام وا خۆشترە، بڵێم جوانترە، دڵگیرتریشـە لە بنمیـچەکەیان هەڵبسووم.. دەشـزانم لەوێ لەبەر بای ساردی درزی پەنجـەرەکە، خـۆیان ناگرن و وێنەی هـەوری ڕەش و سپی، لە ئاسـمانی ژوورەکەمدا ئاوس دەبن و ژان دەیانگرێت.. ئەنجام دایدەکەنە باران.. سـەرەتا نم نم و دوایش بەلێـزمـە بەسـەر قژمـدا دەبارن.. وردە بارانی سـارد و تەزیوی وڕێنـە، تنـۆک تنۆک لـە چەنـاگـەمـەوە بـەرەو نێـوانـی هـەردوو مـەمکم ڕێچکە دەبەستن.. ئیتر مـەمکم تەزوو و گیانم مووچڕکی پیادادێت.. بە پەنجەکانم ملی بلووزە خوریـیـەکەم، کە ئاوی باران خـووسـاندوویەتی و بۆنی ئەو کـاتانەی لێ دێت، کە پێش بڕینەوە و بردنی بۆ کارگە، بەگیانی بەرانێکی شاخدارەوە بووە، بەسووکی دەیترازێنم.. دەمەوێت لەکاتی تەزووەکانی ناوەوەیاندا، دەرەوەشیان ببینم و بەوردی سـەرنجیـان لێ بدەم.. سـەرگۆکانیـان بە پەنجـەکـانم سـووک سـووک، بەڵام وەکو خـۆم دەمـەوێت و حەزی لـێ دەکەم هەڵگڵۆفم.. ئەوسا بەبێ ترس و دوودڵی، دەتوانم بڵێم ماڵ ماڵی خـۆمـە.. بۆم هـەیە بڕیاردەم کێ بێت و کـێش نەیەت.. مـەبەسـتت ئەوەی ئەودیوە..؟! لەو زیاتر کـەسی تر هـەیە..؟! نەخـێـر.. ئەو پیـاوانەت لە بیـر مـاون، کـە خـانووچکەکـەیان لێ تێکدەدایت و بەجنێو ڕیسوایان دەکردیت..؟! لەبیرم ماون، بەڵام سیمای ئەو یەکەیانم زیاتر لەوانـی تر دێتـە بەرچـاو، کـە پێی وابوو، خـانووچکەدرووسـتکردن، کـارێکی شـــوومـــە و ئەو منداڵەی خـــانووچکە بکات، بـەدەســـتی دایک و باوکی لەناودەچێت.. ئەمە زۆر دەمترسێنێت.. جا خۆ تۆ ئیتر گەورە بوویت و چییتر خـانووچکە و مـاڵەباجێنە ناکـەیت.. چ پێویست دەکات بترسیت..؟! مـەبەستم ئەوەیە ئـەمـەش بەڵگەیەکی ترە، کـە ئێـمـە، من و ئـەوەی ئەودیو کـچی حـاجی لەقلـەقین.... ئەرێ من دوێنـێ شـەو نووسـتم..؟! نـەء، نەنووسـتـیت.. ئەی چۆن خـــەونم دی..؟! خـــەونت نەدیوە.. بەڵـێ، دیومـــە.. لە خـــەونمدا لـە پەنجـــەرەی ژوورەکـەی ئەوسـای منداڵـیم، سـەرم دەرهێنابوو، سـەیری جـووتە حـاجی لەقلەقەکەی سەر منارەی «مزگەوتی خانەقا»م دەکرد.. کز و خەمناک سەریان

خستبووە ژێر باڵیانەوە.. هەر کاتێکم زانی لە هەر چوار لاوە، حاجی لەقلەقی سەیر سەیر، کە زۆر لەوان جیاواز بوون، هێرشیان کردە سەر «قەلا».. گەلای درەختەکان لەگەڵ بای باڵیان هەڵدەوەرین.. دەرگا و پەنجەرەکان دەلەرینەوە و جیرەجیریان پێ کەوتبوو.. سەرەتا زۆر نەبوون، بەلام دوایی وردە وردە ژمارەیان زیادی دەکرد.. زۆر بە ئەسپایی بۆ ئەو بەردانە دەنیشتنەوە، کە من لە مناڵیی دەمکردن بە خانووچکە و دەرمان.. یەکە بە یەکەیان هەڵدەلووشی.. ئینجا خۆیان دەگایاندە لای ئەو «چوار» ڕیز ژنەی، کە لە پایینی قەلاوە پرێمز و تاوە و تفاق و کەرەسەی تری «ناوساجی»یان دانابوو.. ژنەکانیش سەیر بوون.. سەروسیمای ناشیرین و ترسناکیان هەبوو.. باوکم و هەر سێ مامم، سەرو گۆچانیان بە دەستەوە بوو.. هەریەکەیان سەرپەرشتی ڕیزێ لە ژنەکانیان دەکرد.. گۆچانەکانیشیان زۆر سەیربوون، هیچ لەوەی باپیرم نەدەچوو، کە تا مابوو کوت کوت پێی دەچوو بۆ مزگەوت.. لەشێوەی حاجی لەقلەق درووست کرابوون و ڕەنگیشیان ڕەنگی ئەوان بوو.. گڕەگڕی پرێمز و قرچەقرچی ڕۆنی داخبووی ناو ئەو هەموو تاوەیە، تێکەڵ بە دەنگی باڵەفڕەی حاجی لەقلەقەکان دەبوون و کەس گوێی لە کەس نەدەبوو.. ئەو ژنانە ئەوەندەی بڵێیت درێو و ناشیرین بوون، بەلام لەشسووک و گورجوگۆڵ بوون.. لە چاوترووکانێکدا ئەو گونکانەیان لەسەر ئەو پنانەی بەردەمیاندا دەکردنەوە و خێرا دەیانخستنە ناو تاوەکانەوە.. لە چاوترووکانێکی تردا سووردەبوونەوە.. هەر بەو گەرمییەوە دەیاخستنە بەردەمی حاجی لەقلەکان و ئەوانیش بەپرتاوی دەیانقۆزتنەوە.. «چوار» «بلۆق»ەکانی سەریان دەخواردن و ئەویتریان بەو ناوەدا بلاودەکردنەوە.. ئەو دەوروبەرەیان بە ناوساجی داپۆشی.. هەر دەتوت فەرشی سووری لەسەر داخراوە.. بەلام ئەوەندەی پێنەچوو، هێلکەیان لەسەر کرد.. ئەمجارە فەرشەکە لە سوورەوە گۆڕا بۆ سپی.. هەر دەتوت بەفری چلەی زستانە و تازە باریوە.. هێلکەکان یەک لە دوای یەکدا دەترووکان.. دەترووکان و خێرا بێچووەحاجی لەقلەق سەریان تیادا دەجووقا، هەر ئانوساتیش باڵیان دەگرت.. حاجی لەقلەقی سووری سەرباڵ ڕەنگاوڕەنگ، کەپرۆکەیان لەسەر ئەو «قەلا»یە دەکرد.. من دەمزانی

ئەوە ڕەنگی بلۆقی ناوساجییەکان و بەردەکانی خانووچکەکەمە.. لە هەموو شتێ زیاتر بەوە نیگەران بووبووم، بەڵام هیچ دەستەڵاتێکیشم نەبوو.. تا تینم تیابوو هاوارم دەکرد و دەنگم دەرنەدەچوو.. دەریشبچووایە، هەر کەس نەیدەبیست.. دەمویست بانگی باوک و مامەکانم بکەم، تا بەفریام بکەون، بەڵام ئەوان خەریکی کاری خۆیان بوون و نەیاندەتوانی بەجێی بهێڵن.. بۆنی «سییر»یش تەواو وڕ و کاسی کردبووم.. سەرەتا وامدەزانی بۆنی ڕیقنەی حاجی لەقلەقەکانە، کە بەقەدەر کاتژمێرێکی دیوار دەبوون و خڕ دەتوت بە قاڵبی کێک داڕێژراون، دەکەوتنە سەربان و حەوشەی ماڵان، بەڵام دوایی کە «ست شیرین»م بینی، لەسەربانی دووکانە داخراوەکانی بازاڕدا، کتێبی «جوگرافیای عێراق و وڵاتانی دراوسێ»ی دەخوێندەوە، زانیم بۆنی دەمی ئەوە.. جا نازانم لەو غەڵبەغەڵب و ژاوەژاوە، کەس گوێی لە دەنگی دەبوو، یان نا..؟! من خۆم گوێم لێی نەدەبوو، بەڵام هەر دەمبینی دەمی دەجوڵا و سەری دەلەقییەوە.. نازانم بۆچی هەر لە خۆمە بەزەییم پیایدا دەهاتەوە..؟! نازانم بۆچی حەزم دەکرد بچم باوەشی پیادا بکەم و تێر تێر ئەملا و ئەولای ماچی بکەم..؟! زۆریش چاوم بۆ هاوڕێکانی مناڵییم گێڕا، ئەوانەی لە قوتابخانە لەگەڵمدا بوون، بەڵام کەسیانم نەدی.. دواجار سەیری دوو حاجی لەقلەقەکەی سەر منارەی «مزگەوتی خانەقام» کرد، بینیم لە هەر چوار لاوە حاجی لەقلەقی سووری سەربال ڕەنگاوڕەنگی تر، پەلاماریان دەدان و بە دەنووکی تیژیان ونجڕ ونجڕیان کردن.. لەسەر قاچ و باڵ و سەریان دەبووە فڕکان فڕکان.. پووشوپەڵاشی هێلانەکەیانم دەبینی، کە لەبەر ورشەی بای باڵیان بە ئاسماندا بڵاودەبوونەوە.. ئەو هێلانەیەی سەدان ساڵ لەمەوبەر دایان نابوو، لە چاوترووکانێکدا بەسەر دنیاوە نەما.. هەر منارە و مزگەوتەکەشیان هەڵلووشی....

ـ دوو سکە ئیک ستانسە میت ئی دۆون.. ئەنتن کەم ئین، ئێلە گۆ ئوونز.«*»

خێرا سەرم هەڵبڕی...... لە بەردەم دەرگای تیاترۆخانەکەدا وەستاوم.. وا هەناسەبڕکێم پێکەوتووە، دەڵێی لەمسەری شارەوە بۆ ئەوسەری ڕامکردووە.. پیاوەکە.. پیاوی چی..؟! گەوادەکە.. ئا.. ئا.. ئەو.. وا چاکترە هەر بە

زمانەکەی خۆیان بلێم «ئەلفۆنس»ەکە، لە بەرامبەرم وەستاوە و چاوی بڕیوەتە چاومەوە.. بەهەڵە لێم تێگەیشتووە.. نازانێت ڕێم لێ تێکچووە و لە غەفڵەتەوە گەیشتوومەتە ئێرە.. جا کوا ڕێم لێ تێکچووە..؟! ئەو درۆیە چییە..؟! بۆچی بیشارمەوە و ڕاستیەکەی نەڵێم، کە بەئیش هاتووم..؟! بەڵێ، بەئیش هاتووم، بەڵام بۆ ئەو ئیشە نا، کە ئەم بیری لێ دەکاتەوە.. من بۆ ئەوە نەهاتووم بچمە ژوورەوە، بەڵکو تەنها دەمەوێت لەو دەرگا «چوار»دەرییە ڕابمێنم، کە لە شێوەی حاجی لەقلەق درووستکراوە.. چۆنم لەو گۆڤارەدا خوێندبووەوە و وێنەکەیم چۆن بینی بوو، ئاوا دەرچوو.. ئەوەتا حاجی لەقلەقێکە و کراوە بە «چوار» بەش.. هەر بەشێکی کراوە بە تاکێکی دەرگاکە.. سەر و ئاوێنەی «چوارگۆشە»یان پێوەیە.. ئەگەر هەر «چوار» تاکی دەرگاکە بە یەکەوە بنووسێندرێن، ئەوا لەشی حاجی لەقلەقەکە بەتەواوی دەردەکەوێت، بەڵام خۆ خاوەنەکەی ئەوەندە گەمژە نییە، لەپێناوی درووستکردنی حاجی لەقلەقدا، گوایە من حەز لە سەیر کردنی دەکەم، دەرگای تیاترۆخانە دادەخات و قیرووسیا لەو هەموو قازانجە دەکات، کە ڕۆژانە دەستی دەکەوێت..؟! تا ڕاپێچی ژوورەوەیان نەکردووم، با هەر بڕۆم و ئەم ناوە بەجێبهێڵم.. سیریشم پێ نییە، دەنکێکی بخەمە دەممەوە، دەترسم بەئاسانی بکێشی ئەودیوم بکەن.. قیرووسیا لەو هەموو ڕابردووەی، کە دەتوانم لە بەرامبەریدا، بەبێ تەنگوچەڵەمە بیری خۆمی بخەمەوە.. سەیر لەوەدایە لەمەودوا لەجیاتی «دوو» ڕابردوو، «چوار»م دەبێت.. ئیتر ئەوەندەی تر ترس و گومان بەسەر دنیاوەم ناهێڵن. ئەوەندەی تر ئەوەی ئەودیوم پێ خۆشدەبێت.«**»

دانیمارک ـ سەرەتای ساڵی ١٩٩٧

---

* ئەم قسەیە، کە لەسەر زمانی پیاوێکی دانیمارکیەوە دەربڕاوە ماناکەی بەکوردی ئاوایە: « لە ناوەڕاستی دەرگا مەوەستە، یان وەرە ژوورەوە، یانیش بڕۆ دەرەوە».

** ئەم چیرۆکە پێشتریش لە ژمارە (٢٤)ی گۆڤاری «ڕابوون»دا بڵاوکراوەتەوە.

**سوپاس:**

ـ بۆ برای هۆشیار و ئەدەبدۆست «کاک هێمن عومەر»، کە بێجگە لەوەی هەندێ سەرنجی جوانی خستە بەرچاوم، کۆمەڵێ هەڵەی چاپیشی بۆ ڕاستکردمەوە.

ـ بۆ «کاک عەبدوڵا قادر دانساز»ی وەرگێڕ، کە بە پیشەی هەمیشەی لە چاپکردنەوەی ئەم بەرهەمە یارمەتیی زۆری دام.

**بەرهەمی چاپکراوی نووسەر:**

ــ ئەسپیدیلۆن: کۆمەڵەچیرۆک، چاپی یەکەم، کتێبی ڕابوون، ژمارە١١، سوێد، ١٩٩٨.

ــ ئای لەڤیلیا لەڤیلیا..!! ڕۆمان، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، کوردستان، ٢٠٠٠.

ــ منالێم ئاسکێک بوو بەسەر پەلکەزێڕینەکاندا بازبازێنی دەکرد، سەربردەی ژیانی منالیی نووسەر تا پۆلی شەشەمی سەرەتایی، بەشی یەکەم و دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، کوردستان، ٢٠٠١.

**بەرهەمی چاپنەکراو:**

ــ خەوننامەی دادە سۆزی، کۆمەڵەچیرۆک